کۆنستانتین ڤیرجیل گیۆرگیو

وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: عەزیز گەردی

# ئەو پیاوەی بە تەنیا سەفەری کرد





ڕۆمان

# ئەو پیاوەی بە تەنیا سەفەری کرد

رۆمـان

نووسینی
کۆنستانتین ڤیرجیل گیۆرگیو

وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە
عەزیز گەردی

چاپی یەکەم
٢٠١٩

# ئەو پیاوەی بە تەنیا سەفەری کرد

بـابـەت: ڕۆمان

نووسەر: کۆنستانتین ڤیرجیل گیۆرگیو

وەرگێڕانی: عەزیز گەردی

دیزایینی ناوەوە: محمد حسێن خەتی

چاپ: یەکەم-٢٠١٩

نرخ: (٨٥٠٠) دینار

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

دەقی کتێبەکە ئەمەیە:

Constantin Virgil Gheorghiu,
L,home qui voyagea seul,

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٢٣)ی ساڵی ٢٠١٩ی پێ دراوە.

# پێشەکی

## کۆنستانتین ڤیرجیل گیۆرگیو

من (وەرگێڕ)، تازە نییە ئەو رۆماننووسە دەناسم. ئاشنایەتی مـن لەگـەڵ ئەو پیاوە بۆ نیـوەی دووەمـی حـەفتاکانی سـەدەی بـووری، (سـەدەی بیستەم)، دەچێتەوە. ئەوسا سێ ساڵ لە بەغدا مامۆستا بووم. بـۆ یەکـەم جار رۆمانی (سەعات بیسـت و پێنج)م بە عەرەبی خوێندەوە. ئەو رۆمانـە بوو ناوبانگی بـۆ نووسـەرەکەی پەیـدا کـرد. ئەمـەیش ئاسـاییە، هـەر نووسەرێك بە بەرهەمێك دەنگی بڵاو دەبێتەوەو بەرهەمەکە خوێنەر لـە دەوری نووسـەرەکەی کـۆ دەکاتـەوە. پاشـان وا هـات هەنـدێ لـە بەرهەمەکانی تریم بە فڕەنسی (زمانی نووسینی خۆیان) خوێنـدەوە. لـەو چەند رۆمانـەی لـەم نووسـەرە کـە مـن خوێندوومنەتـەوە، دوو شـت سەرنجیان راکێشاوم: یەکەم لە رووی ناوەرۆکەوە هەموو بەرهەمەکانی لە دەوری مرۆڤ دەسووڕێنەوەو بـەرگرین لـە کەرامـەت و سـەرفرازی مرۆڤ و هەموو سیسـتەمێکی بەڕێوەوبەرایـەتی دونیـایی (چـونکە خـۆی قەشەیە)، بە رۆژهەڵاتی و رۆژئاواییـەوە، بـە خـۆیی و بـە بێگانـەوە، بـە دوورو بە نزیکەوە، بە دوژمنی مرۆڤ دەزانێ و کـارە چـەپەڵەکانیان لـە دژی مرۆڤ رسوا دەکا. مـرۆڤ نـازانێ لـە دەسـت سـتەم و دڕندایـەتی و نامرۆڤایەتی ئـەو دوو پـێ خۆخـۆرو مرۆڤخۆرانـە چ بکـاو روو بکاتـە

کوێ؟! گیۆرگیو بە دوای چارەیەکدا دەگەڕێ مرۆڤی پێ لەو دۆزەخە دەربێنێ کە مرۆڤ بۆی داخستووەو رزگاری تەنیا لە بەرگە گرتن و لەبەر گرتن و قوربانیدان دەبینێ.

ئەمە لە رووی ناوەرۆکەکەوە، لە رووی شێوازیشەوە، گیۆرگیو شێوازێکی زۆر لەملان سووکی هەیە. خوێنەر ماندوو ناکاو باری قورس ناکا. لە خوێندنەوە بێزاری ناکا، بە پێچەوانە رای دەکێشێ تەواوی بکاو تەنانەت بە پەرۆشەوە بە دوای بەرهەمەکانی تریشیدا بگەڕێ. ئەمەیش بە بۆچوونی من خۆی لە دوو شتدا دەبینێ: یەکەم بەکارهێنانی وشەی ئاسان و باو کە لای هەموو خوێنەرێك باون و دووەم بە کارهێنانی رستەی سادەو کورت کورت کە خوێنەر تەنگەنەفەس ناکاو مێشکی ماندوو ناکا. من پێم وایە ئەم دوو خەسیەتەی شێوازی گیۆرگیو دەورێکی گەورەیان لە راکێشانی خوێنەر هەیە بۆ خوێندنەوەی رۆمانەکانی. باوەڕ ناکەم کەس هەبێ دەست بداتە رۆمانێکی ئەم نووسەرەو دوای چەند لاپەڕەیەك فڕێی بداو بڵێ ئەمە دڵ دەگوشێ و ناخوێنرێتەوە. ئەگەر خوێنەرێك لە خوێندنەوەی کوردی (ئەو پیاوەی بە تەنیا سەفەری کرد) هەستی بە شتی وا کرد، با بزانێ تاوانەکە لە ملی منی وەرگێڕە، تاوانی نووسەرەکە نییە.

## وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانە

باسی چۆنیەتی هەڵبژاردنو وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانە دەمباتەوە بۆ چمکێکی بیرەوەرییەکانم. گوتم لە نیوەی دووەمی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو سێ ساڵ لە بەغدا بوومو هەر لەوێش یەکەم ڕۆمانی گیۆرگیوم خوێندەوە بە ناوی سەعات (بیستو پێنج). پاشان کە هاتمەوە هەولێرو لە شەشی ئامادەیی لە خوێندن هەڵچوومەوەو لە بەشی فەرەنسی کۆلیجی ئادابی زانکۆی مووسل وەرگیرام. یەکێ لەوانەکانمان لە پۆلی سێ (ساڵی ١٩٨٢-١٩٨٣) ڕۆمان بوو. مامۆستای ڕۆمانمان (مسیۆ بلان) بوو. ئەو مامۆستایە بە درێژی ئەو ساڵە لە دوو بازەوە لەگەڵمان خەریك بوو: یەکەم لە وانەکاندا خۆی باسی مێژووو هونەرو ڕێبازەکانو ڕۆماننوسە ناودارەکانی ئەدەبی فەرەنسیو جیهانی بۆ شی دەکردینەوە، دووەم ئەرکی مانگانەی لە بارەی ڕۆمانەوە پێ دەسپاردین. هەموو مانگێك، هەر قوتابییەك دەبوایە ڕۆمانێکی بە فەرەنسی نووسراو هەڵبژێرێ، بیخوێنێتەوەو کورتی بکاتەوەو سەری مانگ پێشکێش مامۆستای بکا. مامۆستاکەیش وەکوو منو مامۆستاکانی تری کورد نەبوو ماندووبوونی قوتابییەکان فڕێ بداو شتەکانیان نەخوێنێتەوە. باوەڕ بفەرموون هەمووی دەخوێندنەوەو یەك یەك گفتو گۆی لەسەر بابەتەکانو چونیەتی کورت کردنەوەکە لەگەڵ قوتابییەکان دەکرد. خوا پاداشتی بداتەوە. هەندێ لەو ڕۆمانانەی من ئەو ساڵە کورتم کردنەوە ئەمانە بوون: (قوتیل)ی ئەلفۆنس دۆدێ،

(ئازادی یان مەرگ)ی کازانزاکی، (ئەو پیاوەی سەفەری کرد)و ( سواڵکەرانی پەرجۆ)ی (کۆنستانتین ڤیرجیل گیۆرگیو)و بەشێکی رۆمانی (کلۆلان)ی (ڤکتۆر هوگۆ) بە ناوی (کوزێت)و... بەم دواییە بیرم کردەوە من خۆم بەم رۆمانانەوە ماندوو کردووە تا ساغم کردوونەتەوەو کورتم کردووتەنەوە، بۆچی ماندووبوونەکەم بەلاش بچێ، با پێیاندا بێمەوەو و کاریان لەسەر بکەمو دووبارە پێیاندابچمەوەو بیانخامە بەر دیدی خوێنەران. ئەوە بوو ساڵی ٢٠١٤، (قوتیل)م بڵاو کردەوەو ئێستایش (ئەو پیاوەی بە تەنیا سەفەری کرد)م ئامادەکردووە. هیوادارم خوێنەری بەڕێز بێ دڵی نەبێ.

## کورتەی ژیانی کۆنستانتین ڤیرجیل گیۆرگیو:



-کۆنستانتین ڤیرجیل گیۆرگیو لە ١٥ی ئەیلوولی ساڵی ١٩١٦دا، لە (ڤالیا ئەلبا)، کە دەگایەکە لە نزیك (رازیۆینی)، (رۆمانیا)، لە دایك بووە. باوکی قەشەی ئۆرتۆدۆکس بوو لە (پێتریکانی).

- لەبەر ئەوەی بە منداڵی لە یاری زیاتر حەزی لە خوێندنەوە دەکردو رۆژ تا ئێوارە لە سەر بانیژەی ماڵەوە دادەنیشتو سەری بە سەر کتێب دادەگرتو وەکوو مردوو جوولەی لە خۆی دەبڕی،، خوشكو براکانی پێیاندەگوت: (بەهەشتی). واتە بە مردوویان دادەنا چونکە گەمەی لەگەڵ نەدەکردن.

- ساڵانی ١٩٢٨- ١٩٣٦، لە (کیشناو)، لە قوتابخانەی باڵا،خوێندی.

- پاشان فەلسەفەو لاهووتی لە زانکۆی (بوخاریست)و لە زانکۆی (هایدڵبێرگ) خوێند. پاش تەواو کردنی خوێندن، ماوەیەك خەریکی رۆژنامەگەری بوو.

-ساڵی ١٩٤٠، خەڵاتی شاهانەی شیعری، بە شیعری: (نووسین لە سەر بەفر) وەرگرت.

- لە ماوەی (١٩٤٢- ١٩٤٣)دا، لە کاتی فەرمانڕەوایی رژێمی جەنەرال (یۆن ئەنتۆنێسکۆ)، لە وەزارەتی کارو باری دەرەوەی رۆمانیا بوو بە سکرتێری سەفیر.

- کە لەشکری سۆڤێتی ساڵی ١٩٤٤، چووە ناو رۆمانیا، لەبەر ئەوەی گیۆرگیو لەگەڵ رژێمی سۆڤێتیدا نەبوو، کەوتە تاراوگەو ساڵی ١٩٤٨ لە فرەنسا ئاکنجی بوو.

-لە کۆتایی شەڕی دووەمی جیهانییەوە، لەشکری ئەمریکی گرتیان و لە ماوەی گیرانیدا رۆمانی سەعات (بیستو پێنج)ی نووسی.

- ساڵی ١٩٤٩، رۆمانی سەعات (بیستو پێنج)ی بڵاو کردەوە. ئەم رۆمانە دەنگی دایەوەو ناوبانگێکی گەورەی بۆ پەیدا کردو خەڵکی لەسەر بەرهەمەکانی کۆکردەوە.

- دوای ئازاد کرانی (بێسارابی) لە دەست رووسەکان، رۆمانی (ئەو پیاوەی بە تەنیا سەفەری کرد)ی نووسی. ماوەیەك چووە ئەمریکاو پاشان گەڕایەوە فرەنسا.

- لە ٢٣ی مایسی ١٩٦٣، کرا بە قەشەی کلێسەیەکی کاتۆلیکی رۆمانی لە پاریس

- لە حوزێرانی ١٩٦٦، کرا بە ئوسقوفی ئولیکونوم ستارارافۆر.

-پاتریرك (جوستینیا)، بەرامبەر چالاکییە ئایینیو ئەدەبییەکانی، خاچی پاتریارکی رۆمانیای خەلات کرد.

- لە ٢٢ی کانوونی دووەمی ١٩٩٢، کۆچی دوایی کردو لە پاریس، لە گۆڕستانی (پاسی) نێژرا.( خوای لێ خۆش بێ!)

## بەرهەمەکانی:

ئەمانەی خوارەوە، زۆربەی بەرهەمەکانی گیۆرگیون، بە پێی ساڵی بلاوبوونەوەیان:

-سەعات بیستو پێنج ١٩٤٩

-دەرفەتی دووەم ١٩٥٢

-ئەو پیاوەی بە تەنیا سەفەری کرد ١٩٥٤

-خەڵکی نەمر ١٩٥٥

-قوربانییانی دانووب ١٩٥٧

-پیر ژانی دەمزێڕ ١٩٥٧

-سوڵکەرانی پەرچۆ١٩٥٨

-قامچی ١٩٦٠

-پیراهیم ١٩٦١

-ماڵی پیترۆڤادا ١٩٦١

-ژیانی محەممەد ١٩٦٣

-نەمرانی ئاگاپیا ١٩٦٤

-گەلجێتیی دکتۆر لوتەر ١٩٦٥

-لە سەعات بیست و پێنجەوە هەتا هەتایە ١٩٦٥

-مردنی کارالێسا ١٩٦٦

- جوببەی چەرم ١٩٦٧

-بۆچی ناویان نام ڤیرجیل ١٩٦٨

-رۆمبالدی، خۆفرۆش ١٩٦٩

-ژیانی پاتریارك ئاتێناگۆرا ١٩٦٩

-سیخوڕ ١٩٧٣

-خوا تەنیا رۆژی یەك شەممە وەردەگرێ ١٩٧٥

-نەناسراوەکانی هایدلبێرگ ١٩٧٧

-لەناوبەری گەورە ١٩٧٨

-ئەمەزۆنەکانی دانووب ١٩٧٨

-خوا پاریسی هەیە ١٩٨٠

-بیرەوەری، گەواهی سەعات بیست و پێنج ١٩٨٦

لەم لستەیەدا دیارە ساڵی ١٩٤٩ یەکەم کتێب و ساڵی ١٩٨٦ دوا کتێبی بڵاو کردۆتەوەو لەوە بە دواوە تا مردووە(١٩٩٢) لە بڵاو کردنەوەی کتێب وەستاوە. واتە ماوەی ٣٨ ساڵ خەریکی بڵاو کردنەوەی کتێب بووە.

ئێستایش ئێوەو رۆمانی (ئەو پیاوەی بە تەنیا سەفەری کرد). دە فەرموون، دەی!! با بە یەکەوە بیخوێنینەوە.

## (١)

دایکی (ترایان ماتیزی) گوتی:

-دەزانم سەرکەوتوو دەبی. دڵنیام سەرکەوتوو دەبی!!

فرمێسکی بە روودا هاتە خوارێ، بە دەستی راستەی چەنگی لە لێوی عارەبانەی ئامادەی رۆیشتن گیرکردبوو، توند گرتبووی. دەتگوت دەیەوێ لێنەگەڕێ بڕوا. کە رۆندکیشی دەگەیشتە سەر لێوان، بە دەستی راستە دەیسڕییەوە.

(ترایان)، جالتای لە ناو عارەبانە داناو گوتی:

-بەلاش دڵی خۆت توند دەکەیتو دەگری! مادەم دڵنیای سەرکەوتوو دەبم، گریانی بۆچییە؟!

عارەبانەکە لە دوو ئەسپ بەسرابوو، لەبەر پایەکانی دەرگای ماڵەوە وەستابوو.

(ترایان)، یەکەم دەستەبەرگی مەدەنی خۆی لەبەر بوو، دەچووە زانکۆ لە (بوخاریست) .

هەموو کەس و کاری لە دەوری عارەبانەکە جەم ببوون، بە ڕێیان دەکرد: باوکی، قەشەی (ئیزفۆر)، پیاوێکی قیت و باریکەڵە بوو، جوببەی ڕەشی توند بە لەشییەوە نووسا بوو. باوکە کڕو بێدەنگ بوو.

ترایان، سێ خوشك و (نیکۆلای) برای لە تەك بوون. ئەوانیش کپ وبێدەنگ بوون.

(ترایان) گوتی:

-تۆ دەزانی زوو زوو دێمەوە.

بە میهرەبانی دەستی لەسەر شانی داکی دانا. دایکە تەماشای دوورِ چاوەکانی کرد. بە چاوی بزاق و پڕ پرسیارو ترسناکی تەماشای کوڕەکەی کرد.

(ترایان)، کە دیتی، دایکی فرمێسکی لە چاو قەتیس ماوەو ترس بەری چاوی گرتووە، گوتی:

-خاترجەم بە، زوو زوو دێمەوە.

دایکە، بە دڕدۆنگی و بە دەنگێکی ڕارا، گوتی:

-دێیتەوە؟ بە ڕاستیتە؟

دایکی (ترایان) لەگەڵ ئەم پرسیارە، لە پڕمەی گریانی دا.

(ترایان)، شانی دایکی توندتر ڕاگوشی و گوتی:

-دڵت بڕوایی نادا دێمەوە، بۆیە دەگری! چونکە پێت وایە نایەمەوە.

دایکە گوتی:

-باوەڕ دەکەم دێتەوە.

جارێکی تر ئەسرینی تا لێوان هاتە خوارێ، بە دەستی چەپ ڕۆندکی سڕییەوە. ئینجا بەردەوام بوو:

-باوەڕ دەکەم دێتەوە، بەرێ، ترسێم زۆر درەنگ بێتەوە، هەر ئەوەیە! زۆر درەنگ بێتەوەو من نەمابم.

دایکی (ترایان ماتیزی)، دەستی لەسەر عارەبانەکە هەڵگرت. ڕێگای عارەبانەکەی دا بڕوا. چی دەیەویست بە کوڕەکەی بڵێ، پێی گوتبوو. هەموو خەفەتی دڵی خۆی پێگوتبوو. شەقاوێك کشایەوە دواوە بۆ ئەوەی ڕێگای عارەبانەکە بدا بڕوا.

(ترایان)، بە شێوەی پرسیار ڕووی بۆ لای برای وەرگێڕا. قەشە بێ جوولە وەستابوو. سێ خوشکەکەی (ترایان)یش ڕەق ڕاوەستابوون. (ترایان)، لە نزیك پلەکانەوە، چاوی بە چاوی (تەنیا) کەوت.

(تەنیا) ئەسپێکی چیایی بوو- نەختێ لە ئەسپی فینۆ (ئەفنەش) گەورەتر بوو. ڕۆژێ، لە خۆوە هاتە حەوشەی ماڵی قەشەی (ئیزفۆر)و بە ئازادی دەستی بە گەڕان کرد. بوو بە هاوڕێی ژیانی زارۆكو کەرگیو مراویو گیاندارو پەرەوری دیکەی ماڵێ. هەنووکە، (تەنیا)یش بە چاوی پرسیاراوی، مۆڵەقو نیگەران، وەکوو چاوی هەموو ئەوانەی لە دەوری (ترایان) خڕببوونەوە، تەماشای دەکرد.

(ترايان) گوتی:

-ئەم بە ڕێ کردنە کارەساتبارەی بۆچییە ؟ خۆ من ناچمە بنی دونیا...

دەنگی پتەو بوو، بەردەوام بوو:

-من، نە دەچمە بنی دونیاو نە دەشچمە جەنگ. تەنیاو تەنیا دەچمە زانکۆ. فرمێسك ڕشتنی بۆچییە؟! دایکە، بەسیکە! بەس بگری!

(ترایان ماتیزی) دەستی باوکی ماچ کرد. باوکیشی ماچێکی لە تەبەشی کرد. (ترایان) دەستی دایکی ماچ کرد، دایکشی ماچێکی لە پشنی کرد. (ترایان)، یەك لە دوای یەك، گۆنای راستەی هەر یەکە لە خوشکەکانی ماچ کرد. ناچار بوو دابێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێ ماچیان بکا، چونکە هەرسێکیان لەو بچووکتربوون. خوشکەکانیشی، یەك لە دوای یەك، هەستانەوە سەر پەنجەی پێ بۆ ئەوەی گۆنای راستەی (ترایان) ماچ بکەن.

(نیکۆلای)ی برای (ترایان)، تەمەنی دە ساڵ بوو. بە خورتی لێگەڕا (ترایان) گۆنای راستەی ماچ بکا.

(ترایان) لە ناکاو گوتی:

-ئێستا ئیتر خوا حافیز! خوا حافیز تا پشووی نۆیێل!

بەر لەوەی خۆی هەڵداتە ناو عارەبانە. جارێکی تر چاوی بە چاوە نیگەرانەکانی (تەنیا)ی ئەسپی بچکۆڵە کەوت کە چاوی تێ بڕیبوو.

(ترایان) گوتی:

-دەتەویٚ خوا حافیزی لە تۆیش بکەم؟!

(ترایان)، بە پەلە، ماچێکی لە نێوچەوانو لە بەینی هەردوو چاوەکانی ئەسپەکە کرد. ئینجا، خۆی هەڵدایە ناو عارەبانە. مراویو قازو عەلیشیش لە بن عارەبانەکە بوون، (گریگۆر)ی خزمەتکار، کە بڕیار بوو بیگەیەنێتە ئێستگەی هێلی ئاسن، بە قامچی دەری کردن. ئینجا سەرکەوتە تەنیشت (ترایان)و قەمچی لە ئەسپەکان بادا.

دایکی (ترایان) گوتی:

-وەرەوە، وەکوو بەڵێنت داوە، زوو وەرەوە!

کاتیٚ عارەبانەکە جمیو بە ریٚ کەوت، لەبەر خۆیەوە قسەیەکی کرد. لە هەمان کاتدا، دەنگی (نیکۆلا) هات. راسپاردەی دایکی، بۆ برای سەفەریی، دووبارەکردەوە:

-زۆرت پێنەچیٚ! (بەهەشتی)!

لەگەڵ نازناوی (بەهەشتی)، کە (نیکۆلا) بە کاری هێنا، هەموو منداڵەکان لە تریقەی پێکەنینیان دا. (ترایان)یش پێکەنی. قەشەیش پێکەنی. دایکی (ترایان)یش بە دەم رۆندك باراندنەوە، بزەی هاتیٚ. تەنانەت (گریگۆر)یش. کاتیٚ عارەبانە لە حەوشەی ماڵی قەشەی (ئیزفۆر) دەرچوو، هەموو پێدەکەنین! براو خوشکەکانی (ترایان)، نازناوی (بەهەشتی))یان بە (ترایان) دابوو. (ترایان) کوڕی لخری قەشە

بوو. (ترایان)، لە کاتی پشوودا، کە دەهاتەوە، بە درێژایی ڕۆژ، لە شانشینی ماڵەوە دەیخوێندەوە. لەبەر ئەوەی (ترایان) هەرگیز یاری لەگەڵ (نیکۆلا)و خوشکەکانی نەدەکرد، ئەوانیش بۆ ئەوەی تۆڵەی لێ بکەنەوە، نازناوی (بەهەشتی)یان بە کاکەیان دابوو. ئەوان لەو باوەڕەدابوون تەنیا مردوو، (بەهەشتی)، دەتوانێ ڕۆژ تا ئێوارە لە جێی خۆی نەجوولێتەوەو چاو لەسەر کتێب هەڵنەگرێ.

بەڵام (ترایان)، تەبیاتی وابوو بە درێژایی ڕۆژ، بە خۆو بە کتێبەوە لە شانشین بوو. تا تەمەنی بوو بە بیست ساڵی – تا ئێستا – ئەمە گەورەترین خۆشیی ئەو بوو. خەونی نهێنی ئەوە بوو –وەکوو باوکو هەموو باپیرانی– لەو ناوچەیەی مۆلداڤیای باکوور، لە قولتاری چیاکانی (کارپێت)، ببێ بە قەشەی لادێ. بەڵام ژیان زۆر بە زەحمەت کەوتبوو. لەو ناوچەیەدا، زەوی پەرکو کڕێن بوو، خەڵك خیزانو زیڤار بوون، ئاووهەوا سەختو دژوار بوو، (ترایان) ناچار بوو پیشەیەکی تر هەڵبژێرێ. ئیدی ڕای هاتە سەر ئەوە، لە (بوخاریست)، ناوی خۆی لە کۆلێج بنووسێو ببێ بە مامۆستا.

(ترایان)، لە کاتی خوێندندا، دەبوایە خۆی بژێوی خۆی پەیدا بکا. باوکی زۆر دەستکورت بوو، نەیدەتوانی هیچ یارمەتی بۆ بنێرێ. بەو کەمە شتەی هەیبوو، هەر ئەوەتە دەیتوانی مەسرەفی خوێندنی چوار منداڵەکەی بچووکتری بکێشێ.

لەگەڵ ئەمەیشدا، (ترایان) بە هیوای زۆر گەورە چووە زانکۆ. هێشتا لە قۆناغی ئامادەییدا بوو، دوو کۆمەڵە شیعری چاپ کردبوو: (ژیانی ڕۆژانەی شاعیر)و (نەخشە). هاوکاری لەگەڵ هەموو گۆڤارەکانی پایتەخت هەبوو. سەبارەت بەوەی وەکوو نووسەرێکی گەنج ناوبانگی سەندبوو، هەر بە ئومێد بوو، لە یەکێ لە ڕۆژنامەکانی (بوخاریست) کارێکی نووسینی دەست بکەوێ‌و لە کاتی خوێندنی ئەوێ، بابی ژیانی خۆی‌و هەقی ناونووسینی لە زانکۆ، پارە پەیدا بکا. بگرە هەندێ گفتیشیان پێدا بوو. ئیدی ئەوە بوو، بە دڵی پڕ متمانە، (ئیزڤۆر)ی جێ هێشت.

لە نشکەوە، ڕۆندکی دایکی بیر کەوتەوە. ئاوڕی لە (گریکۆر) دایەوە کە ئەسپەکانی دەهاژواو ویستی لێبپرسێ: (ئەوە بۆچی دایکم، وەك ئەوەی من بچمە بنی دونیا، ئاوها دەگریا؟!) بەلام (گریگۆر)ی خزمەتکار، کە بیست ساڵ زیاتر بوو لە خزمەت قەشەدا بوو، چووبووە ژێری‌و لە بیرو خەیاڵاتی خۆیدا نقووم ببوو. تەماشای ڕێگای ڕاکشاوی بەردەمی خۆیانی دەکرد. (ترایان) نەیویست بیری بپچڕێنێ.

ئیتر هیچی لێ نەپرسی. ئەویش بە دەوری خۆیەوە، وەکوو(گریگۆر)، تەماشای ڕێگای کرد. عارەبانە لەگەڵ هەنگاوی ڕەهوانی ئەسپەکان بە ڕێگای ناو گونددا دەڕۆیشت. ڕێگاو حەوشەکان چۆل بوون. هیچ جوولە نەبوو. خەڵکی (ئیزڤۆر)، لەبەر ئەوەی خاکێکی بێ بڕشتیان هەیە، بە ڕۆژ، دەچن سەدەها کیلۆمەتر لەوێ دوور، کار دەکەن.

ئێستا، خەڵکەکە بە خۆو بە ژنو منداڵو عارەبانەوە بۆ رنینی تری، چووبوونە مۆلداڤیای باشوور. خێزی دانعەمرو نەساغەکان کەس لە (ئیزفۆر) نەمابوو. عارەبانەی قەشە بە ڕێگایەکی چۆلدا بەرەو پێش دەچوو. دوامالّی (ئیزفۆر)یان لە بەرامبەر، لای دەستەڕاست، بوو. ئەمە مالّی مامۆستا بوو. مالّەکە بە مالّی قەشە دەچوو: دیواری سپی، بانی تەختەی سوالّەتی بچووك، شانشینی دار، گولّ لە بەرپەنجەرەکانو، بیرێکی بە گرگرە لەبەر دەرگا. (ماری)ی کچە تاقانەی مامۆستا، بە تەنوورەیەکی شینی وەك گولّی (لە بیرم مەکە)، لای بیرەکە وەستا بوو. (ترایان) شەوی پێشوو، خواحافیزی لێ کردبوو. لەگەلّ ئەمەیشدا، (ماری) دەیەویست، بەر لەوەی (ترایان) بڕوا، جارێکی دی چاوی پێ بکەوێ. بۆیە کاتێ لە دوورەوە گوێی لە دەنگی عارەبانەکە بوو، بۆ پیشوازی، چووە لای بیرەکە.

(ماری)، لە (کیشینەف)، ئامادەیی دەخوێند کە (ترایان) هەشت سالّ دەرزی لێ خوێندبوو، سالّێکی دیکە، ئەویش ئامادەیی تەواو دەکرد. ئەو دووانە هەندێ جار یەك شەممان، لە (کیشینەف) چاویان بە یەك دەکەوت. (ترایان) چەند شیعرێکی پێشکێش کردبوو. (ماری) زۆر شایی پێدەهات کە ببوو بە (میوز)ی شاعیرێك.

کاتێ عارەبانە گەیشتە بەر دەرگای مالّی مامۆستا، (ترایان) گوتی:

–هەر بگەمە (بوخاریست)، ناونیشانی (بەشی ناوخۆ)مت بۆ دەنێرم.

ئەسپەکان هەوکە، بە هێدی دەڕۆیشتن.(ترایان) گوتی:

-(ماری)، سەلامی من بە (کیشینەڤ)و سەراپای (بێسارابی) بگەیەنە.

(ماری) گوتی:

-بەیانی، سەعات حەفت دەچم!

کچەی جحێڵ پشتی بە بیرەکە دا بوو. (با) تەنوورەی شینی وەکوو گوڵی (لە بیرم مەکە)ی دەهەژاندەوە.

(ترایان) دەستی هەڵوەشاندو گوتی:

-بە خاتریٚ تە تا پشووی (نۆیێل)!

ئەسپەکان دەستیان بە نەرمەغار کردەوە. (ترایان) تەماشای دواوەی کرد. دوای چەند خولەکێك، ڕێگا بە لای ڕاستەدا پێچی کردەوەو درەختی گەورە گەورە ماڵی مامۆستاو بیری بە گرگرەی دارو بێشەو کچەی تەنوورە شینیان، لەبەر چاو بزر کرد.

چوار مانگی مابوو بۆ (نۆیێل)، (ترایان) بە هیوا بوو، بێتەوە نوقمی شکۆو شانازی بیٚ. بیری دەکردە کە نوقمی شکۆو شانازی بگەڕێتەوە بۆ (ئیزڤۆر)، چ ڕوو دەدا؟! بە متمانەوە، بانەڕۆژی دەبینی.

دوای چەند چرکەیەك، ڕێگا لێژ بووەوە. ئێستگای ڕێگای ئاسن لە ناو دۆڵێکی چوار کیلۆمەتر دوور بوو. (ترایان) ئێستگا بچووکەکەی، بە دیواری سپیو بانی سواڵەتی سوور، لیٚ دەرکەوت. ئەو شوێنە ئێستگای کۆتایی هێڵەکە بوو، ڕۆژیٚ، تەنیا یەك قەتاری دەهاتیٚ. قەتارەکە سیٚ

ڤارگۆنی بچووكو قەمارەیەکی مەکینە (لۆکۆمۆتیف)ی هەبوو. ئێستا لەبەردەم بیناکەی دیوار سپیو بان سوور وەستابوو. (گریگۆر)، کە قەتاری لە ئێستگا بینی، ئەسپەکانی خێراتر بە لێژاییەکەدا هاژوایە خوارێ. ئەو دەیزانی ئەو تاکە قەتارەی بەیانی دێ، تا نیوەڕۆ ناڕواو ئەوان هێشتا کاتیان بە دەستەوەیە. بەڵام بێ حەمدی خۆی، ئەسپەکانی خێراتر هاژوا.

(گریگۆر) گوتی:

-لەبەر ئەوەی، کە لە پشووی (نۆیێل) دێیتەوە، بەفر باریوە، بە تاخورك دێمە ئێستگا، دەتبەمەوە.

(ترایان) بزەیەکی هاتێ. ئینجا هەردووکیان کڕ بوون. تەنیا دەنگی سمی ئەسپەکان دەهات.. عارەبانەکە، لەبەر ئێستگە، لە نزیك قەتار، وەستا. (گریگۆر)، قامچی بە دەستی راستەو جانتای (ترایان)ی بە دەستی چەپەوە گرتو سەرکەوتە ناو ڤارگۆنی یەکەم. (ترایان) کەوتە شوێنییەوە. کاتێ جانتاکەیان دانا، (نیکۆلا)، بە سواری ئەسپ، لەبەر پەنجەرەی قەتار دەرکەوت. بە غار بە دوویاندا هاتبوو.

گوتی:

-(بەهەشتی)! دایکە ئەم بەستە شیرینییەی بۆ سەفەری تۆ ئامادە کردبوو، تۆ لە بیرت چووبوو.

(نیکۆلا) سواری ئەسپێکی بێ زین بوو. شیرینییەکە لە قوماشێکی سپی پێچرابوو، لە پەنجەرەی قەتارەوە رایدەشت و دایە دەستی. (نیکۆلا) دەم و چاوی سوور هەڵگەڕابوو و ئەسپەکە شەلالی ئارەقە ببوو.

لێخوڕی قەتار، لە چاوەڕوانی چرکەساتی بەرێ کەوتندا، دەستی لاواندنەوەی بە بڕناخەکانی ئەسپەکان دادەهێنا کە لە عارەبانەی قەشە بەسرابوون و قسەی لەگەڵ (گریگۆر)و لەگەڵ سەرۆکی ئێستگەو لەگەڵ (ترایان) دەکرد.

ئەوسا، ئاماژەی بە رێ کەوتن درا، (نیکۆلا) هیوای سەفەرێکی خۆشی بۆ (ترایان) خواست و دووبارە بە (بەهەشتی) ناوی هێنا. (ترایان) لە پەنجەرەی قەتارەوە ئاماژەیەکی بۆ کردو تەماشای کرد لەگەڵ (گریگۆر) بەرەو (ئیزڤۆر) رۆیشتن و دوور کەوتنەوە. ئینجا لەسەر لاتەختێکی دار دانیشت و تەماشای دەورو بەری خۆی کرد. کەس لە ناو ڤارگۆنەکەو لە ناو هەموو قەتارەکە نەبوو

(ترایان ماتیزی) بە تەنێ سەفەری دەکرد.

* * *

## (٢)

(ترايان)، لە نشکەوە لە خەو بە خەبەر هات. لە پەنجەرەوە دیتی کلۆبەفری گەورە لە حەوشەی (بەشی ناوخۆ)ی قوتابییان دەباری. ئەو ژوورەی ئەمی تێدابوو، چوار چوارپای تێدا بوو. هەموو ژوورەکانی (بەشی ناوخۆ) بەم جۆرە بوون. چوارپاکەی ئەم، لە بنەبانێ، لە بن دیوار بوو. هەموو رۆژێ، کە (ترايان) چاوی دەکردەوە، سێ چوارپای بەتاڵی لای دەستەراستی خۆی دەبینی. کاتێ لە خەو رادەبوو، سێ قوتابییەکەی تری هاوژووری، رۆیشتبوون بۆ زانکۆ.

بەڵام ئەو بەیانییە، برادەرانی (ترايان)، هەرسێکیان، هێشتا لە ژوورەوە بوون. ئەو سێ چوارپایەی هەموو رۆژێ چۆل بوون. ئەو رۆژە جانتای کراوەیان لەسەر بوو. کاتی چوونەوەی قوتابییان بوو بۆ پشووی (لۆیێل). گەنجەکان جانتاکانی خۆیان دەپێچایەوە. باسی بەرنامەی رۆیشتنی قەتاریان دەکرد. بە دەنگی نزم قسەیان دەکرد بۆ ئەوەی (ترايان) لە خەو نەکەن.

یەکێکیان گوتی:

–ئێستا لە کنەمە، یەك مەتر بەفری تێکردووە! ماڵەوەمان دێنە ئێستگا بە تاخورك دەمبەنەوە.

(ترایان)، بەڵێنی (گریگۆر)ی بیر کەوتەوە کە لەکاتی بە رێ کردندا پێیدا. (گریگۆر)یش بە تاخورك دێتە دوای ئەم، لە ئێستگە. لە (ئیزفۆر)یش بەفر زۆر باریبوو، بەڵام لە (بوخاریست)، تا ئەو سبەینەیە بەفر دەستی بە بارین نەکردبوو. (ترایان) تەماشای ئەو کلۆ بەفرانەی دەکرد کە دەبارینە حەوشەی (بەشی ناوخۆ)و بیری لە (ئیزفۆر) دەکردەوە.

چوار مانگ بوو لە (بوخاریست) دەژیا. ئەوەندی سەرکەوتن بە دەست هێنابوو بە خەیاڵیدا نەدەهات. لە کێبڕکێی وەرگیرانی لە (بەشی ناوخۆ)دا دەرچووبوو و پارەیەکی زۆر کەمی دەدا. بەردەوام لە کۆلیجدا دەچووە وانەی فەلسەفە، سەرەرای ئەمەیش، لە رۆژنامەی (رۆمانی)، ببوو بە نووسەر. هەر لە سەرەتاوە، لەو کاتەوە کە هاتبووە (بوخاریست)، لە سەرکەوتن زیاتر هیچی نەدیبوو!!

کاتێ بە خۆشی خۆشی بیری لە سەرکەوتنەکانی ئەو چوار مانگەی دەکردەوە، دەرگای ژوورەوە سیڕەی هات و کرایەوە. بەڕێوەبەری (بەشی ناوخۆ) بوو، بەڕێوەبەر مامۆستایەکی کارکەنارو ریش سپی بوو، هاتە ژوورەوە. چەند رۆژ بوو، (ترایان) دەیەویست ریزەکەی دەرگای ژوورەوە چەور بکا، هەمیشە لە بیری دەکرد. هەموو رۆژێ، سەعات پێنجی بەیانی، کە دەگەڕایەوە (بەشی ناوخۆ). دەنگی سیڕەی

دەرگا برادەرەکانی نارەحەت دەکرد. (بەشی نـاوخۆ) لـە نیوشـەوەوە، کلیل دەدرا. هیچ قوتابییەك ڕێگای نـەدەدرا دوای ئـەو سـاتە بێتـەوە. (ترایان)، بە تایبەتی، کلیلێکی وەرگرتبوو، روخسەتی درابوو سـەعات پێنجی بەیانی بێتەوە. ئەو سەرپەرشـتی لاپـەڕەی رووداوە جیاوازەکـانی رۆژنامەی دەکردو ناچار بوو تا رۆژنامەکە لـە ژێر چـاپ دەهاتـە دەوە، لـە بارەگای رۆژنامەکە بمێنێتەوە. بەڕێوەبەری (بەشی ناوخۆ) بۆیـە ئـەم روخسەتە تایبەتییەی پێدا بوو تا بە هیچ جۆرێ بـرادەرە هاوژوورەکـانی سەخڵەت نەکا. ماوەی چوار مانگ بوو، (ترایـان) کـە داهاتـەوە ئـەو ژوورە، لەسەر نووکی پێ، خۆی دەگەیانـدە لای چـوارپاکەی کـە لـە بنەبانی ژوورەوە، لە بن دیوار بوو. هەموو شـەوێ، بـە تـاریکی جلـی دادەکەند. هاوڕێکانی هەرگیز هەستیان بە هاتنەوەی نەدەکرد.

-بەر لەوەی لە (بەشی ناوخۆ) بڕۆم، هەڵبەت دەبێ ریزەکـەی دەرگـا چەور بکەم. ئەمڕۆ نابێ لە بیر بکەم!

سـبەینان، وەختـی (ترایـان) چـاوی دەکـردەوە، دەیـدی ژوور چـۆڵە. نوینەکان رێك خراون. هەرگیز گوێی لە دەنگی هاوڕێکانی نەبوو کـە دەچوونە کۆلیج.

بەڕێوەبەر دەستی گوشی‌و، لێیپرسی:

-جەنابی (ماتیزی)، ئەمڕۆ دەڕۆی؟

(ترایان) سوور هەڵگەڕا. ئەو، یەکەمین قوتابی سـاڵی یەکـەم بـوو کـە بەڕێوەبەر بە (جەناب) قسەی لەگەڵ دەکرد. ئەمە تـەنیا بـۆ قوتابییـانی

دکتۆرا بە کار دەهات. بەڕێوەبەری (بەشی ناوخۆ)و هاوڕێکانیو مامۆستاکانی، ڕێزی تایبەتییان لە (ترایان) دەگرت چونکە هەموو ڕۆژێ وتاری لە ڕۆژنامەیەکی گەورە بڵاو دەکردەوەو خاوەنی دوو کتێب بوو و ڕەخنەگران بە کاری ئەدەبییان هەڵدەگوت.

(ترایان) گوتی:

–سبەی، سەعات حەفتی ئێوارە، بە قەتاری تیژڕۆ دەڕۆم.

سێ قوتابییەکانی تر هەر خەریکی پێچانەوەی جانتاکانیان بوون، بەڵام گوێیان لای گفتوگۆکە بوو.

بەڕێوەبەر گوتی:

– ماڵەوەتان بە بیبینت زۆر شادومان دەبن!

دەستێکی بلە شانی (ترایان) داو گوتی:

–تۆ سەرشار لە شانازی دەچیتەوە. شانازییەکەت شایانی خۆتە! بەڕێوەبەرایەتی (بەشی ناوخۆ) دەیەوێ بەر لەوەی بڕۆی، چاکەیەکت لەگەڵ بکا. لەمەودوا، ژوورێکی بە تەنیات دەبێ!

(ترایان) بڕوایی نەدەهات چاکەیەکی وای لەگەڵ بکرێ. (بەشی ناوخۆ)، تەنیا پێنج ژووری تاکە کەسی تێدابوو. ئەوانیش تایبەت بوون بە قوتابییانی دکتۆرا.

بەڕێوەبەر گوتی:

–تۆ لەوانی دیکە زیاتر کار دەکەی! تۆ هەقی ژوورێکی سەربەخۆت هەیە! جگە لەمەیش، تۆ مایەی شانازی (بەشی ناوخۆ)کەمانی.!

(ترایان) هەمیشە خەونی بەوەوە دەدی ژوورێکی یەك نەفەری سەربەخۆی هەبێ. ژوورێکی وا کە چیتر بە تاریکی جلی دانەکەنێ، بتوانێ بەر لە خەوتن، چارەکێك بخوێنێتەوە، ئێستا، ئەم خەونە نهێنییەی خەریکە دێتە دی.!

بەڕیوەبەر گوتی:

-بەر لەوەی بڕۆی، ژوورە تازەکەت نیشان دەدەم.

بەڕیوەبەر ڕۆیشت. (ماتیزی) سەرنجێکی لە سەعات دا. لە سەر چوارپا خۆی فڕێدایە خوارێ. بە پەلە جلی کردە بەر. سەرکەوتنێکی تری هاتە سەر سەرکەوتنەکانی پێشوو.

لە دڵی خۆیدا گوتی: (چەندین شەوم دەوێ تا ئەو هەموو سەرکەوتنانەی لە (بوخاریست) بە دەستم هێناون، لە (ئیزفۆر)، بۆ باوکم و بۆ کەس و کارەکانم، باس دەکەم.

ئەمانە سەرکەوتنەکانی بوون لە کۆلیج: مامۆستاکانی داوەتیان دەکرد بۆ فراوین و داوایان لێدەکرد وتار لەبارەی کتێبەکانیان بنووسێ. سەرکەوتنەکانی لە ڕۆژنامەکان، سەرکەوتنی لە (بەشی ناوخۆ). کە کلیلێکی سەربەخۆی وەرگرتبوو و ئێستایش دەبێ بە خاوەنی ژوورێکی تایبەت بە خۆی. هەر سەرکەوتن و سەرکەوتن و هیچی تر نا! بە ڕاستی، پێویستی بە چەندین شەو دەبێ تا باسی هەمووی بکا...

(ترایان)، دەستەبەرگێکی جوانی هەبوو. کە لەبەری دەکرد، شایی بە خۆی دەهات. هیوای سەفەرێکی خۆش‌و پشوویەکی چاکی بۆ هاوژوورەکانی خواست. پاشان سەرێکی لە بەڕێوەبەر داو بە راکردن چووە خوارێ بۆ سەر جادە. سەعات یازدە بوو. شەقامی (گریگۆریێسکۆی نیگارکێش)، کە (بەشی ناوخۆ)ی لێ بوو، کەوتبووە ناوەڕاستی شار، لە بەینی کۆشکی دەسەڵاتداریی‌و (ئاتێنێ پالاس) بوو. بە پەلە بە بەردەم پاسەوانانی کۆشکدا تێپەری، ئینجا چووە ناو موغازەیەکی تایبەت بە شتی ئایینی. خاوەنی موغازەکە بە بزەیەك پێشوازی کرد. (ترایان) گوتی:

-دەتوانین زوو پرۆڤە بکەین. دەڵێم زوو، چونکە دەبێ دە خولەکی تر لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس بم.

موغازەکە پڕ ئایکۆنی بیزانتی، جلی کەهەنوتی، شتی تایبەت بە بۆنەی ئایینی‌و خاچی زێڕ بوو. (ماتیزی) پاڵتۆکەی داکەند. خاوەنی موغازەکە بۆ چرکەساتێك بزر بوو، ئیبنجا هاتەوە، جوبەیەکی لە سەر بازوو بوو. کاتێ دورمانکەرەکە خەریکی پرۆڤە بوو، (ترایان) گوتی:

-دەبێ بۆ سبەی پشتی نیوەڕۆ، ئامادە بێ. سبەی ئێوارێ، سەعات حەفت، بە قەتاری تیژڕۆ دەڕۆم.

(ماتیزی) ناولەپی دەستی بە قوماشی رەشی جوبەکە داهێنا کە بۆ باوکی بە رادانی دابوو. ئەمە یەکەمین دیاری بوو، بە پارەی خۆی

کرپیـــووی‌و پێشـــکێش بـــاوکی، قەشـــەی (ئیزفـــۆر)ی دەکـــرد. بـــاوکی (ماتیزی) تەنیا یەك جوبەی هەبوو، تەنیا یەك جوبەی دە ســاڵ کـۆنی هەبوو، لـەبەر هەتاو و تۆزو تێپەڕینی رۆژگار رەنگی دابووەوە، خەنـەیی ببوو. زیاتر لـە رەشی، خۆی بە خەنەیی دەنگاوت. (ترایان) جوببەیـەکی نوێی بۆ دەبرد. باوکی تاقەتی نەبوو جوببەیەکی تر بۆ خۆی بکا.

(ترایان) گوتی:

-خۆشبەختانە قەدو قامـەتی مـن وەکـوو هـی بـاوکم وایـە. ئەگـەرنا، نەمدەتوانی ئەم دیارییەی بۆ ببەم. بەڵام ئەم جوبەیـەی ئەوەنـدە لێ دێ رێك وەکوو ئەوە وایە خۆی پرۆڤەی کردبێ.

(ترایان)، کاتێ جلـە رەشەکەی داکەند، بیری کـردەوە دایکـی دگـانی نەماوە. حەزی کرد تاقمە ددانێکی دەستکرد بۆ دایکی ببا. (ترایان) کە دەیدی، دایکی تەنیا ناوەکەی نـان دەخـوا، چـونکە نـاتوانێ توێژکـەی بجـوێ، دڵـی دەگوشـرا. دایکـی، تـا نـانی لــە چـای، یـان لــە ئـاودا نەخووساندبا، نەیدەتوانی بیخوا.

هەرچەندە لـە ناخی دڵەوە حەزی دەکرد ئەو دیارییـەی بـۆ ببـا، بـەڵام نەیدەتوانێ .

لـە دڵی خۆیدا گوتی: (رۆژێ، دایکم دێنمە (بوخاریست)و بە ماوەی مانگێك ددانەکانی بۆ لێ دەنێنەوە! )

لە هەمان کاتدا، لـە نەینۆك، تەماشای جوبـە رەشـەکەی دەکـرد کـە بەرگدروو لەسەر لـەشی پرۆڤەی دەکردو هەر دەتگـوت بـۆ خۆیـەتی. پاشان چاوی چووە سەر سـەعاتی سـەر دیـوار، کـە لـە نێـوان چـەند ئایکۆنێکی زێرو زیو بە دیوارەوە هەڵواسرا بـوو. سـەعات یـازدەو نیـو بوو. دەبوایە ئێستا لە پۆلیسخانە بێ.

(ترایان) جوبەکەی داکەندو پالتۆی خۆی کردەوە بەر. بە پەلـە، رووی کردە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس. چوار کـەس لـە بـەر دەرگـا چـاوەڕێیان دەکرد. ئەوانە چوار پەیامنێری رووداوی جیاوازی رۆژنامەکانی دیکەی پایتەخت بوون. هەموویان بە ساڵداچووبوون. (ترایان) وەکـوو کـوڕی وان وابوو. لـەبەر دەرگا، چووە دەستیان. ئینجـا هـەر پێنجیـان چـوونە نووزگەی راگەیاندنی پۆلیسخانە. تەنیا یەك لاتـەختی دارو یـەك مێـزی تێـدا بـوو. دەفتـەرێکی بـەرگڕەش لـەسـەر مێزەکـە بـوو. (مـاتیزی) دەفتەرەکەی کردەوەو بە دەنگی بـەرز دەسـتی بـە خوێندنـەوەی ئـەو برووسکانە کرد کـە لـە قومیسـارییەکانەوە رەوانـە کرابـوونو باسـی رووداوی رۆژیان تێدا بـوو. چـوار هاوپیشـەکەی (ترایـان) بـە پێـوە، تێبینییان دەنووسییەوە.

(ماتیزی) خوێندییەوە:

-مەلۆتکەیەکی فڕێدراویان لە شەقامی (پوپلیێ) دۆزیوەتەوە.

مێژووەکەی لـە دەفتەری تێبینی خۆی تۆمار کرد. ئینجا بە دەنگی بـەرز لـە خوێندنەوە بەردەوام بوو. لـە شـەقامێکی دیکـەدا، پایسکلسـوارێك

هەندێ شووشەبیرەی دەگواستەوە، لۆرییەك لێیداوە. جلدروویەکی بەرگی ژنان، ویستوویەتی بە دەرمانی خەو، خۆی بکوژێ... ئەو رۆژە تەنیا رووداوی کەمو بێ نرخ هەبوو. (ماتیزی)، پشتی ئەوەی دوا برووسکەی خوێندەوە، دەفتەرە رەشەکەی قەپات کردەوە. پێنج پەیامنێرەکە، کاغەزەکانیان بە دەستەوە بوو، بە دالانەکەدا رۆیشتن. چرای کارەبایی تێدا داگیرسابوون. لە هەموو دەرگاکانی دەستە راستو دەستە چەپیان دەدا. هەموو دەرگاکانیان تا نیوە دەکردەوەو دەیانپرسی داخۆ هیچ دەنگو باسیان بۆ راگەیاندن نییە. ئەمانە نووزگەی ئەفسەرانی دادپەروەری بوون. ئەو رۆژە، ئەو نووزگانە، هیچ دەنگو باسیان بۆ رۆژنامەکان نەبوو. ئەم دیدارەی پەیامنێرانی قەڵەمو کاغەز بە دەست بۆ ئەو دالانەی بۆنی زیندانی لێدەهات، رۆژێ دوو جار دووبارە دەبووەوە: نیوەڕۆو ئێوارە.

ئێستا، پەیامنێرەکان دووبارە چوونەوە جادە. لەبەر بەفربارین، چوونە ناو کافەیەك. هەموو رۆژێ، کە لە پۆلیسخانە دەهاتنە دەرەوە، دەچوونە ئەوێ بۆ ئەوەی تەلەفۆن بۆ ئاگرکوژێنو بارەگای جەندرمەو سەردخانەو نەخۆشخانەکان بکەن. ئەوەی تەلەفۆنی دەکرد، چییان پێدەگوت بە دەنگی بەرز دووبارەی دەکردەوە، ئەوانەی تر تێبینییان دەنووسییەوە. بەڵام لەوێش تەنیا دەنگو باسی بێ بایەخیان وەرگرت. کە تەواو بوون، هەر پێنجیان دەفتەرۆکەی تێبینییان لە گیرفانی پاڵتۆیان نا.

(ماتیزی) گوتی:

-بەیانی بۆ پشوو دەڕۆمەوە.

لە ناو هەموویان، تەنیا ئەو دەچووە سەفەر. پەیامنێرەکانی دی بە ژنو ماڵ بوون، لەگەڵ ژنو منداڵی خۆیان لە (بوخاریست) دەژیان.

(ماتیزی)، کاتێ بەرەو بارەگای رۆژنامە دەچوو، بیری لە (ئیزفۆر)، لە (گریگۆر)، لەو جوببەیە دەکردەوە کە بە دیاری بۆ باوکی دەبرد. لە هاوکارەکانی دابڕاو بە پەلە سەرکەوت بۆ بارەگای رۆژنامەکەی. لەو کاتەدا، خێنژی بەڕێوەبەرو یەك پێشخزمەت، کەس لە بارەگای رۆژنامە نەبوو.

چالاکیی رۆژنامە تا ئێوارە دەستی پێنەدەکرد. (ترایان ماتیزی) لەبەردەم ئامێری چاپی خۆی دانیشت. ئەو، تاکە پەیامنێرێك بوو ئامێری چاپی بەکار دەهێنا. ئەوانەی دی بە قەڵەم دار، یان قەڵەم پاندان دەیاننووسی. (ترایان)، هەر لە رۆژی یەکەمەوە، ئامێرێکی چاپی بە کرێ گرت . سوور بوو بە قەڵەم دار نەنووسێ. ئێستا خەریکی نووسینی ئەو رووداوانە بوو کە لەگەڵ هاوکارەکانی کۆیان کردبووەوە. پێشخزمەت بابۆڵەیەكو فنجانە قاوەیەکی بۆ هێنا. ئەمە تێشتی ئاسایی (ترایان) بوو. ئەگەر بە رێکەوت نووسینی زۆر بوایە، داوای قاوەی دووەمی دەکرد. کاتێ خەریکی داڕشتنی بەسەرهاتی باسۆڵێ فڕێدراوەکەی سەر جادەو غەمی عاشقانەی کابرای جلدرووی ژنانو ئەو پایسکلسوارە بوو کە لۆرییەك لێیدابوو، بیری لەو شەقامانە دەکردەوە کە ئەو رووداوانەیان لێ قەوما بوو. ئەو، تەواو شارەزای

(بوخاریست) بوو. بەڵام شەقامەکانی بە تایبەتی بە رووداوی خوێنینو دڵتەزێن دەناسییەوە کە لە شەقامەکان روویان دابوو. هەر شەقامێکی (بۆخاریست) بۆ (ماتیزی)، مانای (خۆکوشتن)ێك، کارەساتێك، بەسەرهاتێك، مەلۆتکەیەکی فڕێدراو، ئاگرکەوتنەوەیەك، یان شەڕێکی دەگەیاند. لەو چوار مانگەی لە (بوخاریست) بوو ، شەقام نەبوو رووداوێکی لێ نەقەومێ. (ترایان) باسی هەموو شەقامەکانی کردبوو. بە لای ئەوەوە، نەخشەی شار، نەخشەیەکی تراجیدی بوو. (ماتیزی)، کاتێ کاری خۆی تەواو کرد، پەرە تاپیکراوەکانی هەڵگرتو چووە نووزگەی سەرنووسەر. سەرنووسەر پیاوێك بوو لاچەرەکانی، سپی ببوو. ناوی (بیسیۆلا) بوو. سەری بۆ لای (ترایان) هەڵبڕی.

(ماتیزی) پەڕەکانی لەبەر دەمی (بیسیۆلا) داناو گوتی:

-ئەمرۆ هیچ شتی گرنگ نییە.

کابرای قژ ماشو برنج، خێرا پەڕەکانی خوێندەوە. لە پەراوێزی نووسینەکەدا، ئەو جۆرە پیتانەی نووسی کە دەیەویست پێی بنووسن. زەنگی لێداو پەڕەکانی دایە پێشخزمەت بۆ ئەوەی بیباتە بەشی پیتچنین. ئینجا سەرنجی پرسیاراوی بڕییە (ترایان)و گوتی:

-هیچی ترت دەوێ!؟

(بیسیۆلا) بێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵام بکا، بەردەوام بوو:

-بە راست، پیرۆزبایی نووسینی ئەمرۆ بەیانیت لێ دەکەم. شتێکی بەرزە. زەین دێ، چت پێدەڵێم. تۆ دەبی بە رۆماننووسێکی گەورە. واز

لە رۆژناموسیی دێنی. دەبی بە  رۆماننووس. رۆماننووسێکی بەهرەدار!
من کە رۆژنامەنووسێکی بە ساڵا چووی فرە ئاسـم، کـە نووسـینەکەی
تۆم خوێندەوە، چاوم پڕ فرمێسك بوو. ئافەرین!!
(ترایان) گوتی:

-هیچ هونەری من نییە. رووداوەکە خۆی دڵبزوێنە! مـن تـەنیا وەکـوو
خۆی نووسیومەتەوە. من دانەری نیم. دانەرەکەی ژیانە.

(بیسیۆلا) گوتی:

-ئەو هەموو خاکێتییەی ناویَ! تۆ قەڵەمێکی بیَ وێنەت هەیە! نووسـینی
تۆ وەکوو هی ئەوانەی تر نییە. مەسەلەکە ئەمەیە!
(ترایان ماتیزی) سوور هەڵگەڕا. چاوی بڕییە زەوی.
(بیسیۆلا) گوتی:

-تـۆ رۆژنامـەکانی تـر دەخوێنیتـەوە. دیوتـە هاوکارەکانـت هـەمان
رووداویـان چـۆن دارِشـتووە! لەگـەڵتام، شـتەکە خـۆی لـە خۆیـەوە
بابەتێکی بیَ وێنەیە. منداڵێکی سێزدە ساڵی هەتیو دەکەویَ. تـەنیا یـەك
خوشکی هەیە. خوشکی بە دیق دەمریَ. منداڵەکە، لە پڕ هەست دەکـا
لە دونیادا، تەنیایە. نائومێـدیی، پەرتـەکی لەبـەر دەبـڕیَ. خـۆی فـڕیَ
دەداتە بن پێچکەی ترام. خۆکوشتنی منداڵان شتێکی دەگمەنە. شـتێکی
سروشتییە کە هەموو رۆژنامەکان لـە لاپـەرەی یەکـەم، باسـی بکـەن.
هەموو رۆژنامەکان بە دوورو درێـژی باسـیان کـردووە. بـەڵام تـۆ بـە
شێوەیەکی تەواو جیاواز باست کردووە. تۆ زۆر بە سادەیی، بـە چـەند

دێرێك باست کردووە. ئینجا دوو لای رووداوەکەت شی کردۆتەوە: رێك ئەو لایەنانەی کە ئەبەدیەتو مرۆڤایەتی پێشان دەدەن. سێ ستوونت لەم بارەیەوە نووسیوە. تۆ تاکە کەسێکی نووسیوتە: بەیانی ئەو رۆژەی ئەو منداڵە خۆی کوشت، چوو بۆ ئەوەی گۆڕی دایكو باوكو خوشکی گوڵباران بکا. ئەوانەی تر باسی شتی وایان نەکردووە. بە لای تۆوە ئەمە رەگەزێکی گەورەی کارەساتەکەیە. منداڵێك، بە تەنیا ماوە. بە دوای ئەو کەسانەی لە دەستی داون، دەچێتە گۆڕستان... پاشان تۆ بە درێژی باسی رووداوێکی ترت کردووە کە ئەوانیتکە، بە سەرەڕۆییش، باسیان نەکردووە: تۆ باست کردووە، منداڵەکە بەر لەوەی خۆی فڕێ بداتە بن لۆکۆمۆتیف، چاوی خۆی بە دەستماڵێك بەستۆتەوە بۆ ئەوەی لۆکۆمۆتیڤەکە نەبینێ. منداڵەکە، لەسەرو بەندی خۆکوشتنیشدا، منداڵێکە وەکوو هەموو منداڵانی دونیاو هەر چەندە ئامادەی خۆکوشتنە، وەکوو منداڵاتی تر دەترسێ! ئەو چاوە بەستراوانە گەورەترین هەستیان لە تۆ بزواندووە. بۆ هەموو خوێنەرانیش هەروان. ئەوانەی تر باسی ئەمەیان نەکردووە. لەبەر ئەوەیە راپۆرتەکەی تۆ ئەو جۆرە سەرکەوتنەی بە دەست هێناوە. لەبەر ئەوەیە تۆ دوور دەڕۆی! تۆ لە رووداوە جیاوازەکان، پەنجە لەسەر لایەنی جاویدانیی مرۆڤایەتی دادەنێی. پیرۆزباییت لێ دەکەم، (ماتیزی)!! لەو رێگایە بەردەوام بە...

(ماتیزی) بۆ ئەوەی بەرامبەر ئەم قەدر گرتنە، سوپاسی بکا، بە پچڕ پچڕی هەندێ وشەی دەربڕی. بەڵام هەروا لەبەردەم مێز بە پێوە وەستا (بیسیۆلا) گوتی:

-هیچی ترت هەیە پێم بڵێی؟

(ترایان) گوتی:

-خۆت دەزانی لەم بەیانییەوە، پشووی کۆلیج دەستی پێکردووە. منیش گەرەکمە بەیانی بڕۆمەوە، دەمەوێ بچمەوە (ئیزڤۆر).

(بیسیۆلا) پرسی:

-پشووی جەژنی (نۆیێل)؟ پەیامنێری لاپەڕەی ڕووداوی جیاواز، ڕێك لە جەژنی (نۆیێل) ڕوخسەت وەربگری؟! لەوەتی ڕۆژنامە هەیە، شتی وا نەبووە! یان گاڵتە دەکەی!؟

(بیسۆلا) توورە بوو، گوتی:

-لە ڕۆژانی (نۆیێل)، چالاکی پەیامنێرانی لاپەڕەی ڕووداوی جیاواز دەگاتە ترۆپك! ئەگەر ڕوخسەتت دەوێ، دوای جەژن بڕۆ. دوای جەژن وەری بگرە! بە لێنت پێ دەدەم. قسەکردن بێ فایدەیە!...

(ماتیزی) گوتی:

-دەبێ ئێستا بڕۆم. ئێستا پشووی کۆلیجە.

(بیسۆلا) گوتی:

-قسەی لەسەر نییە! لە ڕۆژانی جەژن ڕوخسەت وەرناگری! ئەوە ناڵێم ئەگەر بتەوێ واز لە ڕۆژنامە بێنی! لەو حاڵەتەیشدا، ناتوانی سبەی بڕۆی. بە پێی گرێبەستەکەت، دەبێ پازدە ڕۆژ پێش ڕۆیشتن، ڕۆژنامە ئاگادار بکەیتەوە. ئیتر، بە هیچ جۆرێ مەسەلەی بەیانی لە گۆڕێ نییە...

(ماتیزی) گریانی هات! ئەمە یەکەم جار بوو رۆژنامە داوای رەت دەکردەوە. شتی وای بە خەیاڵدا نەدەهات. (بیسۆلا) دەیتوانی هەموو شتێکی رەت بکاتەوە، بەڵام (ترایان ماتیزی)، بە خەیاڵی دانەدەهات لێنەگەڕێ جەژنی نۆیێل لەگەڵ خانەوادەکەی بکا،

(بیسیۆلا) گوتی:

-دوای چەژن، یەکسەر روخسەتت دەدەمێ. قسەی شەرەف بێ، تۆ دوای نۆیێل سەفەر دەکەی. یانی هەر ئەوەندەیە ئێستا سەفەرەکەت دە رۆژ دوا دەخەی. ئێستا ئەستەمە بڕۆی! قەتاو قەت ناکرێ.

(ماتیزی) لە نووزگەی (بیسیۆلا)ی رۆیشت، چوو لە پشت مێزەکەی، بەرامبەر ئامێری چاپ دانیشت. زۆر نارەحەت بوو. بە زەحمەت رۆندکی خۆی پێ رادەگیرا. پێشخزمەت دووەم فنجانە قاوەی بۆ هێنا. وای دەزانی (ترایان) هێشتا کاری ماوە. کە (ترایان) هێشتا کاری هەبایە، بێ ئەوەی داوای لێ بکا، قاوەی دووەمی بۆ دەهێنا. (ماتیزی)، بە قامك ئاماژەی کرد کە قاوەی تری ناوێ. هیچی تری ناوێ! پێی وابوو ئەگەر دوای (نۆیێل) بچێتەوە (ئیزفۆر)، نە خوشکی دەبینێ کە دووبارە دەگەڕێتەوە کۆلیج و نە (ماری)! لە رۆژانی جەژندا، دایبابی غەم بە نەهاتنەوەی دەخۆن. بێ شك دڵتەنگ دەبن! ئەو خۆیشی لە (بوخاریست) غەمبار دەبێ. ئەوان لەوێ تەنیا دەبن و ئەم لێرە! لە زەینی خۆیدا، هەموو ئەو شتانەی ئامادە کردبوو کە دەیەویست رۆژانی نۆیێل لای درەختەکە، بۆیان باس بکا: هەموو سەرکەوتنەکانی لە

رۆژنامە، لە زانكۆ، لە بەشی (ناوخۆ). ئەگەر نەتوانیّ باسی ئەو شتانە بۆ دایابی بكا، دەسكەوتەكانی هیچ نرخیان نامیّنیّ.

پیّشخزمەت هاتەوە. بۆ ئەوە نا كە قاوەی دووەم بیّنیّ، بەڵكو ئەم جارە، بەستەیەكی لە رۆژنامە پیّچراوی لە سەر میّزی (ترایان)و لە تەك ئامیّری چاپ دانا. (ترایان) بە توورەیی بەستەكەی كردەوە. توورە بوو چونكە نەیدەتوانیّ بچیّتەوە ماڵیّ. كە بە توورەیی داوەكەی پساندو كاغەزەكەی كردەوە، لە سەر كورسییەكەی وزاقی داو بە هەراسانی لە ماسەكەی دوور كەوتەوە. بانگی پیّشخزمەتی كرد. بەستەكە، كە لەسەر ئامیّری چاپ كرابووەوە، ئەنگوستیّك، ئەنگوستیّكی بچووكی منداڵانەی تیّدا بوو. ئەنگوستیّكی براوا خەڵتانی خویّن! نینۆكیّكی شین‌و مۆر هەڵگەڕابوو. (ترایان)، پشووی قەدەغەی خۆی‌و (ئیزفۆر)و درەختی (نۆییّل)ی لە بیر كرد. هەموو شتیّكی لە بیر كرد. دووبارە هاواری كرد. وەكوو ئەوەی بیەویّ داوای یارمەتی بكا، بانگی پیّشخزمەتی كرد. رەنگی بزركابوو، چرك‌و هۆڕ دەلەرزی. پیّشخزمەت هات. كە ناوەرۆكی بەستەكەی بینی ، ترساو پاشەو پاش كشایەوە.

بە تەوازۆ هیّنانەوە گوتی:

–نەمدەزانی چی تیّدایە. تكایە بمبوورە! نەخیّر! نەمدەزانی چی تیّدایە! كۆمەڵە منداڵیّك هیّنایان. پیّیانگوتم بۆ تۆیە!

(ماتیزی) هاواری كرد:

-هەڵیگرە! کێ ئەوەند چەتوون دەبێ ئەو گاڵتە قەشمەرییانە بکا.؟ ئەو چەتوونانە!

نامەیەکی بێ زەرف لە بن بەستەکە بوو. (ترایان) خەتە ناخۆشەکەی خوێندەوە. خەتی منداڵێکی قوتابخانەی سەرەتایی بوو. نهێنی ئەنگوستەکەی روون کردبووەوە. شتەکە گاڵتەیەکی کوشندە نەبوو! ئەو منداڵانەی لە نزیك رێگای ئاسن یارییان دەکرد، ئەنگوستی ئەو هاورێیەیان دۆزیبووەوە کە رۆژی پێشوو، دوای ئەوەی چاوی خۆی بەستبووەوەو خۆی فرێدابووە بن قەتار. کرێکارانی سەردخانە کە جەنازەکەیان هەڵگرتبوو، ئەنگوستەکەیان نەدیبوو کە پێچەکەی لۆکۆمۆتیڤ چەند مەتریك دوور هەڵیدابووە ناو بەفر. ولداشیارییەکانی منداڵە مردووەکە ئەنگوستەکەیان دۆزیبووەوەو بۆ (ماتیزی)یان هێنابووە بارەگای رۆژنامە. کاتێ جەنازەکەیان هەڵگرت، (ترایان) لەوێ بوو. لەبارەی خۆکوشتنەکە، قسەی لەگەڵ زارۆکانی گەڕەك کرد. وتارێکی لە بارەی کارەساتەکە نووسیبوو. منداڵان تەنیا (ترایان)یان دەناسی. ئەنگوستەکەیان بۆ ئەو هێنابوو. نەیاندەزانی چی لێ بکەن! بۆ ئەویان هێنابوو چونکە ئاگای لە خۆکوشتنەکە بوو...

(ماتیزی) بە پێشخزمەتی گوت بەستەکە رەوانەی سەردخانە بکا. ئینجا چووە نووزگەی (بیسۆلا)و نامەکەی نیشان دا.

-ئەو منداڵانە وایان زانیوە ئەوەی لە هەموویان زیاتر خەریکی تۆژینەوەی مردنەکە بوو، (ترایان ماتیزی) بووە، نەك سەردخانە، یان

پۆلیس. منداڵەکان تێگەییون تەنیا تۆ دڵت لای رووداوی کارەساتباری هاورێکەیان بووە، بۆیە ئەم ئەنگوستەیان بۆ تۆ هێناوە.

(ترایان) گوتی:

-مەرگبارە!

هێشتا هەر تۆقابوو.

-ئەمە سەرکەوتنێکی بێ وێنەیە. سەرکەوتنێکی لە ئاسابەدەرە! هۆکەیشی ئەوەیە تۆ وەکوو ئەوانی تر نانووسی. ئەوە بوو پێمگوتی!!

(بیسیۆلا) شەپی لە شانی (ترایان) داو ناردی بۆ ئەوەی پشوو بدا.

-تۆ کاتێ ئەم سەرکەوتنانە بە دەست دێنی، دەتەوێ واز لە رۆژنامە بێنی؟! رێك لە کاتی (نۆبێل)یش، کاتێ چالاکی لەو پەرپیدایە!؟ تۆ دوای جەژن دەرۆی! هەرێم پێدای، دوای جەژن دەرۆی!

## (٣)

جەژنی (نۆییێل) بەسەر چوو. (ترایان ماتیزی) خۆی ئامادە کرد بچێتەوە (ئیزڤۆر)، بەڵام ئێستا، بۆی دەرکەوت، بە هیچ چەشنێ ناتوانێ لە ڕۆژانی جەژندا، ڕۆژنامەکە جێ بێلێ. ئیشێکی زۆر هەبوو. هەرگیز تاوانو کارەساتو ڕووداو بە قەد ڕۆژانی جەژن نییە.

(بیسیۆلا) گوتی:

-هەر وەکوو قسەم پێدای، بەیانی دەڕۆی! من ساحیبی قسەی خۆمم!! قەولی شەرەف شتێکی پیرۆزە.

(ماتیزی) گوتی:

-تەنانەت، دایبابیشم بە بارودۆخەکە دەزانن. بۆم ڕوون کردوونەتەوە کە جەژنی (نۆییێل) بۆ پەیامنێر پڕ چالاکیترین کاتە. بەیانی دێنە ئێستگا، چاوەڕێم دەکەن.

(بیسیۆلا) گوتی:

–لە بیر نەکەی، بەر لەوەی بڕۆی، ریپۆرتاجی لاپەڕەی ئەدەبیم بە دەست بگەیەنە!

(ماتیزی) تەماشای سەعاتی کرد. سەعات شەشی ئێوارە بوو. تا سەعات پێنجی بەیانی کاتی هەبوو گوتارەکە بنووسێ. تا نیوەشەو لە (دەستەی بەڕێوەبەر) دەمایەوە. ئینجا لە کافەی رۆیال، کە لە شەقامی سەرەکی بوو، دەچووە لای هاورێ پەیامنێرەکانی. ئەم کافەیە بە درێژایی شەو کرابووەوە. پەیامنێران، لە کافەی رۆیالدا، چاوەڕێی هەموو رووداوەکانیان دەکرد کە بە درێژایی شەو لە (بوخاریست) روویان دەدا. چالاکیی پەیامنێری رووداوی جیاواز، سەعات پێنجی بەیانی، کۆتایی دەهات کە بانگی رۆژنامەفرۆشانی بەیانی لەسەر شۆسەکان بەرز دەبووەوە.

(بیسیۆلا) گوتی:

–حەز دەکەم پێش نیوەشەو راپۆرتەکە وەربگرم. یەکسەر دەست بە کار بە! دەبێ بەیانی، لە لاپەڕەی ئەدەب بلاّوی بکەمەوە.

(ترایان) لە پێش مێزەکەی و لەبەردەم ئامێری چاپ دانیشت. پێشخزمەت فنجانە قاوەکەی بۆ هێنا. ( ماتیزی)، جگە لە رووداوی جیاواز، حەفتەی وتارێکی ئەدەبیشی دەنووسی، باسی ژیانی شاعیرێك، یان هونەرمەندێکی دەکرد کە لەو حەفتەیەدا یادی دەکرایەوە.

ئەو حەفتەیە، یادی ساڵانەی مردنی (ئەلیکسیس ماتیڤیسی)ی شاعیری خەڵکی ( بێسارانی) بوو. (ترایان)، وێنەی شاعیرەکەی لە تەك ئامێری چاپ دانا. (ماتیڤیسی) قەشە بوو. (ماتیزی) بە وردی تەماشای وێنەی قەشەی شاعیری کرد. ئینجا وێنەی شارەکانو بینا مێژووییەکانو دیمەنەکانی (بێسارابی)، یەك لە تەك یەك، لەسەر مێز دانا. (ترایان)، (بێسارابی) بەلاوە بە قەدەر (ئیزفۆر) ئازیزو قەدرگران بوو. هەموو سەردەمی منداڵیو هەموو سەردەمی گەنجێتی خۆی، لە (کیشینف)، لە کۆلیج، بە ڕێ کردبوو. لە ڕۆحی (بێسارابی) [1]و (بێسارابی)یەکان دەگەیشت. (بێسارابی) سێ ملیۆن نەفەری تێدایە. ئەمە هەرێمێکی سنوورییە. ماوەیەك کەوتە ژێر دەسەڵاتی رووسەکانو پاشان کەوتە ژێر دەستی فەرمانڕەوایی رۆمانیا. (بێسارابی)، خاکەکەی رەشەخاكو بە پیتە! ئەم هەرێمە، لەم سەر تا ئەو سەری ، هەمووی سەوزاییو داری بەرییە. دیمەنەکانی دڵڕفێنن. خەڵکەکەیشی وەکوو دیمەنەکان، هێمنو ئارامن. (ماتیڤیسی)ی قەشەی شاعیر، جوببە لەبەرو خاچی زێڕ لە مل، لەو دیمەنەی لەسەر مێزی (ماتیزی) بوو، وەکوو هەموو خەڵکی (بێسارابی)، چاوی نەرمو میهرەبان بوو. (ماتیڤیسی) بە شیعرێکی بە ناوی (هۆنراوەیەك بۆ زمانی رۆمانی) هاتبووە ناو ئەدەبی رۆمانی. کەس شیعری تری نەدیبوو، بەڵام هەموو قوتابییانی قوتابخانە سەرەتاییەکان ئەم شیعرەیان لەبەر بوو.

[1] هەرێمێکە لە نێوان پرووتو دنیێستەر

هۆنراوەکەی (ماتیڤیسی) بەم جۆرە دەستی پێدەکرد: (زمانی رۆمانی وەکوو پەرەملەیەك وایە...). (ترایان)، شاد بوو کە گوتاری ئەو حەفتەیەی لە بارەی شاعیرێکی (بێسارابی)یە، هەرچی لە بارەی (بێسارابی)یەوە دەینووسی، شادییەکی گەورەی پێ دەبەخشی.(ترایان) هەر گاوێ باسی (بێسارابی) دەکرد، هەستی دەکرد باسی دایکی، یان خانەوادەی خۆی دەکا.

(ترایان) دەستی بە نووسینی گوتارەکەی کرد. ئامێری چاپی راکێشایە پێش، بۆ بەر سینگی. کەم شاعیری (بێسارابی) ناویان لە مێژووی ئەدەبدا هاتووە. لە (بێسارابی)دا، شیعر لە داب‌و رەوشتی رۆژانەدایە. لەبەر ئەوەیە شاعیرانی (بێسارابی) ناویان لە مێژووی ئەدەبدا نییە. چونکە خەڵکی (بێسارابی) خۆیان شاعیری ژیانن. رۆژ بە شیعر بەسەر دەبەن. ئەو سێ ملیۆن کەسەی لە نێوان (پروت)و دنیێستەر) دەژین شاعیری زگماکن! شیعری ئەم خەڵکە شیعرێکی خۆییە. شیعرێکی دڵدارییە، چوارچێوەکەی فەزای نێوان زەوی‌و ئاسمانە! زەوی‌و ئاسمان، وەکوو شایەتی ژیانی مرۆڤ، بەردەوام لە شیعری (بێسارابی)دا، دەردەکەون!

(ترایان ماتیزی) نووسی:

-(من هەشت ساڵ لە (بێسارابی) ژیاوم. لە (کیشینێڤ)، کلێسەیەکی بچووك لە نزیك کۆلێجەکەمان هەبوو. بە عام دەچووینێ!! لە کاتی رێ‌و رەسمی ئایینیدا، تەماشای ئەو خەڵکانەم دەکرد کە بۆ دوعاو نوێژ

دەهاتن. ئەوانە ماوەی یەك خولەك، یان پێنج خولەك، یان بە درێژایی ماوەی رێو رەسمەکە دوعایان نەدەکرد، (بێسارابی)یەکان، دوای ئەوەی دەهاتنە کلێسە، لەبەردەم ئایکۆنێك چۆکیان دادەدا-دەتگوت-چەند سەعاتێکە لە ئەبەدییەتدا نقووم بووین. تەنانەت دوای رێو رەسمیش، (بێسارابی)یەکان، لە ناو کلێسەی کش و ماتدا، لەبەردەم ئایکۆنەکاندا، لەسەر چۆك دەمانەوە. (بێسارابی)یەکان، لەناو رەزەکانیان، لە سەر زەوییەکانیان، لە هەموو لقەکانی چالاکییەکانیاندا، وەکوو ئەوە دەجوولانەوە کە لە کلێسە بن.، بە جۆش و پیرۆزییەوە کاریان دەکرد. جۆش و خرۆش گەورەترین بزوێنەری شیعرە! نیشانەی سەرەکی هۆنراوەی (هۆنراوەیەك بۆ زمانی رۆمانی)ی (ماتیفیسی)، جۆش و خرۆشە.)

(ماتیزی) نووسینەکەی خۆی خوێندەوە. دەیزانی زیاد لە پێویست سۆزدارییە! بەلام لەبەر ئەوەی باسی (بێسارابی) دەکرد، نەدەبوو وا نەبێ. لە نووسینەکەی بەردەوام بوو:

-(ئەگەر لە ژیانمدا، ناچار بم شوێنێکی دیکە بۆ ژیان هەلبژێرم، خاکەرەشی (بێسارابی) هەلدەبژێرم. ئەگەر رۆژێ بتوانم شیعری جوان بهۆنمەوە، شیعری دلداری بۆ خاکی کرێن و بەردەلانی(ئیزفۆر)و بۆ رەشەخاکی (بێسارابی) دەنووسم. لە شیعرەکانم دوعا دەکەم و لە دەرگاهی پەروەرگار دەپاڕێمەوە، ئاشتی و ئارامی ئەو خاکە بپارێزێ کە بە درێژایی مێژوو، بە ئاوی (دنیێستەر)و (پروت)و بە خوێنێکی زۆر

ئاودراوه.) لەبەر ئەوەی خوێنێکی زۆر لەسەر خاکی (بێسارابی) رژاوه، بۆی هەیە خودا دوعای شاعیرگیرا بکاو لە بانەرۆژدا، تەنیا بە بارانی خێروبەرەکەت ئاو بدرێو قەت بە خوێن ئاو نەدرێ. شەو، کاتی سەر دەخەمە سەر سەرین، من (منی نووسەری ئەم دێرانە) وا دەزانم سەر بە خاکی (ئیزڤۆر)و خاکی (بێسارابی) دەکەم کە وەك ناواخنی نان نەرمە.)

(ماتیزی) کە گوتارەکەی لە بارەی ژیانی (ماتیڤیسی)ی شاعیر تەواو کرد، دای بە (بیسیۆلا).

ئینجا چووە ناو شار. لە نیوەشەو تێپەڕی بوو. دەبوایە چاوی بە هاوڕێکانی پەیامنێری رووداوی جیاواز بکەوێ. کە لە شەقامی سەرەکی، گەیشتە کافەی رۆیال، چوار هاوکارەکەی بینی لە پشت مێز دانیشتبوون، یاری کارتیان دەکرد. مادەم یاری کارت دەکەن، مانای وایە هیچ رووداوی گرنگ نەقەوماوە. (ماتیزی) سڵاوی لێکردن. بە تەنێ، لە سەر مێزی تەنیشتیان دانیشت. بیری لە سەفەری سۆزیی خۆی کردەوە بۆ (ئیزڤۆر). دەمو چاوی لەبەر شەکەتیو شادی، سوور هەڵگەڕابوو. ئەو دەفتەرۆکەی دەرهێنا کە رووداوی ئەو رۆژەی تێدا تۆمار کردبوو. کردییەوە. لە لاپەڕەیەکی سپی، دەستی بە نووسینی شیعرێك کرد:

(زستان لە هەموو شتێ زیاتر ئازارم دەدا چونکە بەفر دەبارێ. بەفری وا سپی سپی، هەر دەگاتە سەر زەوی، دەبێ بە قوڕ...)

پێشخزمەت هاتە لای مێزی (ماتیزی)و گوتی لـە تەلـەفۆن دەیالـەوێی. بەڕێوەبەری ڕۆژنامەیە تەلەفۆنت بۆ دەکا!

چوار پەیامنێرەکەی مێزی تەنیشت، دەستیان لـە یـاری هـەڵگرت و چاوەڕێی گەڕانەوەی (ترایان)یان کرد.

(ماتیزی)، کە گەڕایەوە، گوتی: (هیچ نییـە. بەڕێوەبـەر داوام لێ دەکـا یەکسەر بگەمە بارەگای (دەستەی نووسین). ئەگەر شتێکی نوێ هەبێ، تەلەفۆنتان بۆ دەکەم.

(ماتیزی)، چوار چوار، پایەکانی پلیکانەی تەی کردو چووە نووزگـەی (بیسیۆلا).

بە شێوەی ئاسایی، ئەو کاتانە هیچ کەس لە بارەگـای ڕۆژنامـە نـەبوو. بەڵام ئێستا هۆل سیخناخ بوو. دەتگـوت خـەڵك لـە زەوی دەربوونـە. کەس تەماشای (ماتیزی) نەکرد. ئەگەر وانەبا، هەر کەسـە پرسـیارێکی هەبوو، لێی بکا. ئەم جارە، کەس بەری بە هاتنی ئەوەوە نەبوو. هەموو، مرووزیان گرژو سەنگین بوو.

(ماتیزی) پرسی:

-بۆچی لە دووت ناردووم!؟

(بیسیۆلا) فەرمانی دا:

-لە ( دەستەی نووسین) دەرمەچوو!

(ماتیزی) چووه ژووری پەیامنێران. یەکێ لە هاورێکان دوا دەنگو باسی راگەیاند:

-رووسەکان (بێسارابی)یان داگیر کردووه! به پێی پەیمانی نێوان ئەڵمانیاو سۆڤیەت، (بێسارابی) دراوەتە رووسەکان. چەتربازانی سۆڤێتی لە (کیشینڤ)ن، لە کەناری (پروت)و لە کەناری دەستەراستی (دنییێستەر)ن، لە هەموو جێگایەکی (بێسیارابی)ن...

تەلەفۆنچی دوا قسەی ئەو پەیامنێرەی راگەیاند کە لە کۆشکی سەرۆکایەتی بوو.

لەشکری رۆمانی دوا ئاگاداریی سۆڤێتەکانیان بۆ هاتووه کە لە ماوەی سێ رۆژدا، (بێسارابی) جێ بێڵن. لە نیوەشەوەوە، لەشکرو رێکخراوەکان دەستیان بە چۆڵ کردن کردووە. پرسەی نەتەوایەتی، لە سەرانسەری وڵاتدا، راگەیاندراوە. ماوەی سێ رۆژ، هەموو ئاڵاکانی سەرانسەری وڵات تا نیوە دێنە خوارێ. وەزارەتی کاروباری ئایینی دەستووری داوە لە ماوەی ئەو سێ رۆژەدا، هەموو کلێسەکان زەنگی پرسە لێبدەن...

(ماتیزی)، لە ماوەی ئەو هەشت ساڵەی لە (کیشیتڤ) بوو، هەزاران پەناهەندەی رووسی دیبووکە لە بن ئاگری مەترەلۆز، لە (دنییێستەر)ی بەستوو، دەپەڕینەوەو دەهاتنە رۆمانیا چونکە بەرگەی تۆقانی کۆمۆنیستییان نەدەگرت. ئێستایش، تۆقان گەیشتۆتە (بێسارابی). تۆقان،

گەیشتۆتە (کیشینف)، (بالتزی)، (سۆرۆکا)و (تیگینا). تۆقان لە هەموو شوێنێ هەیە. هەر کوێنــدەر سـۆڤیێتی لێ بــێ، تۆقـانی لێیــە.. (مـاتیزی) ئەمەی دەزانی. بیری لەو دۆستانە کردەوە کە لــە (کیشـینیڤ) بــوون: (ماری) لە (کیشینیڤ) بوو، خوشکە گەورەکەی لە (کیشـینیڤ)، لــە کۆلێج بوو. (ترایان) بە پەشۆکاوی بیری کردەوە: (ئەوانە هەموو چییان بەســەر دێ؟! مامۆســتاکانی پێشــووم، هاوڕێکــانم، کتێبفرۆشــەکەی (کیشینف)! شاعیرە برادەرەکانی (بێســارابی)م؟ ئێســتا، رووس لــەوێن. چەتربازانی سۆڤیێت لەوێن، شەو، لە سەرانسەری (بێسارابی) دابەزیون!

پەنجەرەکانی ژووری (دەستەی نووسین) کرابوونەوە. دەنگـی زەنگـوڵێ هەموو زەنگوڵەکانی (بوخاریست)، لە پەنجـەرە کراوەکانــەوە وەکـوو زاری، وەکوو ناڵــەی دوورو درێـژ، لــە دەرەوە دەهــاتو دەگەیشـتە ژووری (دەستەی نووسین). زەنگوڵەگانی سەرانسەری وڵات. ئاوازی مەرگی (بێسارابی)یان لێدەدا. دابی جەنازەیی (بێسارابی) بـوو. هــەموو زەنگوڵەکانی (بوخاریست) لێیانــدەدا. هــەموو بــە یەکــەوە لێیانــدەدا. مەرگبارو دڵشەوات بوون. (ماتیزی)، رۆندکی لە چاو قەتیس ما بـوو. گریانی لە هەوکێ مابوو، لە کاتێکدا کە زەنگوڵی دڵشــەوات ئـاوازی مەرگی (بێسارابی)یان لێدەدا، یەکەم بەیانی رەسمی لە (تی ئـێس ئیــف ) بلاّو کرایــەوە. رادیـۆی ژووری چـاوەڕوانی رایگەیانــد کــە (پرســەی نەتەوایەتی) لــە رۆمانیــا راگەیانــدراوەو هــەموو ماڵــەکان ئـالاّی رەش هەڵدەکەنو قەشەکان قداس جێ بە جێ دەکەن.

(ماتیزی) لە پشت مێز دانیشت. تەوێلی خستە سەر تابلۆی پیتەکانی ئامێری چاپ. هەرچەندە پێی سپاردرابوو رووداوە جیاوازەکانی پایتەخت کۆبکاتەوەو دایانبڕێژێ، بیری کردەوە ئەو شەوە، ئیتر هیچ رووداوێکی تر بایەخی نییە. خەبەری داگیرکرانی (بێسارابی) لە لایەن رووسەکانەوە، هەموو خەبەرێکی تری سڕیبووەوە.

سەعات دووی بەیانی، (ماتیزی) تەماشای سەعاتی هۆڵی (دەستەی نووسین)ی کرد. هۆڵەکە چۆڵ بوو. ئالاکانیان تا نیوە هێنابووە خوارێ. (ترایان)، بێ دەستی خۆی، دەسکی تەلەفۆنی هەڵگرت و لە ئێستگای ئاگرکوژێنی پرسی ئاخۆ هیچ رووداوی تازە نییە! هیچ نەبوو. دەسکی تەلەفۆنی دانایەوە. چووە خوارێ بۆ سەر جادە. خەڵك، تاقم تاقم، لە سەر جادە سەریان بە یەکەوە نابوو، قسەیان دەکرد. کافە سەرشار بوو. هاوکارانی (ماتیزی) لەوێ نەمابوون. ئەوانیش لە (دەستەی نووسینی) خۆیان بانگ کرابوون. (ماتیزی) هیچ سەرنجی لەو کەسانە نەدا کە لە دەوری مێزەکان قسەیان دەکرد. کەس تەماشای وی نەدەکرد. کەش و سەقایەکی قورس بوو. (ترایان)، لە پشت هەمان ئەو مێزە دانیشت کە پێش سەعاتێك لەوێ دەستی بە نووسینی شیعرێك کرد. دەتگوت لە بۆشایی هەڵواسراوە. تا سەعاتی کافەی رۆیال پێنج جاری لێدا، لەوێ مایەوە. (ترایان) دەیزانی ئیتر هیچ شتێ نەماوە بۆ نووسین. بەلام ئەو دەبێ ئەرکی خۆی بە جێ بێنێ. ناکرێ جێگای خۆی جێ بێلێ. لە جێی خۆی مایەوە تا بانگی فرۆشیارانی چاپی بەیانیی رۆژنامە پەراوێز

رەشەکان لە سەر شۆسە بەرز بووەوە (ترایان) (رۆمانی) کڕی. لاپەڕەی یەکەم، لە ناو چوارچیوەیەکی رەشدا بوو. لە سەرەوەی لاپەڕەکە، بە پیتی گەورە، بەیانی داگیرکرانی (بێسارابی) نووسرابوو. یەکسەر لە ژێر ئەوەوە، گوتارەکەی ئەم بوو لە بارەی ئەو شاعیرە (بێسارابی)یەی کە (سروودێك بۆ زمانی رۆمانی)ی نووسیبوو. ئەو گوتارە بوو کە پێش چەند سەعاتێك نووسیبووی بێ ئەوەی بزانێ چ بەسەرهاتێکی جەرگبڕ بەسەر (بێسارابی)دا دێ...

(ماتیزی) خوێندییەوە: (هەموو شەوێ، کە سەر بە سەرین دەکەم، وەك ئەوە وایە سەر بە خاکی (بێسارابی)ی نەرم وەك ناواختنی نان دەکەمو دوعا بۆ ئەم خاکە دەکەم.) (ترایان) چیتری بۆ نەخوێندرایەوە. چاوی پڕ فرمێسك بوو. رۆژنامەی پرسەی بە دەستی راستەوە بوو، لە شەقامی (گریگۆرێسکۆی نیگارکێش)، پێی نایە ناو (بەشی ناوخۆ)ی قوتابییان. بە بیری هاتەوە، بڕیاری دابوو سەعات حەفت بەرەو (ئیزفۆر) بە رێ بکەوێ. کەوای باوکی، لە دوای نیوەڕۆوە تەواوببوو.

لە دڵی خۆیدا گوتی: (کاتی چوونەوەم نییە بۆ پشوو. ئێستا کاتی وەرگرتنی مادۆن نییە...)

## (٤)

لە شەوی داگیرکرانی (بێسارابی)دا، هەموو قەتارەکان، بە مەبەستی چۆل کردنی شاری داگیرکراو، دەستیان بەسەرداگیرا. بەریدو تەلەگراف‌و تەلەفۆن کەوتنە ژێر دەسەلاتی لەشکر. (ترایان)، ئیتر بیری لە وەرگرتنی پشوو و چوونەوە نەدەکردەوە. چاوەڕێی دەکرد تا بارو دۆخ دادەکەوێ. دە رۆژ رۆیشت‌و هیچ رووی نەدا. لە هەموو شوێنێ هەراو ئاژاوە بوو.

دوای ئەوە، (ترایان) دەنگ‌وباسی (ئیزڤۆر)ی وەرگرت. (ماری)و خوشکە گەورەی (ماتیزی)کە لە (کیشینڤ)، لە کۆلێج دەیانخوێند، بە ساغ‌و سەلامەتی گەڕابوونەوە. شەماتەی پەناهەندان لە (بوخاریست) لیپیان دەدایەوە. (بێسارابی)یەکانی دۆست‌و ئاشنای (ترایان) نزیکەی هەموویان توانیبوویان لە چنگ رووسەکان رابکەن! (ترایان)، لە رۆژنامەو لە زانکۆدا، لە چالاکی خۆی بەردەوام بوو.

(ماتیزی)، راپۆرتێکی دایە (بیسیۆلا)و گوتی:

-دوو حەفتە بوو دەتگوت لە ژێر مۆتەکەدا دەژیم. هەترەشم رژابوو، دەترسام نەوەك (ماری)و خوشکم کەوتبنە بەر دەستی رووسەکان،

باشه، رزگار بووین!. هەموو برادەرەکانم نەجاتیان بووە. توانیویانە، لەکاتی خۆیدا، لە (بێسارابی) رابکەن.

پێشخزمەتێك هاتە نووزگەی (بیسیۆلا). داهاتەوە، سەری بردە بن گوێی (ماتیزی)و پستە پستێکی لەگەڵ کرد:

-یەکێ دەیەوێ قسەت لەگەڵ بکا.

دوو سەرباز لە هۆڵی چاوەڕوانی رۆژنامەدا وەستابوون. کڵاوخوودەی ئاسنیان لەسەرو قەرەبینایان پێبوو. (ترایان) چاوی گێڕا داخۆ کێ هاتووە قسەی لەگەڵ بکا. لەو دوو سەربازە پێوە، کەس لە هۆڵی چاوەڕوانی نەبوو.

پێشخزمەتەکە دەمی قسەی کردە سەربازە چەکدارو کڵاوخوودە لەسەرەکانو گوتی:

-ئەمە جەنابی (ترایان ماتیزی)یە.

سەربازی یەکەم دەفتەرێکی رەشی لە کیفێکی چەرم دەرهێنا کە لەسەر نێزەوە بە کەمەری وەکردبوو. کاغەزێکی زەردو دەفتەری کراوەی بۆ ماتیزی راداشت.

سەربازی دووەم گوتی:

-مۆر کە کە وەرت گرتووە.

(ترايان) تەماشـای دەفتەرەكـەی كـرد. تەماشـای كاغـەزە زەردەكـەی دەستی كرد. تەماشای كلاّوخوودە ئاسنەكانی كـرد. سـەربازی یەكـەم گوتی:

-ناوت بۆ عەسكەری هاتووە. مۆر كە!

(ماتیزی)ی گوتی:

-من قوتابیمو لـە عەسكەری دواخراوم. هەموو قوتابییەك هەقی هەیە بۆ ئەوەی خوێندنەكەی تەواو بكا، تا تەمەنی بیستو حـەفت سـاڵی، لـە چوونە عەسكەری، دوا بخرێ. من دە ساڵ دواخراوم. مـن، نـابێ نـاوم هاتبێ! هەڵبەت هەڵەیەك رووی داوە.

سەربازی دووەم گوتی:

-ئەمە پەیوەندی بە ئێمەوە نییە. مۆر كە!

(ترایـان) سـەیری دەفتەرەكـەی كـرد كـە سـەربازەكە لەبـەر چـاوی راگرتبوو. بە دەستی لەرزان، مۆری كرد. كاغەزە زەردەكەی كردەوە. داوای لێكرابوو، لە ماوەی بیستو چوار سەعات، خـۆی بـە فـەوجی شكارچییانی چیای (برازۆڤ) بناسێنێ.

(ماتیزی)گوتی:

-من قوتابیم. دواخستن دەمگرێتەوە. هەموو پێویستییەكی رەسمیم بۆ ئەم دواخرانە جێ بە جێ كردووە!

بەلاّم کەس باوەگۆی نەدایەوە. دوو سەربازەکە بە کلاّخوودەی ئاسن‌و بە نێزەو بە چەك‌و بە دەفتەری رەشیان، کە (ترایـان) مـۆری کردبـوو، رۆیشتن‌و لـە چاو بزر بوون.

تەنیا هۆکلّەکە لـە هۆلی چاوەڕوانی رۆژنامـەو لـە بەرامبـەر (مـاتیزی) مایەوە، بە بەزەییەوە تەماشای دەکرد. (مـاتیزی) بـە رەنـگ بزرِکـاوی چووە نووزگەی (بیسیۆلا). کاغەزە زەردەکەی نیشـان داو بـۆی بـاس کـرد کـە دەفتـەری رەشـی سـەربازی چـەکدارەکانی مـۆر کـردووە. (بیسیۆلا) یەکسەر تەلـەفۆنی بـو بەشـی سـەربازیی رۆژنامەکـە کـردو بەسەرهاتی یەهەربڕی (ماتیزی) پێگـوت. نووسـەری بەشـی سـەربازیی تەلەفۆنی بۆ ئەنجوومەنی سەرکردایەتی سـوپا کـرد. دوای سـەعاتێك، (ماتیزی)یان ئاگادار کردەوە. نووسەری سەربازیی پێیگوت:

-هەموو دواخرانێك هەلّوەشاوەتەوە، هەموو روخسـەتێك سـڕاوەتەوە. پێنج دەستەی ئیحتیات بانگ کراون بۆ عەسکەری.

نووسەری بەشی سەربازیی بە داخەوە بوو بۆ بـارو دۆخـی (مـاتیزی)، بەلاّم نەیدەتوانی هیچی بۆ بکا.

(بیسیۆلا) گوتی:

-هەر ئەم ئێوارەیە برِۆ! بە پێی ئەو فەرمانـەی وەرتگرتـووە. خـۆت بـە فەوجەکەت بناسێنە! بۆ ئەوەی دۆخەکە ئالّۆزتر نـەبیّ! لــەو ماوەیـەدا

ئێمەیش هەوڵێك دەدەین بەڵکو وا بکەین بتگوازنەوە بۆ ئێرە، بۆ (بوخاریست). ئازا بە...

(ترایان) گوتی:

-ئازا دەبم.

بەڵام دیتی هەموو سەرکەوتنەکانی پووچ بوونەتەوە. هەموو خەونەکانی ئایندەی وەکوو کۆشکی مقەبا داتەپیون. هەموو شتێ بە زەویدا رووچۆتە خوارێ.

(بیسیۆلا) گوتی:

-خۆت بۆ رۆیشتن ئامادە کە! متمانەیشت بە ئێمە هەبێ! هەرچی بکرێ دەیکەین بۆ ئەوەی بتگێڕینەوە (بوخاریست). من هەمیشە قسەی خۆم دێنمە جێ بەڵام تۆ دەبێ، وەکوو فەرمانت پێکراوە، سبەی بەیانی خۆت بە فەوجەکەت بناسێنی.نەوەك بە ڤیرارت دادەنێن.

(ماتیزی) برووسکەیەکی بۆ باوکی لێدا. برووسکەیەکی زۆر سادە: (ناوی عەسکەریم هاتووە - فەوجەکەم لە (برازۆڤ)ە - هەر بگەمە ئەوێ، بە دوورو درێژی بۆتان دەنووسم.) (ترایان) برووسکەکەی نارد. ئینجا ئامێری چاپی هەڵگرت کە کاتی هاتنی بۆ رۆژنامەکە، بە کرێی گرتبوو. سەرپۆشی ساتانی رەشی ئامێرەکەی وەکوو جلی ماتەم پێدادا. ئامێری ماتەمینی لە بن هەنگڵی ناو چووە جادە. دایەوە خاوەنەکەی. خەونی بەوە دەدی رۆژێ بێ‌و، ئەم ئامێرە بۆ خۆی بکڕێ. بە ئومێد بوو

بتوانیّ بیکڕیّو بە ماوەی چەند مانگێك هەموو پارەکەی بدا. هەنووکە، ناچار بوو بیداتەوە. کاتیّ بە بیّ ئامێری چاپ لە دوکالەکە هاتە دەریّ. ریك وەك منداڵان لە پرمەی گریانی دا. بۆیە گریا چونکە لە ئامێرەکە دابڕابوو. وای هەست دەکرد ئەم ئامێرە پارچەیەکی نەپچڕاوە لە خۆی.

(ترایان)، بۆ ئەوەی وا نەکا رێداران ببینن دەگری، پشتی کردە جادەو لە جامخانەی دوکانەکە، خۆی بە تەماشاکردنی پێویستییەکانی نووزگە خافڵاند. فرۆشیارەکە، پەردەی جامخانەکەی لاداو ئامێرەکەی لیّ دانا. (ترایان) زۆری بەو ئامێرە نووسیبوو. چەندەها جار سەری بە تەختەی دوگمەکانی کردبوو. ئێستا تەماشای ئامێرەکەی کرد کە بۆ نمایش داندرابوو. بە کولو کۆڤانو کەسەر تەماشای کرد. جارێکی تر پەردەی جامخانەکە لاکەوت. فرۆشیارەکە، بە دەستی بە گوستێری زێڕی، پارچە کاغەزێکی لەسەر دوگمە رەشەکانی ئامێری چاپی ناو جامخانەکە چەسپاند، بە پیتی گەورە لەسەری نووسرابوو: (بۆ کریّ!). (ماتیزی) چیتر بەرگەی نەگرت سەیری جامخانەکە بکا. بەرەو (بەشی ناوخۆ) کەوتە ریّ.

بە بەڕێوەبەری گوت:

-تکا دەکەم لوتف بفەرموون کلیلەکەم لیّ وەرگرنەوە. ئیتر پێویستم پیّ نییە. ئەم شەو دەچمە عەسکەری! ئیتر ژوورەکەم چۆل دەبیّ.

فرمێسکی لە چاو قەتیس ما.

بەڕێوەبەری (بەشی ناوخۆ) گوتی:

-(ترایان)، ئازا بە!

دەستی لە شانی داو بۆ یەکەم جار، بە ناوی خۆی بانگی کرد.

(ترایان) گوتی:

-جانتاکەم لە (بەشی ناوخۆ) جێ دێڵم. تەنیا یەك جانتام هەیە.

(ماتیزی) هەموو کەلو پەلەکانی خۆی لە ناو جانتاکە نا. تەنیا ئەو جوببەیە نەبێ کە دەیەویست ڕۆژانی جەژنی (نۆیێل) بۆ باوکی ببا. ئێستا (نۆیێل) دوور کەوتۆتەوە. (ترایان) نەیدەزانی کەنگی دەتوانێ بچێتەوە (ئیزڤۆر). کەواکەی کردە بەستەیەك، تا بە بەرید ڕەوانەی بکا.

ئەو ئێوارەیە، بێ ئەوەی خاتر لە کەس بخوازێ، سواری قەتاری (برازۆڤ) بوو. (برازۆڤ) شارێکە کەوتۆتە ناو جەرگەی چیاکان. سێ سەد کیلۆمەتر لە (بوخاریست) دوورە. (ترایان)، هێمانێ سواری قەتار بوو، کاغەزە زەردەکەی فەرمانی چوونە عەسکەری لە گیرفانی دەرهێنا. ئەو کاغەزەی کە لە هەموو رابردووی دابڕاند. (ترایان ماتیزی) لەو ساوە کە ئەو کاغەزە زەردەی وەرگرتبوو، هەستی دەکرد کە ئیتر کەسیتی خۆی، هی خۆی نییە. ئێستا، کەسێتی، هی خەڵکی

## (٥)

قـەتاری (بـرازۆڤ)، دەوری نیوەشـەو، بـە ڕێ کـەوت. (ترایـان)، لـە ڤاگۆنەکەی خۆیدا، تەنیا بوو. نەیدەتوانی، نـە بخوێنێتـەوەو نـە بخـەوێ! لەوە تۆقابوو کە یەك ساڵی ڕەبەق، لـە سـەربازخانەیەك بەنـد دەبـێ. هەوڵی دا زات بداتە بەر خۆی.

لە دڵی خۆیدا گوتی: (بیر لەو قسـانە بکـەوە کـە لـە قوتابخانـە فێـر بووی: خزمەتی سەربازی شانازییە! خزمەت کردنـە بـە نیشـتمان، بـە ئاڵا، بە تاج و تەخت!)

بەڵام ئەم قسانەی بە لاوە شتی پڕو پووچ بوو. خزمـەتی سـەربازی کـە کت و پڕ، بێ ڕەحمانە، لە ژیان و لـە کارەکـانی دابڕانـد، لـە ڕاسـتیدا، ساڵێکی زندان بوو و هیچی تر.

قسەیەکی دیکەی بیر کەوتەوە لە قوتابخانە فێر ببوو. لـە دڵـی خۆیـدا گوتی: (تەنیا مرۆی نەوێرۆك و قزچاڵە هەوڵ دەدا لە خزمەتی سەربازی

دوا بخرێ!) ئەگەرچی ئەم قسانەی تەواو لە بیر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا، پێی وابوو ئەگەر بتوانێ لە عەسکەری خۆی دوا بخاو وەکوو جاران لە رۆژنامەو زانکۆدا بمێنێ، کارێکی قارەمانانەی کردووە. بەڵام نەیدەتوانی. بە درێژایی شەو بە دەست ئەم بیرانەوە دەتلایەوە. ناو بە ناو، لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

-(بیسیۆلا) یارمەتیم دەدا بگەڕێمەوە (بوخاریست). ئەوسا، دەتوانم هەم خزمەتەکەم بکەمو هەم وانەکانم لە کۆلێج بخوێنمو هەمیش کاری رۆژنامەگەریم بکەم. (بیسیۆلا) هەمیشە قسەی خۆی دێنێتە جێ! قەولی پێداوم بمگوازێتەوە (بوخاریست).

سەعات پێنجی بەیانی، قەتار گەیشتە (برازۆڤ). دونیا تاریك بوو. (ترایان) لە قەتار دابەزی.

(برازۆڤ) شارێکە خانووەکانی بە شێوازی (گۆتی) کراون، لە ناو جەرگەی چیاکانی کۆرپات دروست کراوە. جێگایەکی وەرزینی زستانە.

تەکسییەکی گرتو چووە بەندەرو لە پەڕگەی شار، لە تاخی کارخانەو سەربازخانەکان، لە سەربازخانەی شکارچییان، دابەزی. لە تاریکی دابەزی. کاغەزی بانگ کرانە عەسکەری دایە دەرگەوانەکە. پاڵیان پێوە نا بۆ ناو هۆڵێکی بێ ئاگر، دیوارەکانی رووت بوون. دەیان گەنج لە هۆڵەکە بوون، لادێیی بوون. یەك کەسی شارستانی تێدا نەبوو.

هەموو چاویان تێبڕی. (ترایان) تاقە شارستانێك بوو بۆ عەسکەری بانگ کرابوو.

دوای سەعاتێك، گەنجەکانیان کردە دوو ریز. سەعاتێکی تر، بەم جۆرە، بە ریز مانەوە. هەنگی ناویان وەرگرتن.. یەکەم هەنگاو، بڕینی قژ بوو. هەموو ئەوانەی تازەهاتوون دەبێ، وەك زیندانی، قژیان بە (نمرە سفر) بتاشن. جلی سەبازییان بەسەردا دابەشکردن. هەموو جلەکان بۆ (ترایان) زۆر بچووك بوون. بە ئەنقەسیش بچووکترین جلیان بۆ هەڵبژارد. هەموو جاریش بە ئەنقەس دراوترین جلیان بۆ هەڵدەبژارد. جووتە چەکمەیەکی نیوداشتی پافاڕیان دایە. کراسی دژوونیان دایە. (ترایان) هیچی نەگوت. دەستی درێژ کردو بە بێ دەنگیی هەرچی سەرتیپەکە بۆی تێهەڵدا، وەریگرت. ئینجا سەرتیپ داوای جگەرەیەکی لێکرد. کە (ترایان) پاکەتی جگەرەی بۆ راگرت بۆ ئەوەی خۆی جگەرەیەك هەڵبگرێ، سەرتیپ پاکەتەکەی لە دەست راپسکاندو لە گیرفانی خۆی نا. (ترایان) هیچ نارەزایی دەرنەبڕی. سەرتیپ هاواری کرد:

-وەرە قژت بتاشە!

بە توندی بازووی (ترایان)ی گرتو رایکێشا بۆ بەردەم بەربەر. منداڵەکانی دی پێکەنین. هەموو پێکەنین. هەموو بە چاوێکی ناحەزانە سەیریان دەکرد. دەیانەویست سووکایەتی پێبکەن. (ترایان) زانی بۆیە سووکایەتی پێدەکەن چونکە جلی شارستانی لەبەرە. زانی دایە بەر

خۆیو لە دڵی خۆیدا گوتی: (بەرگەی هەموو شتێ بگرە! (ترایان)، بەرگەی هەموو شتێ بگرە! (بیسیۆلا) دەتگوازیتەوە یەکێ لە فەوجەکانی (بوخاریست). ئازایانە بەرگەی هەموو شتێ بگرە! وا پێشان بدە گوێت لەو سووکایەتییانە نەبووە!!.)

(ترایان)، پێنج کەسی لە پێش بوو لای بەربەر. (ترایان) بە زارەترەکی بیری کردەوە ئەگەر وەکوو زیندانییان بە سەرتاشاوی بچێتەوە (دەستەی نووسین) هەست بە چ شەرمەزارییەك دەکا!؟ بەڵام بڕیاری دا بە گیانێکی قارەمانانەو بە گەڕناسیی بەرگەی هەموو شتێ بگرێ.

سەربازێك هات، سەبەتێکی لە شواڕی جەیزەرانی پێبوو. هەر سەربازێکی تازەو کۆچەڵەیەکی دایە. ئاشپەزێك هەر سەربازێکی تازەو کەوچکە چایەکی بۆ لە کۆچەڵەکەی کرد.

(ماتیزی) جلی سەربازیو نیمچە چەکمەکانو کراسەکانی بەسەر قۆڵی راستەی دادابوو و کۆچەڵەکەیشی بە دەستی راستەوە گرتبوو. چایان بۆ تێکرد. ویستی بیخواتەوە. کۆچەڵەکەی بۆ دەمی برد. چاکە زۆر گەرم بوو. تامێکی ئەوەندە ناخۆشی هەبوو، دەتگوت چڵکاوی هیربار شووشتنە. (ماتیزی) ویستی ئەو ئاوە گەرمو بۆنپیسە تف بکاتەوە. بەڵام نەوێرا. نەشیوێرا قووتی بدا. هێڵنجی هاتێ. ئاوە بۆنپیسەکەی لە دەمییەوە راگرت.

سەرتیپ هاواری کرد:

کە چا دەخۆیتەوە، عەینەکت لە چاو بکەوە.

(ماتیزی) سەری بۆ لای سەرتیپ هەڵبڕیو بێ دەستی خۆی، چای گەرمی ناو دەمی قووت دا.

سەرتیپ بە دەنگی ژەهراوی پرسی:

—بۆ چاخواردنەوەیش، عەینەکت پێدەوی؟

هەموو گەنجەکانی ئەو هۆلە وراقە لە قاقای پێکەنینیان دا! سەرتیپ زاتی پەیدا کرد، عەینەکی کلك سەدەفی لە چاوی راپسکاند. (ترایان)، ئیدی هیچی نەدەدی. تەم بەری چاوی گرتبوو. سەرتیپ چاویکەکەی تێهەڵدا. چاویلکەکە کەوتە ناو کۆچەڵەی چای.

کابرایەك لە قاقای پێکەنینی دا.

(ماتیزی) ویستی کۆچەڵەی چا لەبەر پێی خۆی، لەسەر زەوی دابنێ بۆ ئەوەی بەرچاڤکەکەی هەڵگرێتەوەو لە گیرفانی بنێ. کە داهاتەوە، سەرتیپ هاواری کرد:

—ئامادە!

(ماتیزی)، نیمچە چەکمەو جلە سەربازییەکانی لەسەر بازووی چەپەو کۆچەڵەی چای بە عەینەکی ناویەوە، لە دەستی راستە ، ئامادە وەستا.

ئەفسەرێك هاتە ژوورەوە. بوو بە دونیایەکی کش‌و مات. کەس جوولەی نەکرد. هەموو جوولەیان لە خۆیان بڕی. تەنیا دەنگی پێی

ئەفسەرەکە دەهات کە هاتبووە ژوورەوە. (ماتیزی) چاوی کز بوو. بە بێ چاویلکە، تارمایی ئەفسەرەکەی، وەکوو تارمایی ناو دووکەڵ بینی. ترسا. سێ سەعات بوو لە سەربازخانە بوو. لەو ماوەیەدا چاوترسێن ببوو.. ترس هەمووگیانی داگرتبوو. تا مۆخی ئێسقانی رۆچووبوو..

(ماتیزی)، لە دڵی خۆیدا گوتی: (ئەگەر (بیسیۆلا) تا چەند رۆژی تر نەمگوازێتەوە، هەرگیز ناتوانم بەرگەی ئەم دۆخە بگرم. تەنانەت چەند رۆژیش زۆرە! زۆرە چەند رۆژێك بەرگە بگری! چ جای چەند رۆژانێکی زۆریش!!

دەنگێك هات، پرسی:

–ئایا(ترایان ماتیزی) هاتووە؟

ئەفسەرەکە بوو ئەم پرسیارەی کرد. دەنگی توند بوو، هێزی دەسەڵاتی تێدا بوو.

(ترایان) خۆی بۆ سووکایەتییەکی دیکە ئامادە کرد. حەزی دەکرد تا دەکرێ خۆی بشارێتەوە. ئاخر هەر لە سەرەتای هاتنییەوە بۆ سەربازخانە، هەموو چاویان لەسەر ئەو بوو. چاویان لەو بڕیبوو. لەو و هیچی تر! چاوی گاڵتەجاریو قەشمەریو دوژمنداریی. ئێستا، ئەم ئەفسەرەیش کە تازە هاتووە، بانگی دەکا!. (ماتیزی) دەمو چاوی ئەفسەری باش نەدی! بەلام دیتی نزیك دەکەوێتەوە. چەند هەنگاوێك مابوو بیگاتێ. (ترایان) ویستی بڵێ: ئەوەتا لێرەم!، بەلام دەنگی

دەرنەهات. هەستی کرد گەرووی گیراوە. هەستی کـرد کەوتۆتـە نـاو تاقمە دوژمنێك دەیانەوێ، تا خۆی دەکوژێ، سووکایەتی پێ بکەن.

ئەفسەرەکە پرسی:

سەرتیپ، مەسەلە چییە؟

ئێستا، ئەفسەرەکە بەرامبەر (ماتیزی) بوو. یەك هەنگاو لێیەوە دووربوو. ئەفسەرەکە دەستکێشەکەی لە دەست کردەوە. چاویلکەی (ترایان)ی لە ناو کۆچەڵەی چا دەرهێنا. دەسەسرێکی سپی لە گیرفانی دەرهێناو بەرچاڤکەکەی خاوێن کردەوە.

ئەفسەر فەرمانی دا:

—سەرتیپ، ئەو شمەکانە لە (ماتیزی) وەرگرەوە.

(ترایان)، شمەکە دکنیو دڕاوەکانی دایەوە سەرتیپ: کراسو گۆرەویو چەکمەی نیوداشتو بەتانی. ئینجا عەینەکەکەی لە دەست ئەفسەرەکە وەرگرتەوەو لە چاوی کرد.

ئەفسەرەکە گوتی:

—من ئەفسەری پلە یەك (ئۆرێل مارین)م.

دەستی بۆ لای ((ماتیزی) درێژ کرد. (ترایان) بە دمق ماوی تەماشای ئەفسەرەکەی کرد کە بە دەسەسڕی خۆی چاویلکەکەی بۆ پاك

کردەوەو ئێستا، دەستی دەگوشێ. ئەفسەرەکە بزەیەکی دۆستانەی بۆ کرد. دەمی قسەی کردە سەرتیپ:

-جەنابی (ترایان ماتیزی) یەکێکە لە هاوکارو برادەرانی من.

ئەفسەرەکە تەماشای جووتە چەکمە نیوداشتو پافارەکەی کرد، سەیری جلی دڕوونو کراسی دکنیو بەتانییە کونکونەکەی کرد کە سەرتیپ دابوویە (ترایان)و ئەویش بەسەر بازووی خۆی دادابوو.

ئەفسەرەکە فەرمانی دا:

-سەرتیپ، کەلو پەلی نوێ بۆ (ماتیزی) بێنە نووزگە.

هۆل وەك گۆڕ کشو مات بوو. سەرتیپ، رەنگی زەرد هەڵگەڕا.

ئەفسەرەکە گوتی:

جەنابی (ماتیزی)، تۆ لەگەڵ من وەرە!

دۆستانە بازووی (ترایان)ی گرتو پێکەوە چوونە حەوشەی سەربازخانە.

ئەفسەرەکە گوتی:

-سوپاست دەکەم بۆ ئەو شتانەی لەسەر کتێبەکانی منت نووسیبوو. دەمەویست نامەیەکت بۆ بنووسمو سوپاست بکەم، بەڵام من مرۆیەکی رووناسکم. ئەمڕۆ بەیانی، کە تەماشای لستی ناوی سەربازە نوێکانم کردو ناوی ئێوەم بینی، زۆرم هەوەس پێ هات! شادم کە روو بەروو

دەتبینم. شادم کە هاتوویتە (برازۆڤ)، بەڵام بە داخـەوەم کـە نـەتتوانیوە تەرتیبێك بۆ خۆت بکـەیتو رەوانـەی ئێـرە کـراوی. پـێم بڵـێ بـزانم سەرتیپ چی لەگەڵ کردی؟ خۆ سووکایەتی پێ نەکردی؟

(ترایان) گوتی:

-نا. هیچی لێ نەکردووم...

ئەو ئەفسەرەی بازووی (ترایان)ی گرتبوو، (ئۆرێل مارین)ی شاعیر بوو. خاوەنی ئەو شیعرانە بوو کـە (ترایـان) زۆری را لـێ بـوون. (مـاتیزی) تۆژینەوەیەکی ستایشو خۆشەویستانەی لە بارەی کتێـبو شـیعرەکانی (ئۆرێل ) نووسیبوو.

(ترایان) گوتی:

-من نەمدەزانی تۆ ئەفسەری.

ئیتر لـە بیری نەمابوو لـە سەربازخانەیە. شادو گوشاد بـوو بـە دیـداریی ئەو شاعیرەی کە بە لایەوە شاعیری چاك بـوو. خـۆی یـەکێ بـوو لـە ستایشـکەرانی (ئۆرێـل مـارین) . (ئۆرێـل مـارین)یش یـەکێ بـوو لـە هەوادارانی ئەم.

ئـەم دووانـە دەسـتیان بـە پیاسـە کـرد. چـەند جارێـك بـە دەوری سەربازخانەدا سووڕانەوە.

(مارین) گوتی:

–چارە نییە، دەبێ خۆت لێرە بگوازیتەوە. تۆ لێرە هەڵناکەی. هیچ رۆشنبیرێك ناتوانێ بەرگەی ئێرە بگری. هەر رۆشنبیرێك بێتە ئێرە، دەبێ یان فیرار بکا، یان خۆی بکوژێ. لەبەر ئەوە نا کە هاورێو سەردەستەکانت تووشی دەردەسەریت دەکەن، من دەتوانم بەرامبەر بەمانە بەرگریت لێ بکەم. بەڵام تۆ ناتوانی بەرگەی ئەزیەتو ئازاری رەییس و موقەددەمو ئەفسەرە گەورەکانی تر بگری.

(ترایان) پرسی:

–باشە، ئەمانە چییان لە من دەوێ؟ ئەم دوژمندارییە لە پای چی؟

(ئۆرێل مارین)گوتی:

–سەربازان ناتوانن بەرگەی رۆشنبیران بگرن. گەورەترین خۆشیی لای سەرباز ئەوەیە سووکایەتی بە رۆشنبیرو شاعیران بکا. شتەکە تەنیا لای ئێمە وا نییە. لە هەموو دونیادا وایە. بیر بکەوە چییان بەسەر (راینەر ماریا ریلکە) هێنا. تۆ دەبێ هەوڵی گواستنەوەی خۆت بدەی. چار نییە! ئەگەر بکرێ، لەمڕۆوە دەست پێ بکە! بچۆرەوە (بوخاریست)و شتێکی وا بکە جارێکی تر نەیەیتەوە ئێرە. ئێمە رێو رەسمەکە پێك دێنین! هەر ئەمڕۆ بڕۆرەوە!

(ئۆرێل مارین) بۆی روون کردەوە (رێو رەسم)ەکە چییە؟

بەکەمجار دەبێ داوای بەڵگەیەکی دختۆر بکا تا قژی سفر نەکەن. دختۆرەکە برادەری (ئۆرێل مارین) بوو. بە بێ کێشە بەڵگەی دەدا.

ئەفسەرەکە گوتی:

-موقەددەمیش یەکێکە لە هەوادارە گەورەکانی تۆ. کتێبەکانی تۆی هەیە. ئەگەر کتێبێکی پێشکێش بکەی، زۆری کەیف پێدێ.

دووەم، پێویستە ژوورێك لە دەرەوەی سەربازخانە بە کرێ بگری. ئەوسا رادەگەیەنین تۆ مەسرەفت لەسەر سەربازخانە نییە. ئەوەی مەسرەفی لەسەر سەربازخانە بێ، ناتوانێ سەربازخانە جێ بێڵێ. دوای ئەوە، مۆڵەتێکی سێ رۆژیت دەدەینێ. هەر ئەمشەو، بڕۆوە (بوخاریست)و داوای گوازرانەوە بکە. لە (بوخاریست) بە قەد پێویست ناسیاوت هەیە، بە ئاسانی دەگوازرێیتەوە.

(ترایان ماتیزی) بیری کردەوە هەموو پەیوەندییەکانی لە (بوخاریست)، لە کەلانتەری‌و فەرمانبەرانی پۆلیسی دادوەریی‌و جەندرمەو فەرمانبەرانی ئاگرکوژێن‌و کرێکارانی بەشی نکاوی نەخۆشخانەو سەردخانە، تێناپەڕێ. ئەم پەیوەندییانەی هیچ بە کەڵك نایە! دەمێنێتەوە (بیسیۆلا)ی سەرنووسەری رۆژنامەکە، ئەگەر ئەو بتوانێ یارمەتی بدا.

(ترایان ماتیزی)، ئەو شەوە لە (برازۆڤ) رۆیشت. رووی کردە (بوخاریست). پسوولەی مادۆنیی سێ رۆژەی لە گیرفاندا بوو. دڵنیا بوو، دڵنیا، بە ماوەی سێ رۆژ فەرمانی گواستنەوەی وەردەگری. ئەوەندە لە سەرکەوتنی خۆی دڵنیا بوو، بەوی با، خەبەری سەرکەوتنی خۆی بۆ دایبابی بنێرێ لە (ئیزڤۆر). حەزی دەکرد بۆیان بنووسێ توانیویەتی خۆی بگوازێتەوە بۆ (بوخاریست).

لە دڵی خۆیدا گوتی: (سۆزی، دوای ئەوەی کە فەرمانی کۆتایی گوازرانەوەم وەرگرت، بۆیان دەنووسم. کەس و کارەکانم بزانن من سەرکەوتوو بوویم خۆم بگوازمەوە (بوخاریست)، زۆر شادو بەختەوەر دەبن. بە راستی، زۆر شادو بەختەوەر دەبن.

## (٦)

ئامێری چاپی دەستی، دووبارە لە ژووری دەستەی نووسینی رۆژنامـەی (رۆمانی)، لەسەر مێزی (ترایـان مـاتیزی) دەرکـەوت. هـەمان ئـامێری چاپ بووکـە پـێش سـێ مـانگ، (ترایـان)، لـە نـاو کیفـی رەش، بـۆ دوکاندارەکەی بردەوە. ئێستا، دووبارە ئامێرەکـەی لەسـەر مێـز بـوو. ئەویش خۆی دووبارە لە سەر کورسییەکەی، لەبـەردەم ئـامێری چـاپ بوو. (ماتیزی) جلی سەربازی شکارچییانی لەبەر بوو. پێڵاوی گەورەی بەفرەخلیسکێو چەلینی ئەسـتووری لــە پـێ بـوو، کـەوتبووەوە سـەر پێڵاوەکانی. پـالتۆی سـەربازیو کڵاوخـوودەی فـەروەی رازاوەی بـە پاشێر بە جلاوێزەوە کرابوون. سەعات یازدەی شەو بوو. (ماتیزی) لـە دەسـتەی نووسـین، تـەنیا بـوو. نووزگـەکان چـۆڵ بـوون. هـەموو رۆیشتبوون. تەنیا پێشخزمەت مابوو کاغەزەکانی ناو سـەبەتەکانی خـڕ دەکردەوە. (ترایان) تەماشای سەعاتی کرد. گوتی:

-قاوەیەکی ترم بدەرێ!

ئەو شەوە، ئەمە چوارەمین قاوەی بوو. بە پەلە دەستی بە نووسین کـرد. ئێستا، خەریکی رووداوە جۆراوجۆرەکان نەبوو. بـەڵام دەبـوو رۆژانـە

راپۆرتێکی سەرنجکێش لە بارەی ڕووداوەکانەوە بنووسێ. کاتی خۆی بە کەماڵی ئیسراحەت دەینووسی، ئێستا، سێ هەندە کاتەی بۆ نووسینی ڕاپۆرتەکەی دەوێ.

(ترایان) لە دڵی خۆیدا گوتی: (ئەمە شەکەتییە! بەڵام دۆخەکە دەگۆڕێ. ئاری، دەگۆڕێ. ناخۆشەکە تێپەڕیوە!

لە نووسین بەردەوام بوو. کە تەواوی کرد، نووسینەکەی لەسەر مێزی (بیسیۆلا) دانا. سەرنووسەر سەری بۆ هەڵبڕی. (ماتیزی) گوتی:

-لە بیر مەکە سبەی تەلەفۆن بۆ سەرکردایەتی بکە!

(بیسیۆلا) گوتی:

-سبەی بەیانی، فەرمانی گواستنەوەت دەگاتە سەربازخانە. ئەم جارە، قسەی لەسەر نییە، وەری دەگری. بەڵێنی تەواویان پێداوم. سەفەرت بەخێر!! دەبینی ئەم جارە، دواجارە.

(ماتیزی) سێ مانگ بوو سەرباز بوو. هەموو شەوێ کە نووسینەکەی دەدایە سەرنووسەر، هەمان تکای لێ دەکرد: (لە بیر مەکە تەلەفۆن بۆ سەرکردایەتی بکە!). هەموو شەویش (بیسیۆلا) وەکوو ئێستا وەڵامی دەدایەوە: (بەیانی، فەرمانی گواستنەوەت لە سەربازخانەیە. دەبینی ئەم جارە گومانی تێدا نییە. دڵنیام ئەمە دوا سەفەرە دەیکەی!)

(ترایان) هەرگیز فەرمانەکەی وەرنەگرت، بەڵام ئەم شەوەیش وەك هەموو شەوێ، بە دڵی پڕ ئومێد (دەستەی نووسین)ی جێ هێشت. بە

پەلە جلەکانی کردە بەر، کەمەربەندی، کە خەریتەیەکی بەتاڵ بوو، لـە پشت بەستو کڵاوە فەروەکەی لەسەر نا. کاتێ کیفی رەشی بەسەر ئامێری چاپ دادا، سەعاتی زەنگدار بە دەنگێکی بەرز لێیـدا. (ترایـان) پێکەنیو سـەعاتەکەی لـە گیرفـانی پاڵتۆکـەی دەرهێنـاو زەنگەکـەی راگرت. ئینجا لەسەر سەعاتی دیواری (دەستەی نووسین)، میقاتی کرد. سەعاتەکەی قورمیش کـرد. میلـی زەنگەکـەی خسـتە سـەر سـەعات پێنجی بەیانیو سەعاتەکەی لە گیرفانی نایەوە. بە هەشتاوی خـۆی بـە شەقامدا کرد. سەعات یازدەو نیوی شەو بوو. ترامـوای ژمـارە شـەش، کە پێی دەچووە ئێستگای رێگای ئاسن، چەند سـەد مـەترێك لـەولاوە دەوەستا. پاڵتۆی بە سینگییەوە قرِسـاندو لـە جـادە پەرِیـەوە ئەوبـەر، سواری ترامـوای بوو. (ماتیزی) چاوەکانی خستە سەر یەكو بـەم جـۆرە مایەوە بەڵام کۆشا خەو نەیباتەوە. هەموو شەو وای دەکرد. ماوەی سێ مانگ، بەردەوام، سەعات یازدەو نیوی شـەو سـواری ترامـوای ژمـارە شەش دەبـوو و چـاوی دەنووقانـد. مـاوەی دە خولـەك، بـێ ئـەوەی بخەوێ، چاوەکانی لەسەر یـەك دادەنـا. ئەوسـا لـە ئێسـتگای بـاکوور دادەبەزی. بەو پلیکانەیەدا هەڵدەکشا کە دەچووە سەر سەکۆی قەتار. قەتار سەعات دوازدەی شەو دەردەکەوت. ئەمە ئـەو قـەتارە بـوو کـە پێش سێ مانگ،کاتێ (ترایان) فەرمانی چوونە (برازۆڤ)ی وەرگرت، بـۆ یەکەم جار لە (بوخاریست)ەوە پێی چووە (برازۆڤ). فەرمانی چوونی لە گیرفان بوو. لەوکاتەوە، سێ مانگی تەواو بـوو بـەردەوام، شـەو دوای شەو، سەفەری دەکرد. هەموو شەو، لەو قەتارە دەخەوت.

ئێستا، لە ڤارگۆنەکەی تەنیا بوو. لەسەر لاتەختەکە راکشا. سەعاتەکەی تاقی کردەوە. لە ناو گیرفانی پاڵتۆکەی ناو پاڵتۆی بە جلاوێزی سەر سەرییەوە کرد. جارێکیان خەوێکی قووڵی لێکەوت‌و لە ئێستگەی قەتاری (برازۆڤ) بە خەبەر نەهات. جارێکی تر لە شەکەتییان هیلاك ببوو، سەری خستبووە سەر ئامێری چاپ‌و خەوی لێکەوتبوو، وەخت بوو قەتاری (برازۆڤ)ی لە دەست بچێ. (ماتیزی)، کە زاڵی خەو لەم بەهێزترە، سەعاتێکی زەنگداری کڕی، زەنگێکی زۆر بەهێزی هەبوو. هەمیشە سەعاتەکەی پێبوو. لە (دەستەی نووسین)، لەسەر سەعات یازدەو نیوو لە ناو قەتار، لەسەر سەعات پێنجی بەیانی دادەنایەوە. بەم جۆرە بەسەر خەودا زاڵ بوو.

(ترایان) روومەتی خستە سەر بازووی راستەو خەوی لێکەوت. سەعات پێنجی بەیانی، کە سەعاتی ناو گیرفانی پاڵتۆی سەر سەری لێیدا، بە خەبەر هات. جلی کردە بەرو بە پەلەپرووزێ دابەزی. لە (برازۆڤ)، دونیا تاریك بوو.

رۆژنامەی (رۆمانی) کڕی‌و سواری نێرینێکی پڕ کرێکار بوو، دەچووە تاخی کارخانەو سەربازخانەکان. دەیتوانی بە چاو بەسراوی ئەو هاماجە تەی بکا. (ترایان) سێ مانگ بوو ئەم رێگایەی دەکوتایەوە: سەعات یازدەو نیوی شەو، لە (دەستەی نووسین) بە رێ دەکەوت، ئینجا تراموای ژمارە شەش، دە خولەك سەفەر بە چاوی نوقاو، ئێستگەی باکوور، بە رێ کەوتنی قەتاری نیوەشەو، پێنج سەعات خەو، بە تاریکی

دابەزین لە (برازۆڤ)، کڕینی ڕۆژنامەی چاپی هەرێم کە بە ڕۆژ چاپ دەکراو سەعات سێی بەیانی دەگەیشتە (برازۆڤ)، نێرینی پڕ کرێکار، دابەزین لە سەربازخانە، ناوخوێنرانەوە، ڕێنمایی، ڕۆیشتن، ڕاهێنان لەسەر شەڕ، تەکتیکی جەنگ بە پێلاوی بەفرەخلیسکێ لە تەپۆلچکەکانی دەوروبەری (برازۆڤ)، ڕێپێوان. نیوەڕۆ، فراوین خواردن لە چێشتخانەیەکی کرێکاران لە نزیك سەربازخانە، جارێکی تر ڕێنمایی، سەلام وەرگرتن، ڕۆیشتن، ڕاهێنان لەسەر شەڕ، لێك کردنەوەی مەترەلۆز، سەعات پێنجی دوای نیوەڕۆ، بە کەشەنگی سواری قەتاری (بوخاریست) دەبوو. شەو، لە (دەستەی نووسین)، بوو. ڕاپۆرتێکی سەرنجکێشی دەنووسی، چی داوایان لێ بکردایە، دەینووسی. سەعات یازدەو نیوی شەو، دووبارە بەرەو تراموای ژمارە شەش هەیپەی لێدەکرد. بەو ئومێدەی کە ڕۆژی پاشی فەرمانی گوازرانەوەی لە (برازۆڤ) وەربگرێ. هێمانی سواری تراموای ژمارە شەش دەبوو، هەموو شتێ ڕێك وەکوو ڕۆژی پێشوو ڕادەبرد: ئێستگەی قەتار، زەنگی سەعات، دابەزین لە (برازۆڤ). ئەمە سێ مانگ بەردەوام بوو. (ماتیزی)، هەموو شەوێ، کە سواری قەتار دەبوو، وایدەزانی ئەمە دوا سەفەریەتی. ئێستایش، کە لە پشت مینای نێرینەکەوە، تەماشای جادەی چۆڵو تاریکی دەکرد، هەر بە ئومێد بوو ئەمە دوا سەفەری بێ بەم نێرینە کە بۆ ئەو لایەی (برازۆڤ)، بۆ تاخی سەربازخالەو کارخانەکانی دەبا.

نێرینەکـە لـە سـەربازخانەی شکارچـییانی چـیایی نزیـك کەوتـەوە. (مـاتیزی)، رۆررژنامەکـەی دەق کـرد. ویـستبووی لـە نـاو نێرینەکـە بیخوێنێتەوە، بەڵام رای لە راپۆرتەکەی خۆی نەبوو... رای لە شێوازی نووسینەکەی خۆی نەبوو. بەم دواییە، بە شێوازێکی بێ تۆقی دەنووسی. شێوازی وەکوو جاران نە چڕ بوو، نە گەرم. مرۆ وەك تامی ئاو لە نـاو شەرابدا، ماندوبوونی تێـدا دەدی. (ترایـان)، هەسـتی دەکـرد شـێوازی نووسینی، شەکەتیی تێدایە. هەروەکوو هەستی بە کەشەنگیی بـازوو و زرانییەکانو سەراپای لەشی دەکرد. لـە رسـتانەکانییەوە، هەسـتی بـە داوەشانی لەشی دەکرد.

کاتێ خەریك بوو رۆژنامەکەی دەق دەکرد، لـە دوا لاپـەڕەدا، چـاوی بە وێنەی خۆی کەوت. وای زانی خەون دەبینێ. لەگەڵ ئەوەشـدا، بـە راسـتی وێنـەی خـۆی بـوو. کـە رۆژنامەکـەی کـردەوە، بـە پەلـە ناونیشانەکەی خوێندەوە. ناونیشانەکە دوو ستوونی گرتبـوو: ((ترایـان ماتیزی))ی نووسەرمان خەڵاتی شاهانەی شیعری، بـە کتێبـی (شـیعری نووسراوی سەر بەفر ) وەرگرتووە.) هەنـدێ باسـی ژیـانو رانـانی بـە دوادا هاتبوو. خەبەری خەڵاتەکەی لە هەموو رۆژنامەکانی هەرێم بـڵاو کرابـووەوە. سـکرتێری نووسـین دەسـتی بـە (ترایـان) نەگەیشـتبوو خەبەرەکەی بداتێ. ئەم خەبەرە بۆ (ماتیزی) وەکـوو ئـەوە وا بـوو لـە ئاسمان بەربێتەوە. رۆژنامەی کـراوەی بـە دەسـتەوە بـوو، لـە نێـرین دابەزی. جارێکی تر لە بـەر روونـاکی چـرای بەرامبـەر سـەربازخانە،

خوێندییەوە، پاشان بۆ جاری سێیەم خوێندییەوە. تەماشای وێنە چاپکراوەکەی کرد. ئەمە شادمانترین ساتی ژیانی (ماتیزی) بوو. خەڵاتی شاهانەی شیعر خەڵاتێکی گەورە بوو.

(ترایان) رۆژنامەکەی پێشانی پاسەوانی بەر دەرگای سەربازخانە داو لێی پرسی:

-ئەم پیاوە دەناسی؟

سەربازەکە تەماشای چاوەکانی (ماتیزی) کرد. چاوی دایە وێنەکە.

پاسەوانەکە گوتی:

-ئەمە تۆی. (لە سەیری وێنەکە بەردەوام بوو)، لەگەڵ ئەوەی هەموو رۆژێ دەتبینم، خەریك بوو نەتناسمەوە.

(ترایان) گوتی:

-گرنگترین خەڵاتی شیعری وڵاتم وەرگرتووە. خەڵاتی شاهانەم لە ئەدەبیات وەرگرتووە. ئەو خەڵاتەی من وەرمگرتووە، هەزاران پاڵێوراوی هەیە!

سەربازەکە سەیری نووسینەکەی کرد. تەماشای وێنەکەی کرد. ئینجا دووبارە تەماشای (ماتیزی) کرد.

سەربازەکە به پێهەڵدانەوە گوتی:

-ئەم جلی مەدەنییەت باش لێدێ!! ئەوەندەت لێدێ وەخت بوو نەتناسمەوە.. ئافەرین! بە جلی مەدەنی بۆ خۆت پیاوێکی زەریفی!

(ترایان) بە خەفەتباری چووە حەوشەی سەربازخانە. سەربازی پاسەوان، خەلاتەکەی بەلاوە گرنگ نەبوو! ئەو، پیرۆزبایی جلە مەدەنییەی لێکرد کە لە وێنەکەدا لەبەری بوو.

(ماتیزی) چەمەڕای ئەفسەر (ئۆرێل مارین)ی کرد بۆ ئەوەی لە مەسەلەکە ئاگاداری بکاتەوە. چونکە دەبوو بە یەکێکی بڵێ. ئەفسەرەکە، سەر لە بەیانی، خەبەرەکەی لە رادیۆ بیستبوو. پیرۆزبایی لە (ماتیزی) کرد. ئینجا بازووی گرت. ئەفسەرەکەیش دیار بوو بە بیستنی خەبەرەکە ئەوەندە شاد نەبوو.

ئەفسەرەکە گوتی:

-بە داخەوەم کە رێك هەنووکە، ئەو رۆژەی بەرزترین خەلاتی ئەدەبیت وەرگرتووە، دەبێ خەبەرێکی ناخۆشت بدەمێ.

کلۆی گەورەی بەفر بەسەر کاسکێتی ئەفسەرەکەو بەسەر بێریەی فەروەی (ماتیزی)دا دەباری. بەفر بە سەر تفەنگی (ماتیزی)و بەسەر کەژو کێوی دووردا دەباری.

(ئۆرێل مارین) جگەرەی نەدەکێشا. لەگەڵ ئەوەیشدا، جگەرەیەکی پێکردو بە رەبەڵی دووکەڵەکەی هەڵمژی!

(ئۆرێل مارین) گوتی:

– هەڵماڵینی نهێنی سەربازیی، سزاکەی بەندییە! لەگەڵ ئەمەیشدا، رازێکی سەربازی هەیە، دەبێ پێتی بڵێم. گوێ بگرە: لە ماوەی چل و هەشت سەعاتی دادێ، فەوجەکەمان بەرەو سنوور دەکەوێتە رێ. بۆ قایمکاریی سنوور رەوانەی ئەوێمان دەکەن. لەوێ ژیانێکی سەخت دەژین. لە ئابلووقەی بەردەوامدا دەبین . لەوێ، نە مادۆن هەیەو نە پشوو. گوازرانەوە لەوێ نییە. ئەگەر بە ماوەی ئەو چل و هەشت سەعاتە فەرمانی گوازرانەوەت دەرنەچێ، دوای ئەوە، پاشایش ناتوانێ لە سنوور بتهێنێتەوە.

(ماتیزی)، چاوی بە دیوارەکانی سەربازخانەی شکارچییاندا گێڕا. هەموو رۆژێ، کە لە نێرین دادەبەزی، ئەم دیوارانەی دەبینی. رکی لە دیوارەکان دەبووەوە. کەچی ئێستا دەیەوێ لێیان جودا نەبێتەوە. شتێکی لە ژیانی سەربازخانەی شکارچییانی کەژو کێوی (برازۆڤ) ترسناکتری لە پێش بوو: ژیانی سەربازخانەیەکی سەر سنوور!!

ئەفسەرەکە گوتی:

–هەر ئەمرۆ بەیانی بڕۆ (بوخاریست). چی لە دەستت دێ بۆ گوازرانەوەت بیکە!. لێرەیش، لە سەربازخانە، من هەوڵ دەدەم بیانگەیەك بۆ نەهاتنت بدۆزمەوە. ئێستا، یەکسەر بڕۆ!

(ماتیزی) رووی کردە دەرگای سەربازخانە. وەکوو شاعیرێ خەڵاتی وەرگرتبێ، بە سەر بەرزی نەدەڕۆیشت، چاوی دانەواندبوو و تەماشای زەوی دەکرد. شوونی چەکمە نیوداشتەکالی، شوونی هەنگاو هەڵێنانی

راراو غەموونی، وەکوو شیعرێ لەسەر بەفر نووسرابێ، لەسەر زەوی جێ دەهێشت. ئەگەر یەکێ بیتوانیایە، لە کاتی چوونە دەرەوەی (ماتیزی) لە حەوشەی سەربازخانە، رەمزی شوونی چەکمەکانی لەسەر بەفری تازە بخوێنێتەوە، گومانی تێدا نییە ترسی نائومێدیی لە شوونی پێیەکان دەخوێندەوە کە وەکو شوونی پێی کارژۆلەیەك وابوو ماوەیەکی زۆر راویان نابێ‌و بزانێ زۆری نەماوە توانای راکردنی دەبڕێ‌و دەبێ رادەست بێ.

## (٧)

(ترايان ماتيزى) خۆى بە دەستەوە نەدا. تا كۆتايى تێكۆشـا. ئێسـتايش، ئەوەتا بە سەر بەرزىو بـە چـاوى پـڕ لــە تريسـكەى شـادى، وەكـوو فەرماندەيەكى زاڵ كە بێتەوە نيشتمان، پێى نايـە نـاو (بەشـى نـاوخۆ)ى قوتابييان لـە شەقامى (گريگۆرێسكۆى نيگاركێش). ســەركەوتوو بـوو، فەرمانى گوازرانەوەى لـە گيرفانى پالتۆى سەربازيدا بـوو. ئـەو رۆژەى فەوجەكەيان چووە سنوور، ئەو، فەوجى شكارچـييانى (بـرازۆڤ)ى جـێ هێشتو رووى كـردە ســەركردايەتى لــە (بوخاريسـت). ئـەو رۆژەى فەوجەكەيان چووە سنوور، ئەو فەرمانەكەى وەرگرت.

يەكەو راست چووە نووزگەى بەڕێوەبەر. پێش ئەوەى كەس فـەرمووى لێ بكا، لەسەر كورسييەك دانيشت. بێريەى فەرووەوى لەسەر كردەوەو لەسەر چۆكى خۆى داناو گوتى:

-لەمرۆوە، دووبارە پێويستم بە كليلى (بەشى ناوخۆ)يە. لە ئێستاوە لە (بوخاريست) دەمێنمەوە. دووبارە دەبمەوە بە قوتابىو رۆژنامەنووس...

بەڕێوەبەرى (بەشى ناوخۆ) دەسـتێكى باوكانـەى لــە شـانى دا. ديتـى ڕەنگ زەردو رەبەڵو هيلاكە.

(ماتیزی) پرسی:

-لە بارەی سەرکەوتنی منەوە چ دەڵێی؟ سەرکەوتنێکی گەورەیە!. بەڵام دەڵێی بەشداری شەڕی ماراتۆنم کردووە. بۆ گەڕانەوە ڤر، ناچار بووم سەفەرێکی شەست هەزار کیلۆمەتری بکەم. ماوەی سەد رۆژ، ماوەی سەد شەو، رۆژێ شەشسەد کیلۆ مەتر رێگام بڕیوە. ماوەی سەد رۆژ، ماوەی سەد شەو، یەك جار چییە لە ناو نوێن نەخەوتووم. ماوەی سەد شەو، لە ناو قەتار خەوتووم. بەڵام بە مەبەستی خۆم گەیشتم. ئێستا دەچم لە (ئیزڤۆر) پشوو دەدەمو دێمەوە. تاقی کردنەوەکانم دەکەمو لە رۆژنامەدا دەست بە چالاکییەکانم دەکەمەوە.

کاتێ بەڕێوەبەر قاوەی بۆ تێدەکرد، (ماتیزی)، وەکوو سەرکەوتنێك، کلیلی دەرگای ژووری (بەشی ناوخۆ)ی لە ناو دەستی راستەدا بوو.

جارێکی دیکە پرسی:

-رات بەرامبەر سەرکەوتنی من چییە؟

بەڕێوەبەر گوتی:

-دەمزانی سەردەکەوی. دڵنیابووم سەردەکەوی! تەنیا لە یەك شت دەترسام. یەك تاکە شت! لە شارەکانی هەرێم، ئۆتۆمۆبیلی فۆردی مۆدیل کۆنت دیوە.؟ بینە بەر چاوت مەکینەیەکی بیستو شەش ئەسپی بخەیتە سەر بۆدییەکی چەپرەكو ژەنگاویو زۆر بە خێرایی لە شەقامی سەرەکی باژۆیو هەموو بەنزینی بدەیتێ، سەراپای پارچە کۆنەکانی

بۆدییەکە دەکەوێتە بەر هەڕەشەی داوەشانو تێکشکان. مەکینەکە زۆر بەهێزە. هەناسەت لە دیار دەوەستێ. دەتەوێ ببینی چۆن پارچەکانی لێك هەڵدەوەشێنەوە. لە ترسان چاوت دەنووقێنی. من ئاوها سەیری پەلە پەلی تۆم دەکرد. سەد شەوو سەد رۆژ، بێ خەوو بێ حەسانەوە. وام دەزانی، لەشت وەکوو بۆدییەکی چەپرەك کە ماکینەیەکی زۆر بەهێزی خرابێتە سەر، تێك دەچێو لێك دەبێتەوە. مێشكو ورەی تۆ، لەشی خستبوویتە بەر کۆششێکی زۆر گەورە. دەترسام.

(ترایان) چووە ژوورەکەی خۆی. بە هەموو جلو بە بێریەی فەرووەوە، خۆی فڕێ دایە سەر چوارپا. لە دڵی خۆیدا گوتی: (ئای نووستنی ناو نوێن چەند خۆشە!!) بازووەکانی درێژ کرد. خۆی بۆ خەوتن ئامادە کرد. بەڵام پشتی چەند خولەکێك، بە یەك تەکان، قیت بووەوە. ئۆقرەی نەگرت، نە بخەوێو نە جلی مەدەنی لەبەر بکا. بەرەو رۆژنامەکەی کەوتە رێ. بۆ ئەوەی یەکسەر سەرکەوتنی خۆی بە (بیسیۆلا) رابگەیەنی.

کاتی بە لای کۆشکی شاهانەدا تێپەڕی، لە دڵی خۆیدا گوتی: ((بیسیۆلا) هەر بەڕێوەبەر نەبوو بۆ من. باوکێکی راستەقانی بوو. ئەگەر توانیومە بگەڕێمەوە (بوخاریست)، لە سای سەری (بیسیۆلا)یە. ئاساییە یەکسەر خەبەری بدەمێ کە گوازراومەتەوە.

(ترایان) بە تەما بوو چەردەیەك پارە لەسەر مووچەکەی، لە رۆژنامە وەربگریّو هەر ئەو شەوە، بەرەو (ئیزڤۆر) بە ریّ بکەویّ. پاشان بە گوڕو تینێکی تازە بێتەوە.

بە راکردن لە پلیکانەی بارەگای رۆژنامەکە سەر کەوت. زۆر شاد بوو. دوو پاسەوان لە هۆلی چەمەڕای رۆژنامەنەکە، بوون. (ماتیزی)، بیّ ئەوەی سەرنجیان لیّدا، بە تەکیاندا تێپەڕی! چووە نووزگەی (دەستەی نووسین). نووزگە سیخناخ بوو. هەموو نووسەرەکان لەویّ بوون. (بیسیۆلا) بە توندی قسەی لەگەڵ کرد:

-(ماتیزی)، ئەتۆ چت دەویّ؟

(ترایان) بە شادی گوتی:

-خۆت دەزانی، فەرمانی گوازرانەوەم وەرگرتووە!

ویستی بە دوورو درێژی باسی هەموو شتیّ بکاو فەرمانەکەی پێشان بدا.

(بیسیۆلا) گوتی:

-پیرۆزباییت لێدەکەم. لە ناخی دڵەوە پیرۆزباییت لیّ دەکەم. ئێستایش، یەکسەر راکەو برۆ!

(ترایان) دمەق ما، پرسی:

-چت گوت؟

- پێمگوتی یەکسەر را...! ئێستا پێویستم بە تۆ نییە. پاش چەند ڕۆژێکی دی وەرەوە.

(ماتیزی) پرسی:

-بۆچی؟ مەگەر من چیم کردووە؟ لێرە چ قەوماوە؟ هاتبووم خەبەرتان بدەمێ کە فەرمانی گوازرانەوەم وەرگرتووە.

(بیسیۆلا) گوتی:

-زۆر ڕاستە! تۆ خەبەری گوازرانەوەی خۆتت گەیاند. منیش پیرۆزبایم لێکردی، پێمگوتی ئیتر پێویستم بە تۆ نییەو فەرمانم پێکردی بڕۆی. ئیتر چاوەڕێی چ دەکەی؟

(ترایان) بە چاوی پڕ حیرەت تەماشای هاوکارەکانی کرد.

نووسەری بەشی سیاسی گوتی:

-ڕۆژنامە ڕاگیراوە. نەتزانیوە؟ یەکسەر لە ئێستگای قەتارەوە هاتی؟

نووسەری بەشی سیاسی ڕووی گوتاری کردە (بیسیۆلا)و گوتی:

-شتەکە گەورە مەکەن! شاعیران هەرگیز نازانن چ لە دەوروبەریان ڕادەبرێ. شاعیران نەوەیەکی بەختەوەرن!

(ترایان) ئاگادار بووەوە کە بەیانی هەر ئەو ڕۆژە، پاشای ڕۆمانیا لە دەسەڵات کارکەنار بووەو وڵاتی جێ هێشتووە. کودەتا کراوە. هەموو شت گۆڕاوە. حاڵەتی ئاگادارییان ڕاگەیاندووە. (ڕۆمالی)ی ڕۆژنامەی

رژێمی پێشـوو راگـیراوە. ئێسـتا، لەشـکر دەسـتی بەسـەر بەشـەکانی نووسینو بەڕێوەبەرایەتی داگرتووە

(ماتیزی) زانی هیچ بەڵگـەی بـە دەسـتەوە نییـە چـیدی لـە بارەگـای رۆژنامەکەدا چاوەڕێ بکا. وردەکاریی رووداوەکـانی بـە لاوە گـرنگ نەبوو. لەو هـەموو گۆڕانـەدا، یـەك شـت پەیوەنـدی بـەوەوە هـەبوو: داخستنی رۆژنامەکە. ئەمەیش مانای ئەوە بوو، ئەم، بێکار دەبێ. لـەو گۆڕانکاریـەی رووی دابـوو، ئەمـە لـە هـەموو شـتێ گـرنگتر بـوو. پێویستی نەبوو زانیـاری زیـاتر وەربگـرێ. ئـامێری نووسـینی نایـە بـن هەنگڵو بە سەرکزی، بەرەو (بەشی ناوخۆ) کووزەی کرد.

(ماتیزی)، ئامێری چاپی لەسـەر مێـزی نووسـینی بەڕێوەبـەری (بەشـی ناوخۆ) داناو گوتی:

-من شەست هەزار کیلۆ مەتر رێگـام بـڕی تـا هاتمـەوە. کـە هاتمـەوە (بوخاریست)، دەبینم رۆژنامە نەماوەو من بێکارم؟! باشە، سـەرکەوتنی من بە کەڵك چ هات!!

مامۆستای بەڕێوەبەر گوتی:

-پشتگیریت دەکەم بۆ رادیۆ. تۆ کوڕێکی بەهرەداری. هەمیشە جێگات دەست دەکەوێ. ئازا بە!

(ماتیزی) گوتی:

-من ئازام! بەڵام شەکەتم! وامزانی دەتوانم پشوو بدەم بەڵام ئێستا دەبێ کۆششێکی تازە بکەم. کۆششێکی گەلە زیاتر. بۆ ئەوەی کارێکی تر پەیدا بکەم.

زۆر بە هیلاکی چووە ژوورەکەی خۆی. ئەم جارە، لە سەرکەوتنی خۆی دڵنیا نەبوو. لەسەر تەختەکەی راکشا. لەسەر پشت هەڵاژاو کەوتە بیر کردنەوە. کەشەنگ بوو. لە شەکەتییان بە هیلاك چووبوو. بێریەی فەروەی راکێشایە سەر چاوی، دەمو چاوی داپۆشیو خەوت. دوای چەند خولەکێك راکشان، (ماتیزی)، بە شلو خاوی خەوی لێکەوت. مرۆڤ کاتێ کە هێشتا گەنجە، سەرەڕای رەنجی زۆریش، خەوی لێدەکەوێ.

سەرەڕای راگیرانی رۆژنامەو گۆڕانی باری سیاسیو بێکاری، (ترایان)، وەکوو منداڵ بە هێمنی خەوی لێکەوت!

## (٨)

(ترايان ماتيزى) ئيتر رۆژنامەنووس نەبوو.

چەند حەفتەيەك دواى راگيرانى رۆژنامەى (رۆمانى)، لە راديۆ دامەزرا. ئەو سەعاتە زەنگدارەى ماوەى سەد رۆژ بوو لە قەتار، سەرى سەعات پێنجى بەيانى، لە گيرفانى پاڵتۆى لێى دەدا بۆ ئەوەى لە ئێستگاى قەتارى (برازۆف) بە خەبەرى بێنێ، ئێستا، سەر لە نوێ، هەميشە سەعات پێنجى بەيانى لێيدەدا. سەعاتەكە لە ژوورێكى (بەشى ناوخۆ)، لەسەر مێز داندرابوو. ئەو كليلەى سەعات پێنجى بەيانى بۆ هاتنەوە (بەشى ناوخۆ)، بەكارى دەهێنا. ئێستا ديسان سەعات پێنجى بەيانى بە كارى دێنێ، بەڵام ئێستا بۆ چوونە دەرەوە بە كارى دێنێ. بە بزەيەكەوە لە دڵى خۆيدا گوتى: (ئەمە چارەنووسى منە! چارەنووسى منە، سەعات پێنجى بەيانى لە جادە بم. چ بۆ ئەوەى بێمەوە ماڵێ و چ بۆ ئەوەى لە ماڵەوە دەربچم. بەڵام بە هەر حاڵ گەرەك لە جادە بم.)

لە بيناى راديۆدا، هەموو چراكان داگيرسابوون، هەرچەندە لەو سەعاتەدا، خێنزى (ترايان)و يەك پێشخزمەت، كەسى تر لەوێ نەبوو.

(ترایان)، پاڵتۆو بێریەی فەروەو کەمەربەندی بە جلاوێزێك هەڵواسی. لە نووزگە دانیشت. پێشخزمەتیش کورسییەکی هێناو لە پشت هەمان مێز، بەرامبەر (ماتیزی) دانیشت. هەردووکیان تەماشای سەعاتیان کرد. ئینجا دەستیان بە کار کرد. (ترایان) برووسکەی بلاّوکراوەکانی نمایندەکانی راگەیاندنی بە قەڵەمداری سوور نیشان دەکرد. پێشخزمەت بە مقەس دەیبڕین و لەسەر کاغەزێکی چەسپ دەکردن. هەردووکیان بێدەنگ بوون. جارو بار، بێ دەستی خۆیان، سەریان بۆ سەعاتەکە هەڵدەبڕی. ئەم چالاّکییە یەك چارەکە سەعاتی خایاند. (ترایان) ئەو کاغەزانەی ژمارد کە دەنگو باسیان لەسەر چەسپ کرابوو. دەقەکەی چاك کردەوە. ئینجا رووی کردە ژووری دەرگا شووشە، ژووری بێژەر. پێشخزمەتیش کەوتە شوێنییەوە. پەرداخە ئاوێکی لەبەردەم (ترایان) دانا. هەردووکیان سەیری سەعاتیان کرد. سەعات شەشو نیو، (ترایان) دەستی بە خوێندنەوە کرد: (ئێرە رادیۆی رۆمانیایە! —رادیۆی بوخاریست!! خانمینە، مێرخاسینە! بەیانیتان باش...) لە کاتێ خوێندنەوەی کاغەزی تازە چەسپو هێشتا تەڕی دەنگو باسدا، پێشخزمەت لەبەر دەرگا شووشەکە وەستابوو تەماشای دەکرد. دەنگو باسی بەیانی دە خولەك درێژەی کێشا. هەر خولەکێك، چوارەکە لاپەڕەیەکی دەخوێندەوە.

کاتێ (ترایان ماتیزی) رایگەیاند: (لێرەدا هاتینە کۆتایی دەنگو باسی بەیانی.)، پێشخزمەت دەرگای شووشەی ژووری بێژەری کردەوەو

پاڵتۆکەی بۆ ڕاگرت. (ترایان) بە پەلە جلی کردە بەرو بە ڕاکە ڕاك لە ڕادیۆ چووە دەرەوە. لە سەرکردایی سوپا سەرباز بوو. سەرکردایەتی سوپایش وەکوو ڕادیۆ، ڕێگای یەك خولەك دواکەوتنی نەدەدا. (ترایان) وای پێ باش بوو چەند خولەکێك زووتر بگا. یەك خولەك لە سەرکردایی دوا بکەوێ، بیست و چوار سەعات دەستگیر دەکرێ. ئەگەر بیست و چوار سەعات دەسگیر بکرێ، لە ڕادیۆ دەردەکرێ. ئەگەر دەربکرێ، بێکار دەمێنێتەوەو ناتوانێ لە خوێندن بەردەوام بێ. ئەگەر ماوەیەکیش لە خوێندن دوابکەوێ، لە (بەشی ناوخۆ) دەردەکرێ. ئیتر بەم جۆرە بڕۆ! هەموو گیانی، هەموو هەست و ئاوەزی لەسەر یەك ئامانج بوو: تاوانی گەورەی (ناوردیی) نەکا. ڕاستە هەندێ جاری وا دەبوو سەعاتەکەی خولەکێك بە پاش بکەوێ، بەڵام ئەم، لەم قوناغەی ژیانیدا، مافی یەك چرکە دواکەوتنی نەبوو. کێ بە خەیاڵیدا دێ دەنگ و باسی ڕادیۆ یەك سەعات دوا بکەوێ؟ هەموو ڕۆژێ، بەیانی، بە ملیۆنان گوێگر، لە دیار ڕادیۆی داگیرساو، گویان قولاغ دەکرد. نەك بۆ ئەوەی گوێیان لە دەنگ و باس بێ، بەڵکو بۆ ئەوەی بزانن (ترایان) سی چرکە درەنگتر نایەتە سەر کار. (ترایان) هەستی دەکرد هەموو سبەینان، ملیۆنەها کەس خۆیان دانووساندووە بۆ ئەوەی چاودێری وردیی ئەو بکەن. یەك چرکە دواکەوتنیان لێ قەبووڵ نەدەکرد. یەك چرکە دواکەوتن، کارەساتی گشتی دەنایەوە.

لەبەر دەرگای سـەرکردایەتی، سەردەسـتەی ئـەو رۆژە، لـە پێناسـەی (ماتیزی) ورد بووەوە کە وێنەکەی لـەسەر بـوو. فانووسـی تـا حـەناس دەم‌و چاوی (ترایان) بەرز کردەوە بۆ ئەوەی بزانـێ ئـاخۆ ئـەم چـارەیە هەمان چارەی وێنەکەیە؟ یان نا؟ (ترایان) لـەبەر تیشکی چـراکە چـاوی تاری بوو، چاوی نوقاند. ئینجا سەردەستە تەماشای سـەعاتی کـرد بـۆ ئەوەی دڵنیا بێ کە (ماتیزی) دوا نەکـەوتووە! دەرگـای بـۆ کـردەوەو رێگای دا بچێتە ژوورەوە. (ماتیزی) رووی کردە تەسیارگە. چووە نـاو حەوشەی سەربازخانە. بۆنی چای بـە حەوشـەدا بڵاوبـووەوە. هـەموو سبەینان، کاتێ (ترایان) بە تاریکی، دەگەیشـتە سـەربازخانە، ئـەم بۆنـە دەهات. تەسیارگە بریتی بـوو تـەنیا لــە ژوورێکـی فـەراح، نزیکـەی بیست مەتر لە دەرگا دوور بوو. دەرگای والاّ بوو. دوازدە تـەختی بـە بەتانی بۆری تێدا بوو. چەکخانەیەك لە بن دیواری بنەبانێ بوو، دوازدە قەرەبینای پێ هەڵپەساردرابوو. سەکۆیەك بۆ پاککردنـەوەی چـەك لــە تەنیشت چەکخانەکە بوو. لاتەختێکی داریشی لێبـوو. وێنەیـەکی پاشـا لەسەر دیوار بـوو، دەورانـدەوری کاغـەزی سـێ رەنـگ بـوو. بـۆنی دەرمانی دژەگەنی دەهات، بۆنی دەرمانی دژەگەنی تێکەڵ بە بۆنی چـای لە دەرەوە دەهاتە ژوورێ دەتگوت پارچەیەکە لە بیناکە. (ترایان)، بـێ ئەوەی تەماشا بکا، سێیەمین تفـەنگی لـەسـەر چـەکخانەکە هـەڵگرت. تفەنگی خۆی بـوو. ئینجـا شیشـکەیەکی ئاسـنی لـەسـەر چـەکخانەکە هەڵگرت کە وەکوو شەمشێرێکی باریك وابـوو. تفەنگەکـەی لـەسـەر مێز دانا. پارچە پەڕۆیـەکی لــە دەوری شیشـکە ئاسـنەکە پێچـاو نـاو

لوولەی تفەنگەکەی پاك کردەوە. ئینجا پەلاپیتکەو جارێکی دیکە لوولەی تفەنگەکەی بە پەڕۆکە پاك کردەوە. بەڵام ئەم جارە، دەرەوەی لوولەکەی خاوێن کردەوە. قۆنداغەکەی پاك کردەوە. چرکەی لە پەلاپیتکەوە هێنا. تفەنگەکەی بە خۆیەوە قرساندو لەسەر تەختی بن دیوار راکشا. لە ژووری تەسیارگەیش وەکوو (بەشی ناوخۆ)ی قوتابیان، تەختەکەی لە بن دیوار بوو.

(ماتیزی) نامەیەکی لە رادیۆ وەرگرتبوو. نامەکەی لە گیرفانی دەرهێنا. حەزی کرد بە دەم کردنەوەی زەرفەکە، جگەرەیەك دابگیرسێنێ، بەڵام جگەرەکێشان قەدەغە بوو. نامەکە نامەی بەرێوەبەری رادیۆ بوو. داوای لێکرا بوو هەر ئەو رۆژە، پشتی نیوەڕۆ، بچێتە لای بەرێوەبەری گشتی.

(ماتیزی) وایدەزانی بۆ کارێکی رەسمی وەکوو بردنی روونووسی بڕوانامەی ئاوەمۆرکران، یان روونووسی بڕوانامە، یان بەکەلۆریۆس، یان شتێکی وا داوایان کردووە. نامەکەی لە بەرکی نایەوە. ئینجا چاوەکانی نیوەنوقاند. لە بەینی برژانگەکانەوە تەماشای چرای زەردی ساپیتەی کرد. تەماشای وێنەی پاشای کرد کە دەوراندەوری کاغەزی سێ رەنگ بوو. تەماشای وێنەی پاشای دەکرد بێ ئەوەی روخساری ببینێ. وەك لە رادیۆدا، وشەکانی دەخوێندەوە، بێ ئەوەی بیر لە مانایان بکاتەوە. (ترایان) بۆرژابوو. خاوبوونەوەیەکی شیرین لەشی داگرتبوو، لە نشکەوە، دەنگێك هات: ناو خوێندنەوە بوو.

هەر رۆژە دەنگێکی جیا بوو. لەگەڵ ئەوەیشدا، دەتگوت هەمان دەنگە. ئێشکچی رۆژ بوو بانگی پاسەوانانی دەستەی پاسەوانیی دەکرد بۆ ئەوەی لە حەوشەی تەسیارگە کۆوە بن. (ترایان) وەکوو رۆبۆت لە جێی خۆی دەرپەڕی. پاڵتۆکەی رێك خست. تفەنگی بە شانی راستەوە کرد. رای کرد بۆ جێگای کۆبوونەوە. شەش سەرباز، یەك لە دوای یەك، بە یەك ریز، ریزکرابوون، چاوەڕێی ئامادەبوونیان دەکرد. (ماتیزی) نەفەری شەشەم بوو. ئێشکچی رۆژ فەرمانێکی دا. شەش سەربازەکان بە هێواشی چەکەکانیان هێنایە خوارێ. پاکەتیان دارنییە ناو و ماقەنەجەیان راکێشا. بە یەك چرکە جوولانەوە. هەر شەشیان تفەنگەکانیان بۆ پێشەوە، راداشت. تەنیا جوولەی سەردەستە دیاربوو. (ماتیزی) چاوی نوقاند. لە کاتی پشکنینی چەکەکاندا، کە چاوی دەنووقاند، چێژێکی زۆری وەردەگرت. شتێکی پێچەوانەی رێنماییەکان بوو دەیکرد، بێ ئەوەی بگیرێ، یان سزا بدرێ. سەردەستە نەیدەدی داخۆ چاوەکانی کردۆتەوە، یان دایخستوون!.

لە پڕ، (ماتیزی) هەستی کرد هیچی لە ناو دەست نییە. سەردەستە چەکەکەی لە دەست دەرهێنابوو، لەبەر رۆناکی گلۆپی کارەبایی تەماشای دەکرد بزانێ هیچ پەڵەی چەوری، یان تۆزو خۆڵی لەناو لوولە، یان بە دەسك، یان بە پەلاپیتکەوە نەماوە؟ (ترایان، دوای پشکنین، تفەنگەکەی وەرگرتەوە. لەبەر پێی خۆی دانا. ئینجا لە تەنیشت خۆیەوە چەقاندی. ئەوسا، بە جوولەیەکی کتو پڕ، بە پێی

ڕێنماییەکان، چەکەکەی کردە شان. بە فەرمانێکی تر، شەش سەربازەکە قاچی ڕاستەیان بڵند کردو دەستیان بە ڕۆیشتن کرد. ئێستا، کاتی گۆڕینی پاسەوان بوو. (ترایان) ڕێگاکەی، لەبەر، پێ دەزانی. دەستە شەش نەفەرییەکە، سەردەستە لە پێش، یەکەم جار، بەرامبەر پلە مەڕمەڕەکانی سەرکردایەتی وەستا. سەربازی پێشەوەی دەستەکە، دوو شەقاوی بۆ پێشەوە هاویشت. وشەی نهێنی لەگەڵ پاسەوانی پێشوو ئاڵوگۆڕ کردو چووە جێگای ئەو. ئەو سەربازەی لەبەردەم پلە مەڕمەڕەکانی سەرکردایەتی پاسەوان بوو، هاتە پشت (ماتیزی). سەربازەکان، هەموو بە یەکەوە قاچی ڕاستەیان بەرز کردەوەو ڕۆیشتن. ئینجا جارێکی دیکە وەستان. ئەو سەربازەی لە پێشەوە بوو، چووە جێگای دووەم. پاسەوانی پێشوو چووە پشت (ماتیزی). تەنیا دوو سەربازی لە پێش ما. سێکەی تری لە دواوە دەڕۆیشتن. دوای ئەوە، تەنیا یەك سەرباز لە پێش (ماتیزی) ماو ئاخیری، خۆی کەوتە پێشەوەی دەستەکە. پێنج سەربازەکەی دیکە بە یەك نزم لە دوای ئەو دەڕۆیشتن. لە پلەکان هاتنە خوارەوە. چلو شەش پایە بوو. شەش سەربازەکە بە توندی لە پایەکان هاتنە خوارەوە. بۆن بۆگەنیو بۆنی هەوای تەڕو گرمخ دەهات. گەیشتنە ناو ژێرزەمینی دووەمی سەرکردایەتی سوپای ڕۆمانی.

ڕاڕەوی درێژو دەرگای ئاسنی بە قوفڵی مکوومی تێدا بوو. شەوو ڕۆژ، تیشکی بەهێزو گەشی گلۆپی کارەبای تێدا بوو.

ئەو ژێرزەمینە گەورەترین نهێنیی سەرکردایەتی تێدا بوو. دەستەکە لەبەردەم دەرگایەکی ئاسنی بە شیشەی ئەستوور وەستا. کە دەستەکە وەستا، (ماتیزی)، دوو هەنگاوی بۆ پێشەوە هەڵێنا. روو بە روو، کەوتە بەرامبەر سەربازی پاسەوان کە دەبوو جێی بگرێتەوە.

پاسەوانەکە گوتی:

- هاوڕێ، ئەم ئەرکەت پێ دەسپێرم دەبێ بە گیان، بەرگری لێ بکەی.

(ترایان ماتیزی) رستەی رەسمی ئەو بۆنەیەی دووبارە کردەوە:

-ئەرکەکە وەردەگرمو سوێند دەخۆم بە گیانی خۆم، بەرگری لێ دەکەم!

فەرمانێکی تری بە دوا داهات. شەش سەربازەکە، سەردەستە لە پێشەوە، بە هەنگاوی رێك دوور کەوتنەوە. بە جۆرێ دەڕۆیشتن دەتگوت لە باتی حەفت کەس، یەك کەسن. (ترایان ماتیزی)، بە تەنێ لەبەردەم دەرگای شیشەبەند مایەوە. تفەنگی بە شانو نێزەی بەسەر لوولەی تفەنگەوەو دوو نارنجۆکی بە کەمەرەوە بوو. تەماشای شیشە ئاسنەکانی دەرگای کرد. شیشەکان لە بازووی ئەم ئەستوورتر بوون. لە ژوورەوە رووناکییەکی وا بوو سۆمای چاوی دەبرد. ژوورەکە چاپخانەی نهێنی سەرکردایەتی تێدا بوو. هەرگیز، هیچ کەس، هیچ ئەفسەر، بە تەنێ، نەچووبووە ناو ئەو چاپخانەیە. کە بیانویستایە شتێ، فەرمانێکی نهێنی، چاپ بکەن، دەستەیەکی پێنج ئەفسەری دەهاتن.

مـۆری قوفڵەکـەیان دەشـکاند. دەسـتەکە کۆنووسـێکیان لـە بـارەی شکاندنی شەقڵۆ مۆرەکە ئامادە دەکرد. دەرگایان دەکردەوە، دەچوونە ژوورەوە، لە ژوورەوە مۆریان لێدەدایەوەو دەسـتیان بـە کـار دەکـرد. (ماتیزی) سەیری ئەو مۆرەی کرد کە پاسەوانییەکەی پـێ سـپاردرابوو. ئەو مۆرانەی لە قوفڵە ئاسنە گەورەکان درابوون، بە قـەد دوگمـەکانی پانتۆڵی سەربازیی (مـاتیزی) گـەورە بـوون. ڕەنگیـان وەکـوو ڕەنگـی دوگمەکانی شەروالی وابوو.

(ترایان)، هەموو سبەینان، تەماشای ئەو مۆرەی دەکرد کە بەڵێنی دابوو بە گیان، بەرگری لیّ بکا.

(ماتیزی) هەموو جارێ بیری دەکردەوە: (ژیانی من لـە دوگمـەی ئـەم شەرواڵە بێ نرخترە! ئەگەر ئەم دوگمەیە نرخی لە ژیانی من زیاتر بـێ، ئەوەندە گرنگ نییە من لێرە بمێنم.)

(ترایان) تەماشای ناو چاپخانەکەی کرد. ئامێرێکی چـاپی دەسـتی تێـدا بوو. ئامێرێکی ڕۆنیۆ لە بنەبانێ بوو. وەکوو ڕۆژنامە، هەندێ سندووقی پیتی قورقوشمی تێدا بوو. (ماتیزی)، لەو کاتەوە لە ژێرزەمینـی دووەمـی سـەرکردایەتی، پاسـەوانی دەکـردو چـاوەدێری مـۆری قورقـوشمی بـە ئەندازەی دوگمەی شەڵواری دەکرد، هەرگیز نەیدی بوو کەس بچـێتە ناو ئەم چاپخانە نهێنییە. تەماشای دوگمەی بچووکی مۆرەکەی دەکرد. بە گاڵتەو حەنەك تەماشای دەکـرد. ئـەم دوگمـە ئاسـنە، تاکـە هـۆی چالاکیی سەربازیی ئەم بوو. بۆ پاراستنی ئەم دوگمەیە ناوی عەسکەری

هاتبوو و ناچار بوو جلی سەربازی کردبووە بەر. هەندێ جار، (ماتیزی) بە مێشکیدا دەهات کە ئەم دوگمەیە لێ بکاتەوە. تەنیا بۆ ئەوە لێی بکاتەوە تا بسەلمێنێ شتێکی چەند بێ مانایە. بۆ ئەوەی بسەلمێنێ، ئەگەر ئەم دوگمەیە نەمێنێ، هیچ ناقەومێ. بەلام ئەمە بیرێکی گێلانە بوو. دەبوایە دوگمەکە بە ساغی رادەستی پاسەوانی دوای خۆی بکا. (ماتیزی) پالی بە شیشە ئاسنەکانەوە دا. گوێ قولاغ بوو. گوێ قولاغ بوو نەوەك سیخوڕان بێنە ژێرزەمینی دووەمی سەرکردایەتیو شەقلو مۆرەکە بشکێنن‌و نهێنییەکان بدزن. گوێ قولاغ بوو نەوەك ئەفسەرێك بۆ پشکنین بێ! بەلام هەرگیز هیچ ئەفسەرێك بۆ پشکنینی (ماتیزی) نەهاتە ژێرزەمینی دووەم بۆ ئەوەی (بزانێ ئاخۆ مەردانە ئەرکی پیرۆزی خۆی جێ بە جێ دەکا؟ یان نا؟

(ترایان)، بە شێوەیەکی رەحەتتر جێی خۆی خۆش کرد، سەری بە شیشەکان کرد. چەمەڕا بوو. نە چاوەڕێی سیخوڕانی دەکرد تا لەگەلیان بجەنگێو نە چاوەڕێی دەنگی پێی ئەفسەری پشکێنەری دەکرد. چاوەڕێی دەنگی رێکی پێی شەش سەربازی دەکرد کە لە دوای سەردەستەوە بێن‌و بیگۆڕن. ئەمە دەبوایە سەعات دە بکرێ. بەلام هێشتا سێ سەعات مابوو بۆ سەعات دە. تەنیا پێنج خولەك بوو لەوێ بوو. تفەنگ لە شان‌و نێزە بە سەری لوولەی تفەنگەوەو دوو نارنجۆك بە کەمەرەوەو بە مەخزەنی پڕ فیشەکەوە، ئامادە بوو گیانی خۆی لە

پێناوی پاراستنی دوگمەی قورقوشمی بە قەد دوگمەکانی پانتۆڵی سەربازیی خۆی، ببەخشێ.

## (٩)

نیوەڕۆ، (ترایان) سەربازخانەی سەرکردایەتی جیٚ هیٚشت. رووی کردە بارەگای رادیۆ، بەڕیٚوەبەری گشتی داوای کردبوو. ئیٚستا وای دەزانی دەچیٚتە جیٚگایەکی جیا لەو جیٚگایەی هەموو سبەینان دەچویٚ. کچانی جوانو جحیٚلٚو قۆزی لە هۆلو لە ڕاڕەوەکانو لە نووزگەکان دەدی. ئەمانە فەرمانبەرانی دەزگاکە بوون. هیچ یەکیٚکیان سەری بۆ لای ئەو سەربازە وەرنەسووڕاند کە هاتە ژوورەوە. هەموویان هاوکارانی خۆی بوون. هیچ یەکیٚکیان، بە ناو نەبیٚ، (ماتیزی)ی نەدەناسی.

(ترایان) ئامادەکەرو پیٚشکیٚشکەری دەنگو باسی بەیانیان بوو. هەموو فەرمانبەران ئەمەیان دەزانی. بەلاٚم کەس (ترایان ماتیزی) نەدیبوو. ئەویش هاوکارانی خۆی نەدەناسین. هاوڕیٚی خۆیان بوو. بەلاٚم هاوڕیٚیەکی دوور. هاوڕیٚی جیٚگایەکی تر. لە جەرگەی شەودا، کە ئەوانەی تر هیٚشتا لە خەودا بوون، دەچووە رادیۆ. هەمیشە لە جەرگەی شەویشدا لەویٚ دەردەچوو. لە رادیۆدا، تەنیا سیٚ کەسی دەناسین: بەڕیٚوەبەری گشتی کە تەنیا یەك جار دیبووی، ئەو رۆژەی کە دامەزرا، خەزنەدار کە مانگیٚ یەك جار دەیبینی، کاتی مووچەی

وەردەگرتو ئەو پێشخزمەتەی هەموو سبەینان برووسکەکانی لە سەر پارچە کاغەز دەچەسپاند. ئیتر ئاو بێنەو دەست بشۆ! هەموو ئەوانەی دیکەی تەنیا بە ناو دەناسینو بە ناو دەیانناسی، بەڵام (ترایان ماتیزی)ی سەرباز، کە لەو ساتەدا بەسەر پلیکانەی فەرش سووردا، سەردەکەوت. کەس بە ناسین نەیدەناسی. بۆیە کەس تەماشای نەدەکرد. هەستی بە تەنیایی دەکرد. بەم تەنیایەی ناو هاوکارەکانی ئازاری دەخوارد. وایدەزانی ئەو پلیکانەی دەچووە ژووری بێژەر، هەمان ئەو پلیکانەیە نییە کە هەموو رۆژێ لێی سەردەکەوت. ئێستا پلیکانەکە بریقەدار دەکەوتە بەرچاو. ئێستا زەرییەك لەو ژوورە بوو کە هەموو سبەینان دە خولەك نووچەی تێدا دەخوێندەوە، زەرییەك لەوێ بوو. کچەکە لەسەر کورسیو لە پشت مێزو لەبەردەم مایکرۆفۆنی (ماتیزی) دانیشتبوو. (ماتیزی) لە دەرگای شووشەبەندەوە تەماشای کرد. کچە جحێڵەکە نەیدەناسی. (ماتیزی) چووە نووزگەی بەڕێوەبەر. نووزگەیەکی کیبار بوو، مۆبیلو قاڵی جوانی تێدا بوو. بەڕێوەبەر ناوی (ڤازیل لۆنیسکۆ) بوو، بەر لەوەی ببێ بە بەڕێوەبەری ئەوێ. لە رادیۆدا، پارێزەر بوو. لە حانی شۆڕش، لە کاتی لادرانی پاشادا، یاخییەکان ژووری بێژەریان داگیر کردبوو، (ڤازیل لۆنیسکۆ) چووە ژووری بێژەرو دەری کردنە دەرەوە. شۆڕشگێڕان نەیانتوانی پەیامی خۆیان بلاو بکەنەوە. حوکوومەت گەیشتە ئەو باوەڕە ئەو پارێزەرەی لە کاتی شۆڕشدا، ئاوا قارەمانانە رەفتاری کردووە، شایەنی ئەوەیە ببێ بە بەڕێوەبەر.

(ترایـان) تەماشـای دەکـردو لەبـەر جلـی سـادەی سـەربازیی خـۆی پەشۆکابوو. ئەو دیمەنەی دەهێنایە بەرچاو کـە پـارێزەر بـە تـاقی تـەنێ لەگەڵ سێ شۆڕشگێری تا ددان چەکدار، دەجەنگا.

بەڕێوەبەر گوتی:

-(ماتیزی)، دەزانی من ڕێزێکی زۆر تایبەتیم بۆ تۆ هەیە؟

(ترایان) گوێی دابووە بەڕێوەبەرو تەماشای بازووە بەهێزەکانی دەکـرد. ئەو بازووانەی شۆڕشگێرەکانی پێ شکاندبوو. بەڕێوەبەر، دەمو چـاوی سوور بوو. تازە ریشی تاشی بوو. جلەکانی نوێ بوون. ئەنگوسـتیلەی بە قاشی گرانبەهای لە تلکدا بوو.

بەڕێوەبەر گوتی:

-من خۆم ڕێزی تایبەتیم بۆ تۆ هەیە، وەکوو شـاعیر تـۆم زۆر بـە دڵـە. کتێبەکەت: (شیعری نووسراوی سـەر بـەفر)، تاقـە کتێبێکـی شـیعرییە لــەوەتی لــە زانکـۆ دەرچـوویم، خوێندوومەتـەوە. زۆرم پـێ خۆشـە. پیرۆزباییـت لــێ دەکــەم. بــە ڕۆژنامەنووسـێکی بــەرزت دەزانم. تـۆ شێوازێکی زۆر بەجۆش و مرۆڤایەتیت هەیە، یەکسـەر دەچـێتە دڵـەوە. وەکوو فەرمانبەرێکی فەرمانگە ڕێزت دەگرم. ڕشـت بوونـت لەسـەر ڕێزگرتنی کاتو لەسەر جێ بە جێ کردنی کارەکانت، بەگەن دەکەم.

(ماتیزی) سوپاسی کرد بۆ ئەم پیاهەڵدانە.

بەڕێوەبەر بەردەوام بوو:

– من راستيت پێ دەڵێم. تۆ هەموو شتێکت چاکە. وەکوو سەرباز، ئامادەی وەکوو هەر یەکێکی دەستەبژێر، هەموو ساتێ گیانت بکەیتە قوربانی نیشتمانو ئاڵاو تاج! لەبەر ئەوەی تۆ گەنجێکی دەستەبژێری، تۆ جێی شانازی بنەماڵەو دەزگای ئێمەو نیشتمانیت.

(ترایان) شەقڵۆ مۆری قورقوشمی بە ئەندازەی یەك دوگمەی شەروالی بیر کەوتەوە کە هەموو سبەینان سوێندی دەخوارد بە گیانی خۆی بەرگری لێ بکا. هەستی بەنارەحەتی کرد.

بەڕێوەبەر گوتی:

–خاکی مەبە! خاکێتی، لێرە جێی نابێتەوە! گەنجێکی شاکی وەکو تۆ، تێ دەگا. دەبینی، ئەوەی پێت دەڵێم، کوڕێکی خاوەن بەهرەی ناوازەی وەکوو تۆ نەبی، ناتوانێ بە ئاسانیو بێ روون کردنەوەی زۆر، تێبگا. (ماتیزی) مەسەلە ئەمەیە تۆ ناتوانی چیدی ئەرکی دەنگو باسی بەیانیان رایی بکەی. ئەستەمە بتوانی بەردەوام بی. تەواو ئەستەمە. دەبێ کارەکە بۆ یەکێکی تر جێ بێڵی .

(ترایان) وڕو گێژ بوو. باوەڕی بە گوێی خۆی نەدەکرد.

بەڕێوەبەر گوتی:

تۆ هیچ غەڵەتت نەکردووە. هیچ غەڵەتێکت نییە. بەلام ئیتر ناتوانی دەنگو باسی سبەینان پێشکێش بکەی!. ناچارم تۆ بگۆڕم. هەموو

بەیانیان، سەدان نامەی توورەم لە گوێگرانەوە بۆ دێ. من بە وردی گوێم لێ راگرتووی، دەزانم ئەو نامانەی نارەزایی، بیانووی خۆیان هەیە.

بەڕێوەبەر، چاوەکانی توند بوون. ئەو ساتەی لەگەڵ سێ شۆڕشگێڕەکە دەستو پەنجەی نەرم دەکرد، دەبێ چاوەکانی بەم جۆرە بووبن.

بەڕێوەبەر بەردەوام بوو:

-دەزانم تۆ پیاوێکی رۆمانی باشی. رۆمانییەکی زۆر باشی! بەڵام راستی بڵێین تۆ دەنگێکی جوولەکانەت هەیە. تۆ وەکوو جوولەکان پیتی (ر) دەردەبڕی. رێك وەکوو ئەو بێژەرە جووەی لە رادیۆی لەندەن قسە دەکا. پێویستە ئەم دەنگە جوولەکانەیە لە رادیۆی رۆمانی نەمێنێ. شتەکە سادەیە. تۆ دەبێ کارکەنار ببی! دەمەویست ئەمەت پێبڵێم! هەر پیاوی پێی بڵێن پیاو، دەبێ بە خۆڕاگری خۆی، بەرگەی کەمو کورتییە سروشتییەکانی خۆی بگرێ. تکا دەکەم بە جۆرێکی تری تێ مەگە، من نرخی تۆم لایە.!

بەڕێوەبەر دەستی بە ئەنگوستیلەی لەسەر دوگمەی زەنگێك داگرت. ژنێکی قەڵەو هات تەنوورەیەکی کورتی لەبەر بوو. لاسمتەکانی گوشی بوو. خانمی (ژۆهان)ی سکرتێری بەڕێوەبەر بوو. بەڕێوەوبەر پێیگوت:

-جەنابی (ماتیزی) تێگەیشتووە، بە هۆی دەربڕینی پیتی (ر)ی سامییانەی، ناتوانێ چیدی بە بێژەر لای ئێمە بمێنێتەوە. (ماتیزی)

کوڕێکی زیرەکە. بە خەزنـەدار بڵـێ حیسـابی جـەنابی (مـاتیزی) پـاك بکاتەوەو ناوی لـە لـستی کارمەندانمان بسڕێتەوە.

بەڕێوبەر سەر لـە نوێ دەمی قسەی کردە (ماتیزی):

–ئێمە ئەم فیداکارییانـە بـە قوربانیـدانێك دادەنـێین لـە ڕێـی نیشـتمانە ئازیزەکەمان.

(ترایان) بە مەندەهۆشی لـە نووزگـەی بەڕێوەبـەر هاتـە دەرەوە. چـووە بەشی ژمێریاریی. پێشتر، پێویستیی بە ڕێ کردنی، جێ بە جێ کرابـوو. لـە پلیکانەی فەرشسوور هاتە خوارێ. وەکوو هەر فەرمانبەرێکی دونیا، بە دەرکرانی بریندار ببوو. ئێسـتا، کـە دەرکرابـوو، بـە سـەرکزی لـە قادرمە هاتە خوارێ. شاد بوو کە کەس ناناسیێو کەس نایناسیێ. ئەگـەر هاوکارەکانی بناسـیایە، دەبایـە خـوا حافیزییـان لێ بکـا. بـەڵام کەسـی نەدەناسی. هەمیشە بە تەنیا کاری دەکرد.

کە بە پێش ژووری دەنگو باسدا تێپـەڕی، سـەری دانەوانـد. هەسـتی کرد فرمێسکی لە چاو هـات. ئـەم ژوورە دەرگـا شووشـەیەی خـۆش دەویست. مایکرۆفۆنەکەی خۆش دەویست. ئیتر قەت ناچێتەوە ناو ئەم ژوورە. سبەینەی رۆژی پاشی، یەکێکی تر لـەگەڵ هۆکڵەکە کار دەکاو لـە ناو قەفەسی شووشەبەندا دەڵـێ: (ئێرە رادیۆی رۆمانییە! – خانمینە، مێرخاسینە بەیانیتان باش!) ئیتر (ترایان ماتیزی) هەرگیز لـەم ژوورەدا، بە گوێگرانی ناڵێ: (بەیانیتان باش!) بۆیە هەستی دەکـرد دیسـان تەنیایـە.

هەموو ئەو برادەرانەی لە دەست چووە کە هەموو بەیانیان، سەعات شەش‌و نیو، هیوای رۆژێکی خۆشی بۆ دەخواستن. هەمووی لە دەست چووین. ئیتر کەسی نییە پێی بڵێ بەیانی باش‌و لەوە بە دواوە، تەنیا دەبێ.

(ترایان ماتیزی) بە تەنیایی‌و خەفەتخانی رووی کردە (بەشی ناوخۆ)ی قوتابیان لە شەقامی (گریگۆرێسکۆی نیگارکێش). (بەشی ناوخۆ)، بە ئاسایی لەو ساتەدا پڕ بوو لە قوتابی. بەرێ، هەنووکە، چۆڵ‌و هۆڵ بوو. (ترایان) دەیەویست یەکێ ببینێ، وەلێ رارەوەکان چۆڵ بوون. چووە ژووری خۆی. نامەیەك لەسەر مێز بوو. زەرفەکەی کردەوە. بانگێشت بوو بۆ سەر زەماوەند. (ماری) باسی زەماوەندی خۆی کردبوو و داوەتی کردیوو بۆ سەر زەماوەند.

(ماتیزی) داوەتنامەکەی لە ناو زەرفەکە نایەوە. زەرفەکەی لەسەر مێزی پشت سەری خۆی دانا. بە هەموو جلەوە لەسەر تەخت راکشا. چاوی نوقاند. بەڵام یەکسەر وزاقی دا: (دەبێ سەعات سێ لە سەربازخانە بم.) بە لەزو بەز (بەشی ناوخۆ)ی جێ هێشت. چوو بۆ ئەوەی بە گیانی خۆی، بەرگری لە مۆری قورقوشمی چاپخانەی نهێنی بکا.

هەر ئەوەندەی بۆ مایەوە: (مۆری ژێرزەمینی دووەمی سەرکردایەتی گەورە.)

## (١٠)

(ترایان)، دوای ئەوەی لە رادیۆ دەرکرا، نەیتوانی هیچ کاری تر پەیدا بکا. لەبەر ئەوەی سەرباز بوو، کەس نەیدەویست کاری بداتێ. چوار مانگ بوو بێکار بوو. هیچ پارەی نەمابوو، نە بۆ جگەرەو نە بۆ نان. چەندەها رۆژ، هێل لەوەی، نانۆکەی لە چای هەڵدەکێشا، هیچی تری نەبوو بیخوا. لە سەرکردایەتیدا، پاسەوانی دەکردو لە کۆلێجدا، تاقی کردنەوەکانی دەکرد. جاروبار، بەرێوەبەری (بەشی ناوخۆ) چایو نانۆکەی بۆ دەنارد. (ترایان) رادەست نەبوو. بەڵام بەوای نێزیو بەوای شەکەتیو بەوای هەموو ئەم شکەستانە، وردە وردە ورەی دادەبەزی .

کە لە سەربازخانەی سەرکردایەتی هاتە دەرەوە، بە بەردەم پلیکانەی مەرمەڕدا تێپەڕی، هەوڵی دا شێوەیەکی سەربازی وەربگرێ بەڵام قاچی شل بوو ، چاوی بریبووە زەوی. یەکێ دەستی لەسەر شانی دانا. (ترایان) راچڵەکی. یەکێ دەستی بە دەستکێشی قاوەیی، لەسەر شانی پاڵتۆی دانابوو. بۆنی عەتری چووە ناو تفنگەکان. قایشو قرۆشی سەرهەنگی بینی، سەرهەنگ بوو رایگرتبوو. بە ئامادەیی وەستاو بە پەشۆکاوی گوتی:

-تکایە بمبوورە! باوەڕ کە، نەمدیبووی! سەلامم بۆ وەرنەگرتی! تکایە ببەخشە!

ئەو ئەفسەرەی شانی گرتبوو، سەرهەنگ (ستانکۆڤ) بوو. سەرهەنگ دەستکێشی چەرمی قاوەیی لە دەست کردەوەو دەستی بیّ دەستکێشی بۆ (ماتیزی)ی سەرباز راداشت.

(ستانکۆڤ) گوتی:

-نارەحەت مەبە!! بۆچی شڵەژاوی!؟

(ترایان) تەماشای سەر شانەکانی کرد. نیشانی زێڕی سەرکردایەتییان بەسەرەوە بوو. نەیتوانی دان بە هۆی غەمباری خۆیدا بنیّ. بێنەوایی و بێکاری شوورەیین! نەك بەختەوەری. سەرهەنگ چاوەڕێی وەڵامی نەکرد.

(ستانکۆف) پرسی:

-بۆچی قەت سەرم لێنادەی؟ باش نییە.

(ترایان) دەیزانی (ستانکۆڤ) سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری سەرکردایەتییە. (ستانکۆڤ) وەکوو هەموو سەرۆکێکی دەزگای هەواڵگری ناو فلیمو چیرۆکان، پیاوێکی باش بوو، پۆشتەو پەرداخ بوو.

سەرهەنگ گوتی:

-دەبوایە بێی سەردانم بکەی! ئەو پەڕی، ناتەوێ لەگەڵ من کار بکەی؟ پێم بڵێ بزانم، بۆیە نەهاتیتە سەردانم چونکە ناتەوێ لەگەڵ من کار بکەی؟

کاتێ سەرهەنگ (ستانکۆڤ) بە چەکمەی بریقەدارو جلی سەربازی درەخشان، کە لای باشترین دوورماندروو بە رادانی دابوو و بە قامچی قەفتەزیو، بە جادەدا دەڕۆیشت، هەموو عالەم روویان وەردەگێڕاو بە پستە پست دەیانگوت: (ئەمە سەرهەنگ (ستانکۆڤ)ی سازمانی هەواڵگرییە!!)

هەموو کەس دەیانناسی. منداڵانی قوتابخانە، کاتێ لە (کالیا ڤکتۆریای) بە تەکیدا دەڕۆیشتن، دڵیان دەکەوتە تەپە تەپ! (ستانکۆڤ) پیاوێکی باڵکێش بوو! (ترایان)یش کاتێ لە جادەدا تووشی دەبوو، بە وردی سەیری دەکرد. وای خەیاڵ دەکرد سەرهەنگ دەچێتە کۆبوونەوەی نهێنیی هەواڵگرە ناودارەکان. ئێستا سەرهەنگ داوای لە (ترایان کرد ئاخۆ نایەوێ کاری لەگەڵ بکا؟! (ترایان) سەری سوڕما! هیچ توانای پیشەی هەواڵگری لە خۆیدا نەدەدی!

سەرهەنگ گوتی.

-خۆت دەزانی من لە نووزگەی دوو نەماوم؟ من ئێستا سەرۆکی بەشی (ڕاگەیاندنو بانگەشە)ی سەرکردایەتیم. بەشەکەم پێویستی بە پیاوی وەکوو تۆ هەیە. بەم زووانە دەستەیەکی پەیامنێرانی سەربازی پێك دێنم.

ئەگەر شەڕ هەڵبگیرسێ، دەبێ ئامادە بین. من بیرم لە تۆ کردۆتەوە. ڕۆژێ، ئەگەر وەختت هەبوو، سەرێك لە نووزگەکەم بدە.

سەرهەنگ، دەفتەرێکی چەرمی ڕەشی تێبینی، لە گیرفانی سەر سینگی چاکەتی دەرهێنا، لەسەری نووسرابوو: (هێرمێ- پاریس)و کردییەوە.

سەرهەنگ گوتی:

-چاو دێ! ناوی تۆم نووسیوە! من لە بەشەکەی خۆمدا، پێویستم بە ڕۆژنامەنووسی ڕاستەقینە هەیە، پێویستم بە ڕۆژنامەنووسی بەهرەدار هەیە. تا ئێستا، بە ناچاری، دوو هەزار کەسم وەرگرتووە. هەموو برازاو ئامۆزای جەنەراڵو وەزیرو خاوەن کارخانەو دیپلۆماسیی ڕۆمانین. هەموویان بۆ ئەوە هاتوونەتە بەشەکەی من تا ئەگەر جەنگ هەڵگیرسا، نەچنە بەرەکانی شەڕ. لە ملی منیان ڕاکردووە. ناچارم دەبێ وەریان بگرم. بەڵام من پێویستیم بە چەند ڕۆژنامەنووسێکی پیشەوەر هەیە. لانی کەم دە کەس، کە باری ئەم دوو هەزار کەسە کێرنەهاتییە بگرنە ئەستۆ!! تۆ لە کوێ خزمەت دەکەی؟

(ترایان) وەڵامی دایەوە:

-لە فەوجی پاسەوانی سەرکردایەتیم.

سەرهەنگ گوتی:

-ئەمر دەکەم بگوازرێیتەوە لای من!

لــه دەفتەرۆكــەی رەش‌و جـوانی یادداشـتدا، شـتێكی بەرامبـەر نـاوی (ترایان) نووسی. پیرۆزبایی لــه (مـاتیزی) كـرد كـه خـەڵاتی شـیعری وەرگرتووەو پرسی:

-تۆ رووسی دەزانی؟

-دەتوانم بە رووسی ئیشی خۆم رایی بكەم. هەشت ساڵ لە (كیشینف)، لە كۆلیج خوێندوومە. تەنانەت بەرهـەمی چـەند شـاعیرێكی رووسـیم وەرگێڕاوە.

سەرهەنگ دەستی گوشی. لە پلیكانەی مەڕمـەڕ سـەركەوت‌و چـووە ناو بینای سەركردایەتی. (ماتیزی) ئەم چاوپێكەوتنەی پێ خۆش بوو.

سبەینەی پاشی، كـه (ترایـان) خـۆی بـه فـەوجی پاسـەوانی، ناسـاند، ئێشكچی رۆژ، تیشكی چـرای لــه دوورِ چـاوەكانی دا. ماوەیـەكی زۆر لەبەر دەرگا، لـەبەر رووناكی چرا، رایگرت بـۆ ئـەوەی پێناسـەی بـه باشی وەربگرێ.

ئێشكچی گوتی:

-تۆ چیتر پاسەوانی ناكـەی. تـۆ گوازراویتـەوە بـۆ بەشـی سـەرهەنگ (ستانكۆڤ). تفەنگ‌و نارنجۆك‌و تفاقەكانت بدەوە، ئینجا برۆ، خـۆت بـه بەشی راگەیاندن بناسێنە.

ئەگەر سەربازەكانی فەوجی پاسەوانی خەبەریان وەرگرتبا كە (مـاتیزی) بۆتە ئەفسەر، ئەوەندە ئێرەییان پێ نەدەبرد. بەڵام گوازرانەوەی بۆ لای

(ستانکۆڤ)، لـەوە گـرنگترە ببـێ بـە ئەفسـەر. پیاوەکـانی سـەرهەنگ (ستانکۆڤ) سەعاتی کاری دیاریکراویان نـەبوو. ئەگـەر بیانویسـتایە بـە بەرگی مەدەنی دەچوونە دەوام. پەڕلـەی (لێگـەڕێن بـڕوا)ی تایبـەتیان هەبوو. بۆ ئەوەی شەوو رۆژ، هـەر کوێیـان بـوێ تێیـدا بسـووڕێنەوە. (ماتیزی) ئەو سبەینەیە کە چووە نووزگەی سەرهەنگ، پەی بەم هەموو شتە برد.

سەرهەنگ گوتی:

-فەرموو دانیشە! داوای لێکرد لەسەر کورسییەکی چەرم دابنیشێ.

جگەرەیەکی پێشکێش کردو باسی بەشی بانگەشەی بۆ کرد.

-هـەموو ئەسـتێرەکانی شـانۆو سـینەما لـەم بەشـەدا کۆدەکەمـەوە. نووسەرو رۆژنامەنووس‌و نیگارکێشەکان خڕ دەکەمەوە. شادم کە تـۆم لەگەڵدا بێ. تۆ پەیامنێرێکی گەورەی. لە کنە من زۆر گەورەی!!.

سەرهەنگ بە گەرمی دەدوا. (ترایـان)، بەرلـەوەی لـە نوزگـە بـڕوا، پرسی:

-من کارم چ دەبێ؟ خۆم بە کوێ بناسێنم؟

سەرهەنگ گوتی:

- تۆ، فەرمان تەنیا لە من وەردەگری. هەر کاتێ پێویستم بە تۆ بوو، لە دووت دەنێرم. بۆ ئێستا، برۆ، تۆ ئازادی!

سەرهەنگ مستێکی لە (ماتیزی) داو تا بەر دەرگـا بـە رێـی کـرد. نـە (بیسیۆلا)، نە بەرێوەبەری (بەشـی نـاوخۆ)، هیچـێکیان ئـاوا بـە رێـزو لوتفـەوە، لەگـەڵ (مـاتیزی) نەدەجوولانـەوە. ئەمـە یەکـەم جـار بـوو (ترایـان) وەکـوو مرۆڤێکـی گـرنگ، نـەك تـەنیا وەکـوو (گـەنجێکی بەهرەدار)، رەفتاری لەگەڵ بکرێ.

سەرهەنگ لەسەر کۆسپەی دەرگای نووزگە، گوتی:

-دەتوانی بە پلیکانەی سەرەکیدا، هاتو چۆ بکەی.

(ترایان) بە پلیکانەی مەرمـەردا، لـە بینـای سـەرۆکایەتی هاتـە دەرێ. هاورێکەی کە نۆرەی پاسەوانی بوو، بـە مەندەهۆشـی تەماشـای کـرد. (ترایان)، لە رێگای خۆی بـۆ (بەشـی نـاوخۆ)، بەرامبـەر کلێسـەکەی پشت باغی (سیشمیجین)، وەستا. چـووە ژوورەوە. بێریـەی فـەروە بـە دەست، چۆکی داداو سوپاسی خوای کرد کە دووبـارە کردییـەوە بـە رۆژنـامووسو لـە فـەوجی پاسـەوانیو لـە مـۆری قورقوشـم دووری خستەوە.

(ماتیزی) لە دڵی خۆیدا گـوتی: (هێمـانێ یەکـەم پـارەی خـۆمم هاتـە دەست، دێمە ئێرەو وەکوو وەفاداریی، مۆمێـك دادەگیرسـێنم. ئـەمرۆ، یەك (سوو)م نییە. ماوەیەکی زۆرە، یەك سووم لە گیرفانی خۆم نەدیوە. ئای خودایە! بمبوورە! کە ئەمرۆ ناتوانم یەك مۆمیش بـۆ سوپاسـگوزاری تۆ داگیرسێنم...

# (١١)

جەنگ هەڵگیرسا. سوپای رۆمـانی لــە (پـروت) پەڕیــەوەو شــەڕ، بـۆ ڕزگار کردنی (بێسارابی) لـە داگیرکردنی ڕووسی، دەستی پێکرد. یـەك ساڵ بوو، (بێسارابی) لـە ژێر فشاری تۆقاندنی سۆڤێتی دەتلایەوە.

ئەوەی تەماشای نەخشە بکا، دەبینیٚ (بێسارابی) هەرێمێکـە دەکەوێتـە نێوان (پروت)و (دنـی یێسـتەر). (بێسـارابی)، بـۆ لـەشـكری ڕۆمـانی، هەرێمێك بوو دەبوایە لـە ژێر نیری بێگانـە ڕزگـار بکـریٚ. بـۆ (ترایـان ماتیزی)، (بێسـاربی) خـاکێکی خۆشەویسـت بـوو. وڵاتـی سـەردەمی منداڵیو مێردمنداڵێتی بوو. کە دەیبیسـت ئـەو وڵاتـەی شـەیدای بـوو، ڕزگار دەکریٚ، لـە خۆشـییان گـڕی شـادی لــە دەمو چـاو بـەردەبوو. دەیەویست لـەگەڵ یەکەم دەستە سـەرباز بچـێتە نـاو (بێسـارابی)و لــە برادەرەکانیو لـە جێگا گرنگەکان بگەڕیٚ.. دەیەویست دەست بـەجیٚ بڕوا..

سەربازێك، پالتۆیەکی قایشی لـەبەر بوو، چەکمەیەکی لـە پیٚو عەینەکی سوارماتۆڕانی لـە چاو بوو، . لـە(بەشی ناوخۆ).، هاتە ژووری (ترایـان). پۆستەچی سەرکردایەتی گەورە بوو.

سەربازی سوارماتۆڕ گوتی:

-سەرهەنگ (ستانکۆڤ) زۆر بە پەلە داوای کردووی.

بە حاڵەتی ئامادەیی وەستا بوو. سوار ماتۆڕەکە دەیدی (ماتیزی) سەربازێکی سادەیە، بەڵام دەیزانی سەربازانی سەرهەنگ (ستانکۆڤ)، هەرچەندە سەربازی سادەن، بەڵام هونەرمەندی گەورەو نووسەری بە ئورزەو نیگارکێش و مووزیکژەنی بەهرەدارن. بۆیە بە حاڵەتی ئامادەیی لەبەردەم (ماتیزی) وەستا.

(ماتیزی) پرسی:

-سەعات چەند دەبێ لەوێ بم؟

سەربازەکە گوتی:

-سەرهەنگ پێش نیوەڕۆ چاوەڕێت دەکا. دانی سبیانی، هەر کاتی ویستت، وەرە.

دوای رۆیشتنی سوارماتۆڕەکە، (ترایان) پاڵتۆی کردە بەر.

ویستی زوو بچێتە لای سەرهەنگ (ستانکۆڤ). دڵنیا بوو رەوانەی بەرەی شەڕی دەکەن. بۆی هەیە هەر ئەو رۆژە بچێ. دڵی لەبەر شڵەژان لێی دەدا.! هەیپەی لێکرد بۆ سەرکردایەتی.

سەرهەنگ، کاتێ پاکەتی زیوینی بۆ راگرت و فەرمووی جگەرەیەکی لێ کرد. گوتی:

-خۆت بۆ چوونە بەرەی شەڕ ئامادە کە. تا چەند رۆژێکی تر دەچیت. ئەمرۆ، دەمەوێ راپۆرتێك لەبارەی یەکەم دەستە دیلی سۆڤێتی بنووسی.

(ستانکۆڤ) بۆ (ترایان)ی روون کردەوە کە لۆتکەیەکی سۆڤیەتی لە دەریای رەش و لە نزیك (کۆنستانتزا)، نقووم کراوە. هێزی تایبەتی دەریاوانمان پەنجاو یەك دەریاوانیان نەجات داوەو بە دیلیان گرتوون. دیلەکان گوازراونەتەوە بۆ سەربازخانەیەکی سەر سنووری (بوخاریست). ئەمانە یەکەم دەستە دیلی سۆڤێتن.

سەرهەنگ (ستانکۆڤ) وەك ئەوەی خەریکی دەورگێڕان بێ لە فلیم، رەفتاری دەکرد. دەشێ ئەمە راهاتنی پیشەیی بێ. پازدە ساڵ بوو سەرۆکی سازمانێکی نهێنی بوو و راهاتبوو وەکوو پاڵەوانی چیرۆکی پۆلیسی رەفتار بکا. هیچ شتێکی سەربازی لە رەفتاردا نەبوو.

سەرهەنگ پرسی:

-ئایا دەتوانی ئێستا برۆی؟

(ترایان) دەیەویست داوای رێنمایی و زانیاری و وردەکاری تەواو بکا. بەڵام کاتی نەبوو. سەرهەنگ دەستی بۆ درێژ کردو هیوای کارێکی باشی بۆ خواست.

دوای سەعاتێك، سەیارەیەکی (بیوك)ی کەشخە لە (بوخاریست) دەرچوو، رووی کردە ئەو سەربازخانەی یەکەم دەستە دیلی سۆڤێتی

تێدا بوو. (ماتیزی) بە تەنێ سەفەری نەدەکرد. ترومبێلەکە دیلماجێك‌و وێنەگرێك‌و پەیامنێرێکی سینەمایی‌و لیخوڕەکەی تێدا بوو. هاوڕێکانی (ترایان)، هەموو جلی سەربازی تازەیان لەبەر بوو و نیشانەی زەردیان بە پیتی سەرەتایی (ر. ب – ڕاگەیاندن‌و بانگەشە)، لە سەر گیرفانی چاکەت، لە بەرۆك درابوو. (ماتیزی) جلی شکارچییانی کەژو کێوی لەبەرو و بێریەی فەروەی لەسەرو و پێڵاوی بەفرەخلیسکێی خۆی لە پێ بوو. تەنیا نیشانەی پەیامنێری جەنگی لە سەر چاکەتەکەی درابوو.

لێخوڕەکە پرسی:

-ئەرێ، ئەمڕۆ ئێوارێ دەگەڕێینەوە؟

(ماتیزی) گوتی:

-نازانم. سەرهەنگ چ دەستوورێکیداوە؟

لێخوڕەکە گوتی:

-(ستانکۆڤ) گوتی ئێمە لەبەر ئەمری تۆداین. تۆ دەبێ بڕیار بدەی چەند لێرە بمێنینەوە.

هەموو ئەوانەی لە ناو ترومبێلەکەدا بوون، لە (ماتیزی) بە تەمەنتر بوون. دیلماج، مامۆستایەکی قژ ماش‌و برنج بوو، پلەی یاریدەری یەکەمی هەبوو. وێنەگرەکە سەردەستە بوو. بەڵام (ماتیزی) پێی ناخۆش بوو بڕیار بە دەست بێ. ئەو، هەرگیز لە باتی خەڵکی تر بڕیاری نەدابوو. بە پێچەوانەوە، هەمیشە ئەو بوو دەستووری خەڵکی تری جێ بە جێ دەکرد. لە (ئیزڤۆر) فەرمانەکانی بابی‌و لە قوتابیخانە، فەرمانەکانی مامۆستاکانی‌و لە (بەشی ناوخۆ)، فەرمانەکانی بەڕیوەبەرو

لە رۆژنامە، فەرمانەکانی (بیسیۆلا)و لە عەسکەری، فەرمانەکانی سەردەستەی جێ بە جێ دەکرد. ئەمە یەکەمین جار بوو، دەبوایە بڕیار، نەك تەنیا بۆ خۆی، بەڵکو بۆ ئەوانەی تریش بدا.

(ترایان) گوتی:

-بزانم لە کاتی خۆیدا، چۆن دەبێ!

لە مێشکی خۆیدا ئەو پرسیارانەی ئامادە دەکرد کە دەیەویست بیان کا. ئەمە کارێکی دژوار نەبوو بۆ وی. لە دڵی خۆیدا گوتی: (دەتوانم چ لە مرۆی سۆڤێتی وەربگرم؟) (ترایان)،کاتێ لە (بێسارابی) بوو، لە کەناری راستەی (دنی یێستەر)، یەکسەر تەماشای کەنارەکەی تر، تەماشای وڵاتی داخراوی سۆڤێتی دەکرد. هەوڵی دەدا بە مەزەندە بزانێ خەڵکی کەنارەکەی دیکە چۆن دەژین. شادییان چییە؟چ رەنجێك دەکێشن! خەون بە چییەوە دەبینن؟ بەڵام هەرگیز ئەم شتانەی نەزانی. هەرچی لە وڵاتی سۆڤێت رادەبرا، نهێنی بوو، نهێنییەکی گەورە. سنووری نێوان سۆڤێتو دونیای تر داخرابوو. ئێستا دەیتوانی قسە لەگەڵ ئەو پیاوانە بکا کە لەو بەری رووبارەوە هاتبوونو دەیتوانی پێ بکەوێ ژیانیان لەو کۆمارە سوشیالیستو ئاڵۆزە چۆن چۆنییە؟ دەیتوانی تەنیا ئەوەندە بزانێو زیاتر نا. (ماتیزی) تەنیا لە رێگای کتێبەکانی (ئاندرێ ژید)و (ئاندرێ مالرۆ)و (لوی فەردینان سێلین)ەوە، رووسیای دەناسی. ئاگاداری بەرهەمەکانی دژە کۆمۆنیستەکانی پروپاگاندەی ئەلمانیایش بوو. ئێستا، بە چاوی خۆی دەبینێ (مرۆڤی نوێی

سۆڤێتی) بە ئێسک‌و پێستە، لـە چـی دەکـا؟ زۆری مـەراق بـوو. بـە کەلەجارِی بیری دەکردەوە: (ئایا ئـەم مرۆڤـە نوێیـە لـە خـەڵکی تـر بەختەوەرترە، یان بەدبەختتر؟) کاتێ ترومبێلەکـە چـووە نـاو حەوشـەی سەربازخانەی دیلەکان، (ماتیزی) لە دوورەوە دیلەکانی ناسـی. تاقمـە گەنجێك بوون، تەنیا دەرپێ قوتیان لەبەر بوو، بە رووت‌و قووتی لەبـەر هەتاو هەڵاژابوون. هەندێکی تر خۆیان دەشووشت. بە سەتڵ ئاویـان بـە سەری یەك دادەکرد. دەتگوت لە هەموو کونۆکەی لەشیانەوە چێژ لە ئاوو هەواو هەتاو وەردەگـرن. (ترایـان) یەکسـەر خـۆی گەیانـدە لای تاقمەکە، جگەرەی پێشکێش کردن. گەنجەکان جگـەرەیان وەرگـرت‌و بە نـەیاریی تەماشـایان کـرد. (ترایـان) هـەوڵی دا پەیوەنـدی رۆحـی‌و مرۆڤایەتییان لەگەڵ ببەستێ، بـەڵام هەوڵەکـەی بـە ناکـامی گەیشـت. لەگەڵ هەر جوولانەوەیـەکی سـۆڤێتییەکان، لەگـەڵ هـەر وەڵامێکـدا، دەتگوت دەڵێن: (ئێمە دیلـی تـۆین‌و تـۆ دوژمنـی ئێمـەی! گفتوگـۆی دۆستانەمان لە نێودا نـابێ!) شـەری شـەرگە لێـرەیش بـەردەوام بـوو. شەرەکە، بە سەرنج، بە وشە، بە جوولانەوە، شەرێکی نابەرابەر بـوو. (ماتیزی) تەنیا بوو، ئەو دیلانەی دەوریـان دابـوو پـەنجاو چـوار کـەس بوون. شێوەی کاری خۆی گۆری. تاك تـاك بـانگی کردنـە نووزگـەی سەربازخانە.

(ماتیزی) گوتی:

--حەز دەکەم شتێ لەبارەی ژیانی ئێوە، ژیانی مرۆڤایەتی کۆمۆنیست، بزانم. من شاعیرم. حەز لە شتی سیاسی‌و شتی سەربازیی ناکەم، حەز لە بارو دۆخی مرۆڤایەتی دونیای ئێوە دەکەم. بە راستی پێم بڵێن: ئایا ئێوە لە رووسییەی کۆمۆنیست بەختەوەرن؟

دیلەکە وەڵامی دایەوە:

-بەڵێ، بەختەوەرم.

(ترایان) تەماشای دورِ چاوی کرد. دیلەکە راستی دەکرد. درۆی نەدەکرد.

دیلەکە گوتی:

-لای ئێمە، مرۆڤ تەنیا نییە. کۆمەڵی ئێمە کۆمەڵێکی راست‌و دروستە. هەموومان بە بەختەوەری دەژین. بۆ نموونە، من، ماسیگرم لە دەریای ئازۆڤ. ئەگەر رۆژێ گەرداوم لێ هەڵبکاو بەلەم‌و کەرەستەکانم لە دەست بدەم، کولخوز، یەکسەر هی ترم دەداتێ. ئەگەر ماڵم بسووتێ، کۆمەڵ خانوویەکی ترم دەداتێ. لای ئێمە، ئەگەر ماسیگرێکی خیزان، بێ بەلەم‌و کەرەستە بێ ، هەر ئەوەندەی بۆ دەمێنێ کە خۆی فڕێ بداتە ناو دەریا. کەس بە هانایەوە نایە. لە کنە مە، بێکاری نییە. کۆمەڵی ئێمە مرۆڤ دەپارێزێ. خەڵکی زیڤار لە کۆمەڵی ناکۆمۆنیستیدا، دەبێتە پێڕانکی خەڵك‌و کەس پارێزگاریی ناکا. لەکنەنگۆ، مرۆڤ تەنیاو بێ پارێزگارە!!

(ماتیزی) بە وردی گوێی رادێرا بوو. خۆی، چەند مانگ بوو بێکار بوو. هەموو رۆژنامەو گشت دەزگاکانی راگەیاندن، رەتیان دەکردەوە دایبمەزرێنن. چونکە لە عەسکەری عاف نەکرابوو. ماوەیەکی زۆر بوو، ماوەیەکی زۆر زۆر بوو، (ترایان) هیچ پارەی نەبوو. نە بۆ جگەرە، نە بۆ ژەمێك، کەسیش بە هایانەوە نەدەهات.

دیلەکە گوتی:

-لە کۆمەڵی بورژوازیدا، تەنیا چینی سەرمایەدار سەفەر دەکەن. ل نك مە، جۆرێکی ترە. من کرێکارم، لەگەڵ ئەوەشدا، سەراپای رووسیا گەڕاوم، لەم سەرەوە بۆ ئەو سەر. گەشتم بۆ ناوچەی بەستەڵەکی باکوورو بۆ (کریمێ)و بۆ قەوقازو بۆ هەموو جێگایەك کردووە. لە گەورەترین شانۆ، ئامادەی کۆنسێرت بوویم. لە ولاتی ئێوەدا، کێ دەتوانێ شتی وا بکا؟ تەنیا دەوڵەمەندان! ئەوانەی دیکە هەموو رەنج دەبەن!

(ترایان) بیری کردەوە سەفەری بۆ هیچ شوێنێکی رۆمانیا نەکردووە. لەوەتی لە (بوخاریست)یش دەژی، قەت نەچۆتە شانۆ. چونکە سەعات حەفت، دەبێ لە رۆژنامە بێ. لە رۆژانی پشووی نۆێیل نەیتوانی بچێتەوە (ئیزڤۆر). (بیسۆلا) پێیگوت ئەگەر بۆ پشوو بچێتەوە، دەری دەکا.

دیلەکە گوتی:

-ئەو رۆژەی زەماوەندم کرد، وارخانەیەکی بە ناوماڵەوەم وەرگرت. وارخانەکە هەموو پێویستییەکی تێدابوو.

(ترايان) پرسی:

-ئایا لە ژیانی ماڵەوە بەختەوەری؟ ئایا لەگەڵ ژنەکەت تەواو تەباو تفاقن؟

- ژنەکانمان هاوڕێی راستەقینەمانن. ئەوە سێ ساڵە، من لە ماڵەوە دەرچوویم، ژنەکەم وەفادارە بۆم. ژنانی سۆڤێت ئاوهان. هەموو وەفادارو هاوڕێی باشن.

(ترایان) گوتی:

- بەڵام تۆ ناتوانی دڵنیا بی کە ژنەکەت وەفادارە بۆت! ئەستەمە لە شتێ دڵنیا بی کە نەتوانی ساغی بکەیتەوەو خۆت نەتدیبێ. تۆ دەڵێی سێ ساڵە لە ماڵەوە دەرچووی. نازانی لە ماڵەوەتان چ رادەبرێ؟

دیلەکە وەڵامی دایەوە کە ژنەکەی بەردەوام نامەی بۆ دەنووسێ‌و بەستەی بۆ رەوانە دەکا. کەواتە وەفادارە بۆی. ژنەکەی هاوڕێی خۆیەتی‌و و چاوەڕێی دەکا.

(ماتیزی) گوتی:

-ئەوەندە بەس نییە بۆ سەلماندنی وەفاداریی ژن. ژن دەتوانێ بەردەوام نامەت بۆ بنووسێ‌و وەفاداریش نەبێ بۆت.

دیلەکە وەڵامی دایەوە:

- هەڵبەت، ژنەکەم بەزمی دڵداریی هەیە، ئەمە شتێکی سروشتییە بۆ ژنی جحێڵ. تەنانەت پێیدەگوترێ کە بەزمی دڵداری هەبێ، بەڵام ئەمە هیچ لە وەفاداریی ناگۆڕێ.

(ماتیزی) پرسی:

– تۆ خانەگومان نیت؟

دیلەکە گوتی:

–خانەگومانی، بڕیاری کوێرانەیە! کۆمەڵی ئێمە بڕیاری کوێرانەی نییە.

(ترایان) چاوی لەسەر دیلەکە هەڵنەگرت. دیتی کە مرۆڤی سۆڤێتی، ئەو دیلەی بەردەمی ، درۆ ناکا. راستی دەڵێ.. نازانێ خانەگومانی چییە. . هەست بە خانەگومانی ناکا. کە ژنەکەی بەزمی دڵداریی هەبێ. ئەمەی بەلاوە ئاسایی‌و جێی رێزە.

گفت‌وگۆی لەگەڵ دیلەکانی تریش بە هەمان چەشن بوو. هەموو هەمان وەڵامیان دایەوە.

(ماتیزی)، لە رێگای گەڕانەوەی بۆ (خاریست)دا، گفت‌وگۆکانی پوخت کردەوە. یەك شت هەبور، دیارو ئاشکرابوو: دەریاوانانی گەنجی سۆڤێتی نەیاندەزانی کەلکەڵەی هەبوونی شت چییە؟ هیچ موڵکی تایبەتی خۆیان نەبوو. هەستیان بە پێویستی ژیانی خۆیان نەدەکرد. نەیاندەزانی خانەگومانی چییە. ترسی خواو نیگەرانی میتافیزیکییان نەبوو. بە راستی، مرۆڤی نوێ بوون. (ماتیزی)، بەم دواییە، لە زانکۆ، وەك ئەرکی کۆمەڵناسی، بابەتێکی لەسەر (ئالفرێد ڤەبەر)ی فەیلەسووفی ئەلمانی پێشکەش کردبوو کە بەم جۆرە باسی مرۆڤی ئاییندە دەکا: (مرۆڤێکی سارد، زانستی، بێ بڕیاری پێشەکی، بێ خودا، بێ ترس، بێ ئەشق، بێ رق‌و بێ ئێرەیییە!). (ئالفرێد ڤەبەر) ئەم مرۆڤە زانستییەی ناو ناوە (دێر ڤیێر مان – مرۆڤی چوارەم). (ماتیزی) لە دڵی خۆیدا گوتی: (مرۆڤی چوارەم)، پشك لە مرۆڤی (سۆڤێتی) دەکا.

ئەو شەوە، ماوەیەکی زۆر، تا شەو راشکاو زرنگایەوە، لە (بەشی ناوخۆ)دا، بە ئەمانەتەوە نووسی. چی دیلە سۆڤێتییەکان گوتبوویان هەمووی نووسییەوە. رۆژی پاشی، کە لاپەڕە دەستنووسەکانی لەسەر مێزی سەرهەنگ دانا، نەختێ ترسا. ئاخر نەختێ بە پەسەندی باسی ئەو مرۆڤە نوێیە، (مرۆڤی چوارەم)، مرۆڤی زانستی، مرۆڤی سۆڤێتی، کردبوو.

سەرهەنگ (ستانکۆڤ) بە وردی خوێندییەوە.

(ستانکۆف) گوتی:

–ئافەرین (ماتیزی)! من پێویستم بەم جۆرە ریپۆرتاجەیە. ریپۆرتاجی تۆ بێ وێنەیە!! پڕوپاگاندەی گەمژانەی دژە سۆڤێتی نییە وەکوو هی ئەلمانەکان. ئافەرین! نابێ یەك وشەی بگۆڕێ. ریپۆرتاجێکی بێ وێنەیە! تۆ زۆر باش باسی مرۆڤی بێ دڵ، بێ خودا، بێ هەستو نەست، مرۆڤی (میکانیك)ت کردووە. بە راستی باشت شی کردۆتەوە! ها، جگەرەیەك هەڵگرە! من تەنیا پێشەکییەکی کورتی بۆ دەنووسم. باس دەکەم ئەمە نموونەی کومیسەرێکی سیاسی سۆڤێتییە. بۆ ئەوەی خوێنەران وا نەزانن ئەمە مرۆڤێکی ئاسایی سۆڤێتییە. لە رووسیادا، چەند سەد هەزار نموونەی وەکوو ئەو کوڕانە هەیە کە تۆ باست کردوونو لە گوتارەکەتدا، وەسفت کردوون. ئەمانە کومیسەری سیاسی، پۆلیس، دەریاوانانو لە چینی تایبەتی رووسیان. ئەم چەند سەد هەزار کەسە دوو سەد ملیۆن رووسیایان تووشی ترسو تۆقان کردووە.

ئەم درندانە هەموو شتێکی باشیان بۆخۆیان قۆرخ کردووە. ئەوانە تەنیا یەك ئەرکیان هەیە: دڵیان نەبێ! تەنیا ئەوەندەو بەس: دڵیان نەبێ!

(ترایان) ویستی دان بە راستی دا بنێ. ئەو پێی وابوو ئەو مرۆڤە زانستیی‌و بێ هەست‌و نەستەی لە سەربازخانە چاوی پێکەوتبوو، مرۆیەکی چینی ناوەنجی سۆڤیێتی بوو. تەفرەی خواردبوو. مەزەندەی نەکردبوو، کە کەسانی بەرزی یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستەکانی سۆڤیێتین، سەراپای میللەتیان تۆقاندووە.

سەرهەنگ گوتی:

-دووسەد ملیۆن رووس هەست‌و نەستیان هەیە، دڵیان هەیە. گەلی رووس دڵی هەیە، رۆندکی هەیە. لە ژێر زەبری کومیسرەکانی وەکو ئەوانەی تۆ چاوپێکەوتنت لە تەك کردوون، دەگرین، لێیان دەدرێ. تەنیا کومیسەری سیاسیی ڤرمێسکی نییە. دوو سەد ملیۆن رووس ئەسرینیان هەیە. رووباری رۆندکیان هەیە کە بە بێ وەستان لەبەریان دەڕوا.

سەرهەنگ (ستالکۆف) بە ئاوازێکی دیکە بەردەوام بوو:

- سبەی راپۆرتێکی تر ئامادە دەکەی. ئەمشەو، یەکەم دەستە سەربازی رۆمانی بە فرۆکە دێن کە لە شەڕەکانی رزگاری (بێسارابی) بریندار بوونە. سۆزی، برۆ نەخۆشخانەی سەربازی. شتێکی گەرم‌و شاعیرانەم لەم بارەیەوە بۆ بنووسە! ئەمانە یەکەمین پاڵەوانانی جەنگی رزگاریخوازی ئێمەن.

# (١٢)

(ترايان)، لە نەخۆشخانەی سەربازی چووە ژووری دوو پاڵەوانەکە. وێنەگرو فلیمسازەکان بە دوویدا چوونە ژوورەوە. پاڵەوانەکان لادێیی گەنجی هاوزێی (ترایان) بوون، کراسی سپیان لەبەر بوو. ژوورەکەیان پڕ بوو لە گوڵ، لە قوتووی چوکلاتو لە دیاری. ئەمانە ئەستێرەی جەنگ بوون. یەکەمین سەربازانی رۆمانی بوون وەکوو رزگارکەر چووبوونە ناو خاکی (بێسارابی).

(ترایان)، لە بەینی تەختی دوو پاڵەوانەکە، لەسەر کورسییەك دانیشت. ئەمانە سەر بە دەستەیەکی پێشەنگ بوون. ئەوانە، هەر یەکسەر دوای راگەیاندنی جەنگی رزگاری خوازی، چووبوونە ناوچەی (بێسارابی). یەك سەعات بە تاریکی چووبوونە پێش. لەگەڵ شەش هاورێی تری خۆیان زەوییەکی دووریان گرتبوو. یەکەمین زەوی (بێسارابی). لە شەڕدا بریندار ببوون. تا سپێدەدەم، لەناو زەوییە رزگارکراوەکە مابوونەوە. ئەوسا تیپەکەیان گەیشتبوو و لەوێ دەری هێنابوون. ئینجا بە فڕۆکەی تەندروستی، گوازرابوونەوە بۆ (بوخاریست)، ئیتر نیشانە

پێدانو ئافەرین کردنو دەربڕینی شەوقو شـادی. ئێسـتایش نووسـینی گوتار بۆ رۆژنامەکانو وێنەگرتنو فلیم ساز کردن!!

(ترایان) پرسی:

-کە یەکەم جار پێتان نایە سەر خاکی نیشتمانی ئازادکراو، هەستتان بە چی کرد؟ هەستان نەکرد خاکی رزگارکراو لە ژێر پێتان گەرمو داغـە؟ هەستتان نەکرد هەموو دارو درەختو هەموو قانـە گیـاوگوڵێو هـەموو مستە خاکێك چاوەڕێتان دەکا؟ ئەو هەستە بەرزەتان هەبوو. وا نییە؟

پاڵەوانـەکان وەڵامیـان دایـەوە کـە زەوی ئەوبـەریش وەکـوو خـاکی ئازادی کەناری دەستەراستی (پروت) وا بوو. ئەو جێگایەی سێ مـانگ پێش راگەیانـدنی جـەنگ، سـەربازگەیان لێ دامەزرانـدبوو. ئەمانـە بـە راستی یەکەمین سەربازی رزگارکەر بوون. خوێنی ئەوانە یەکەم خـوێن بوو لـە پێناوی رزگاری رەشـەخاکی (بێسـارابی) رژابـوو. بـەڵام هـیچ رووداوی سەرنجکێشیان نەدیبوو. تەنیا چوونە پێشەوە بوو لـە تـاریکیو لـە ناو قوڕو زێلاقدا.

گوتیان:

-ئێمە بە تاریکی تەقەمان لـەو لایە دەکرد کە دەمانزانی دوژمنی لێیە.

ئەوان دوژمنیان نەدەبینی. تەقەیان بە تاریکییەوە دەنا. دوژمنیش ئـەوانی نەدەدی. دوژمنیش تەقەیان بە تاریکییەوە دەنا. ئەو کەسانەیان نـەدیبوو کـە برینـداریان کردبـوون. ئەوانـەی ئەمانەیشـیان برینـدار کردبـوو، ئەمانەیان نەدیبوو. یەکـەم دەسـتەی چـوونە (بێسـارابی)، شـەڕەکەیان

سواو، نارێكو بێ پلانو گەلۆرانە بوو. هەموو شتێ لە یەك تاکە دیمەن چڕبووەوە: هەشت پیاو، چەندەها کیلۆمەتر، لەسەر سینگ، یان لەسەر چۆك، لەناو قوڕو زێلاقدا چووبوونە پێش بۆ ئەوەی بچنە ئەو زەوییەی سەربازانی بێگانەی تێدا بوو. بەڵام بەر لەوەی ئەوان بگەنە سەر زەوییەکە، دوژمنان ڕۆیشتبوون. جەلیکانی بەتاڵو سندووقی بۆشی فیشەكو قووتی ژەنگاوی خواردنیان جێ هێشتبوو. ئەوەندەو هیچی تر. (ترایان) باوەڕی نەدەکرد شەڕی ڕزگاری تەنیا ئەوەندە بێ. دەبێ شتی تری تێدا بێ. کەهاڵ بوو هەر ئەمە بێ. پرسیاری بێژماری لە دوو پاڵەوانەکە کرد.

ئەوەی لە هەموو شتێ زیاتر کاری لێکردبوون، نە جەنگ بوو، نە شەڕو هەنگامە بوو ، نە چوونە پێش بوو لە خاکی ڕزگارکراودا، بەڵکو ئەو پێشوازییە بوو کە لە گەڕانەوەدا لێیان کرابوو. پۆپەی شتەکە ئەمە بوو: خانمانی چینە بەرزەکانی کۆمەڵ ژنانی ژەنەراڵو وەزیرەکان، بە جلی خوشکانی خێرخواز دەهاتن، گوڵو چوکلاتیان بۆ دەهێنانو بە ڕوویان پێدەکەنین. ئەمە دڵبزوێنترین شت بوو بەلایانەوە. ئەوەی لە کاتی شەڕدا، لەوێ ڕووی دابوو، بە لایانەوە شتێکی سواوو ئاسایی بوو.

(ماتیزی) گوتی:

-بەڵام دەبێ شتێ هەبێ لەو ناوچە ئازادکراوەیەدا بە شێوەیەکی تایبەتی کاری لە ئێوە کردبێ؟ هوون یەکەمین کەس بوون پێتان نایە سەر

خاكی (بێسارابی)و تا سپێدەدەم لەوێ مانەوە. چ شتێ لە هەمووی زیاتر كاری لێ كردن؟ كەهالە شتێكی تایبەتیان نەدیبێ.

پاڵەوانەكان گوتیان:

-هیچ شتێكی تایبەتی نەبوو. هەموو شتێمكان بۆ باس كردی. ئەوەی لە هەموو شتێ زیاتر كاری لە ئێمە كرد، ئەو هەموو پەنیرەیە بوو كە رووسەكان هەیانە. رووسەكان پەنیریان زۆرە. لەو زەوییەی پاكمان كردەوە،، لانی كەم دە برمیل پەنیریان جێ هێشتبوو. ئێمە دوژمنی خوێنینی كۆمۆنیستەكانین. بەڵام دەبێ دان پێدا بنێین كە زۆریان پەنیر هەیە.

(ترایان) ئەو شەوە، هەرچەندە لە خەفەتان بە هیلاك چووبوو، لە (بەشی ناوخۆ)دا، ریپۆرتاجی لە بارەی یەكەمین پاڵەوانان نووسی. دوو سەربازەكە تەنیا زەوییەكیان لە ناوچەی رزگاركراودا دیبوو. ئەویش یەك عەنبار پەنیری لەشكری دوژمنی تێدا بوو. ئەوەندەو بەس! ئەو وێنەیەی لە بارەی سۆڤێتەكان وەریان گرتبوو تەنیا ئەوە بوو كە بە چاو دیبوویان! (ماتیزی) سوێندی خوارد هەرگیز نەكەوێتە هەڵەی ئەو سەربازانەوە. مرۆڤ، لە دونیاو لەو رووداوانەی دەیانبینێ، بە چاوی خۆی لە دەوروبەری خۆی دەیانبینێ، وێنەیەك بۆ خۆی دروست دەكا. بەڵام مرۆڤ، كورتبینە وەك كورتبینی ئەو دوو سەربازە برینداردەی سەر قەرەوێڵە كە لە خاكی رزگاركراودا، تەنیا بەرمیلە پەنیریان دیبوو و تەنیا وێنەیەكی رووسیای پڕ بەرمیلە پەنیریان لە مێشكدا بوو.

کەواتـە، مـاتیزی) بـە سـۆترین دۆزینـەوەی پیشـەی رۆژنامەنووسـی کردبوو. رۆژنامەنووسیی راستەقینە تەنیا باسی ئەو شتالە دەکـا کـە بـە چاو دەیـانبینیّ. بـەلاّم مـەودای بینینـی پـەیامنیّر کورتـە. وەك ئـەوەی مەودای بینینی دوو سەربازەکە کورت بـوو. هـەر ئەوەنـدە بـەس نییـە ئەوەی دیوتە، باسی بکەی، هەندیّ جار دەشیّ باس کردنی ئـەو شـتەی بە چاو دیوتە، هەلّەیەکی ترسناك بیّ. ئەگەر تەنانەت چـاوی خۆیشـت شایەتیّکی دروستو راستگۆ نەبیّ، ئەی کیّ دەتـوانیّ شـایەتی راسـتگۆ بیّ.؟ (ماتیزی)، بیری لـە دوو پالّەوانەکە کردەوە، پەی بـە بەسـەرهاتی جـەرگبڕی شـایەتەکان بـرد کـە هـەمان رووداوی جـەرگبڕی رۆژنامەنووسە. لای سەرهەنگ (ستانکۆڤ)، دانی بە نیگەرانی خۆی دا نا.

-دوو سەربازەکە چی دیویانە باسیان کـردووە. بـە راسـتگۆیی باسـیان کردووە. ئەم ویّنەیـەیان لـە بـارەی رووسـەکانەوە گرتـووەو لـەگـەلّ خۆیانی دەبەنە ناو گۆڕ. ئەو سەربازانەی رۆژی سـیّیەم چـوونەتە سـەر زەوییەکە، یەك بەرمیلە پەنیریان نەدیوە! ویّنەکـەی ئـەوانیش دروسـتە! هیچ ریپۆرتاج، یان شایەتیی، راست نییە. بـۆ ئـەوەی پـاو شـایەتییەکی دروست لە بارەی جەنگەوە وەربگریّ، دەبیّ بتـوانیّ لـە یـەك کاتـدا، هەموو شتیّ ببینیّ. نەك تەنیا یەك لای بەرەی شەڕ. هەموو شەڕیّك دوو بەرەی هەیە: تەنیا خودا، لـە یەك کاتدا، لـە هەموو جیّگایەکە. تەنیا ئەو دەتوانیّ ویّنەیەکی دروست، راپـۆرتیّکی دروسـت بـدا. پـەیامنیّر تـەنیا دەتوانیّ لـە سنووری توانای مرۆڤدا، واتە توانای زاتیو پاژەییو کاتیدا،

وێنەیەکی جەنگ پێشان بدا. ئەوەی تۆ، وەکوو پەیامنێر، دەتوانی بیکەی، کارێکی مرۆڤانەیە. رۆژنامەنووس هەر تەنیا ئەوەندەی پێ دەکرێ. شایەت هەر تەنیا ئەوەندەی بۆ دەکرێ. مرۆڤ هەر تەنیا ئەوەندەی بۆ دەکرێ. هەر ئەوەندەی بۆ دەکرێ مرۆڤانە بێ!، ئەستەمە بتوانێ بە تەواوی راست بێ. راستیی شتێکی تایبەتە بە خوداو بەس!.

(ترایان) داوای کرد روخسەتی بدەن، بە تاقی تەنێ، بچێتە بەرەی شەڕو ئازاد بێ بۆ هەر کوێ بچێ، لەم سەری بەرەی شەڕەوە بۆ ئەو سەر. سەرهەنگ رازی بوو.

(ستانکۆف) گوتی:

–سبەی بەیانی، بە فڕۆکە دەچی! لە (یاسی)، لە بارەگای سەرکردایەتی گەورەمان دادەبەزی. لەوێوە دەچیتە بەرەی شەڕ. تا حەز کەی لەوێ دەمێنیتەوەو هەر کوێت بوێ، دەچی! بەلاّم لەبیر نەکەی ئەگەر پەیامنێر نەشتوانێ راست بێ، دەتوانێ مرۆڤ بێ!

ئەمە یەکەم جار بوو (ترایان) سواری فڕۆکە ببێ. فڕۆکەکە فڕۆکەیەکی سەربازی بوو. (ترایان) تاکە نەفەری فڕۆکەکە بوو. کە لە (یاسی)

# (١٣)

شاری (یاسی) لە کەش‌و هەوای جەنگدا نقووم ببوو. بەرەی شەڕ چەند دەرزنە کیلۆمەترێك لەویٚ دوور بوو. جادەکان پڕ بوون لە دەوریــەی چەکدار کە بە هەنگاوی رێك دەڕۆیشتن . شەوێکی تاریك‌و کلکەچەم بوو. لە ســەرکردایەتی گــەورەدا، ئەفســەران لــە لوقنتــەی ســەربازان دەهاتنە دەرەوە. (ترایان)، لە (تیتۆس)ی برادەری (بوخاریست)ی خۆی راست هات، جلی جێگری ئەفسەری لەبەر بوو.

تیتۆس گوتی:

-ماقوولٚ نییە بچیتە میوانخانە. من وارخانەیەکی چوار ژووریم هەس. ئەم شەو دەبیٚ لە ماڵی من برازێی!

(تیتۆس) خوێندنی زانکۆی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان تــەواو کردبــوو. چــاوەڕێی دەکــرد کورســییەکی مامۆســتایەتی بــە دەســت بێنــیٚ، رۆژنامەنووسیی دەکرد. (ترایان)، لە بارەگــای (رۆمــانی)، ئاشــنایەتی لەگەڵ پەیداکردبوو. ببوون بــە بــرادەری گیــانی بــە گیــانی. (تیتــۆس)

کراسی حەریری لەبەر دەکردو قاتی لە لەندەن بە رادان دەدا. ئێستا، لە بەشی راگەیاندن خزمەتی دەکرد. جلی سەربازیی جێگری ئەفسەری لەبەر دەکرد کە وەکوو جلی مەدەنی پۆشتەو پەرداخ بوو. (ترایان) پێیگوت بەیانی، دەبێ بچێتە بەرەی شەڕو نیگەرانی پەیداکردنی ترومبێلێکە. سەرکردایەتی گەورەی جەنگی، تەنیا ئەفسەری پلە بەرزی تێدا بوون، بچووکترینیان ئەفسەری پلە یەك بوو. (تیتۆس) شایی پێدەهات کە ناوی بۆ فەرماندەیی هاتۆتەوە. هەرچەند ئەفسەری جیرەو تەنیا جێگری ئەفسەر بوو و بەس.

ئەو شەوە، (تیتۆس) رەفتاری لە هەموو کاتێ دۆستانەتر بوو. (ماتیزی) بە راستی بەو دیدارە شاد بوو. بە یەکەوە لە وارخانەی پڕ ناومالّی (تیتۆس) بوون. هێمانی گەیشتنە جێ، (تیتۆس)، جگەرەو خواردنی قوتوو و نانۆکەی پێشکێش (ترایان) کرد. ئینجا چای لێنا. دیار بوو (تیتۆس) کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەو دەسەلاتە تایبەتییەی بە (ترایان) درابوو کە روخسەتی درابوو، بە ئازادی، بە سەرانسەری بەرەی شەڕدا بگەڕێ. کە (ترایان) نانی خوارد، (تیتۆس) جانتای تەوالیتی خۆی هێناو گوتی:

– ببوورە. دەبێ ریشم بتاشم. من هەمیشە شەو ردێنم دەتاشم. بەیانیان، زۆرم خەو دێ!

(تیتۆس)، بەر لەوەی ریشی بتاشێ، مەکینەی تراشی پێشانی(ترایان) دا.

جێگری ئەفسەر گوتی:

-ئەمە مەکینەی تراشی ئەمریکییە. لە بازاڕ دەست ناکەوێ. بە تایبەتی بۆ سوپا دروست کراوە. هەر سەربازێك، کە ڕۆژی یەکەم جلی سەربازی دەکاتە بەر، تاقمێکی خۆڕا دەدەنێ.

(ترایان ماتیزی)، لە تاقمە تراشەکە ورد بووەوە. بەڵام خەوی دەهات. حەزی دەکرد یەکسەر بخەوێ.

جێگری ئەفسەر گوتی:

-ئەمە مەکینەیەکی تراشی زۆر باشە!! تۆ ئەم شەو ریشت ناتاشی؟ شەو ریشت بتاشی لە بەیانی باشترە. بە تایبەتی هەکە بەیانی زوو بڕۆی!

(ترایان) ڕەتی کردەوە. برادەرەکەی پاملێی کرد. ئاخیری، (ماتیزی)یش، لەبەر دڵی برادەرەکەی، ریشی خۆی بە مەکینەی تەراشی ئەمریکی تاشی.

(تیتۆس) پرسی:

-ناپرسی من ئەم مەکینەیەم چۆن دەست کەوت؟ پێمگوتی لە بازاڕ دەست ناکەوێ.

(ترایان)، بێ ئەوەی بیر بکاتەوەو زیاتر بۆ ئەوەی کۆتایی بە باسەکە بێنێ‌و بچێ بخەوێ، وەڵامی دایەوە:

-تۆ هەمیشە بە منت گوتووە مرۆڤی جوامێر هەرگیز پرسیار ناکا...

(تیتۆس)، بە وای تەمسەریی (ترایان)، کە تەنیا بیری لە خەوو بەرەی بەرگری دەکردەوە، نارەحەت ببوو. گوتی:

-(ترایان) دەمەوێ پرسیارێکت لێ بکەم. زۆر بە راستگۆیی وەڵامم بدەوە. ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جەنگ لە دژی رۆمانیا رابگەیەنێ، ئایا تۆ لە دژی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەجەنگی؟

(ماتیزی) گوتی:

-ئایا یەك رۆمانی هەیە لە دژی کۆمۆنیستەکانو ئەو کەسانە نەجەنگێ کە یارمەتی کۆمۆنیستەکان دەدەن وڵاتەکەمان داگیر بکەن؟ بە چاوی خۆم دەیان هەزار داواو داخوازیم دیوە بۆ ئەوەی خۆبەخشانە بێنە عەسکەریو بەشداری ئەم جەنگە ئازادیخوازە بکەن. هەموو رۆمانییەکان بەشداری شەڕی دژی داگیران دەکەن تەنانەت پیرەمێردو بگرە نەخۆشو هەتا ئەوانەی زۆر گەنجیشن داوا دەکەن وەکوو خۆبەخش لە عەسکەری وەربگیرێن. ئەمە شەڕی رزگارییە، شەڕە لە دژی داگیرکەری بێگانە. هەزار نەفەرێکی کۆمۆنیستی لێ دەرچێ، هەموو خەڵکی وڵات بەشداری تێدا دەکەن. لەوەتی جەنگ راگەیەنراوە، تەنانەت یەك حاڵەتی راکردن لە خزمەت، یان یەك خیانەت نەبووە. منیش بەشداری تێدا دەکەم، بە بڕواو لە ناخی دڵەوە بەشداری تێدا دەکەم.

(تیتۆس) کەرەستەی تەراشی ئەمریکی هەڵگرتو لە ناو جانتای خاکی خۆی نایەوە. گوتی:

-من خۆم رکم لە (بۆش)ەکان دەبێتەوە. تۆ رکت لێ نابنەوە؟

(ماتیزی) گوتی:

-ئێمە لە دژی داگیرکەرانی ولاتەکەمان دەجەنگین. ئەلمانەکان یارمەتیمان دەدەن ئەو ناوچانە رزگار بکەین کە رووسەکان داگیریان کردووە. زۆر گرنگ نییە خۆشمان بوێن، یان رقمان لێ بن!! ئەوان لە شەڕی رزگاریمان یارمەتیمان دەدەن.

(تیتۆس) شەوق و گوڕاحی پێشووی نەما. ژووری خەوتنی نیشانی (ترایان) دا. ژوورەکە پڕ مۆبیلی کۆن بوو.

(تیتۆس) گوتی:

-ئەمە وارخانەی ماڵە جوولەکەیەکە ئەلمانەکان سوڕگومیان کردووە.

(ماتیزی) چاوی زەق بووەوە. خەوی رەویەوە. ویستی روون کردنەوەی زیاتر لەبارەی خاوەنانی خانووەکە وەربگرێ.

پێش چەند حەفتەیەك، دمگۆ بلاو بووەوە کە ئەلمانەکان چەند خێزانێکی جوولەکەی خەڵکی (یاسی)یان سوڕگوم کردووە. بەلام کەس شتەکەی بە وردی نەدەزانی. سەرەنجام، (ترایان) ئەم دەرفەتەی دەست کەوت بۆ ئەوەی شتێ لەبارەی بابەتەکەوە بزانێ. سەدەها برادەری جووی لە (بوخاریست) هەبوو ، هیچێکیان سوڕگوم نەکرابوون. بە لایەوە سەیر بوو لە (یاسی)دا، سوڕگومی بووە.

(تیتۆس) گوتی:

-هیوای شەوێکی خۆشت بۆ دەخوازم!

هەستی بە مەراقی (ماتیزی) کردبوو. خێرا، لە ژوورەکە چووە دەرەوەو دەرگای داخست تا ناچار نەبێ وەلامی هەموو پرسیارەکانی بداتەوە.

(ترایان) بەمە ناڕەحەت بوو. لەسەر کورسییەك دانیشت تەماشای مۆبیلەکانی کرد کە جوولەکە دوورخراوەکان جێیان هێشتبوو. ئەوەندە شەکەت بوو، لەسەر کورسییەکە خەوی لێکەوت.

کە بە خەبەر هات، سەعات سێی بەیانی بوو. بە هەموو جلی بەرییەوە لەسەر چوارپاکە راکشا. تا (تیتوس) دەستی لە شانی نەدا، بە خەبەر نەهات. سەعات حەفت بوو. (تیتۆس) جلی کردبووە بەر، لە دەسك دا بوو بۆ ئەوەی بڕوا.

جێگری ئەفسەر گوتی:

--قاوەکەتم لە هۆلی نانخواردن داناوە. من دەبێ بچمە دایەرە. دواکەوتووم.

(ماتیزی) هەستایەوە. دەستی برادەرکەی گوشی. سوپاسی ئەو میوانپەروەرییەی کرد.

(تیتۆس) گوتی:

-ئەگەر ئەمڕۆ بەیانی لە (یاسی) مایتەوە. لە دایەرە سەرم لێبدە.

(ماتیزی) وەڵامی دایەوە:

-با بۆ جارێکی تر بێ! بێ سوو ئەمڕۆ بەیانی، دەبێ بڕۆم! لەگەڵ یەکەم ترەمپا، یان لەگەڵ یەکەم کاروان دەڕۆم. دەبێ هەر ئەمڕۆ بگەمە

## (١٤)

سەفەری (ترایان) بەرەو بەرەی شەڕ، نوقلانەیەکی خێر بوو.

سەعات نۆی بەیانی، لە سەرکردایەتی گشتیدا، بە ترومبێلی ژەنەرال (تۆپۆر) ، بە ڕێ کەوت. ژەنەرال فەرماندەی گشتی بوو، واتە سەرۆکی دادگاو پۆلیسی سەرانسەری ناوچەی جەنگی بوو. ترومبێلەکە لیموزینێکی ڕەش و جوان بوو. ژەنەراڵ بۆ پشکنینی بەرەی شەڕ دەچوو. (ماتیزی) لە تەك لیخورەکە سوار بوو. کولە پشتەکەی لەبەر پێی خۆی دانا. (ماتیزی) دەیتوانی زۆر شت لە ژەنەرال وەربگرێ. بەڵام ژەنەرال هێمانی سواری تڕومبێل بوو، چاوی نوقاند. (ترایان) لە ئاوێنەدا تەماشای دەکرد، دیتی ژەنەرال خەوتووە. ژەنەرال خۆی لەسەر کورسی پشتەوە گرمۆڵە کردبوو. پیاوێکی بە تەمەن و تێکسمراو بوو. چەکمەیەکی چەرمی بریقەداری دە پێدا بوو. (ماتیزی) ویستی جگەرەیەك پێ بکا.

لێخوڕەکە گوتی:

-ژەنەراڵ ڕێ نادا جگەرە لە ناو ترومبێلەکەی بکێشن.

(ترايان) پاكـەتی جگـەرەی نایـەوە گیرفـانی. ترومبێلەكـە، نیشـانەی فەرماندەی گشتی پێوە بـوو، لـەناو كـەش و هـەوای جەنگـدا، بـەرەو (بێسارابی) ملی دەنا. لۆری سووتاوو تانكی شكاوو چەكی بـە جێمـاو لـە رۆخ رێگادا، دەكەوتنە بەرچاو. كە لـە (پروت) پەڕینـەوە، (ترایـان) لـەو ناوچەیەی رۆمانیا، كە چەند رۆژێك بوو رزگار كرابـوو، نـە هـیچ بنیـادەمی بینـیو نـە هـیچ گیانـدار. گونـدەكان چـۆڵو هـۆڵ بـوون. هەندێكیان سووتابوون. ئەو جێگایەی شەڕی لێكرابوو كـاولو كامبـاخ بوو، رەنگی دووكەڵی گرتبوو. جادەكـان چـۆڵ بـوون. نـە لۆرییـەك دەهات، نە عارەبانەیەكو نە رێدارێك. لـە هەندێ جێگادا، بۆمبا جادەی هەڵدڕی بوو. لێخورەكـە لــە قـۆرتی تەقینـەوەكان دوور دەكەوتـەوە. لەگەڵ تاسەیەكی ترومبێلـەكەدا، ژەنەرال چاوی كردەوە.

ژەنەرال بە گاڵتەجاڕی پرسی:

-دەتەوێ بە تەنیا شەڕ بكەی؟ هەر تەنیا بۆ خۆت؟

(ماتیزی) گوتی:

ئەگەر بە دەستەیەك ببەسرێمەوە، ناتوانم هـەموو شـتێ ببیـنم. نـاكرێ دیمەنی گشتی وەربگرم. گەورەترین سەركەوتنی من ئەوەیـە، دەسـەڵاتم وەرگرتووە بە ئازادی، بچمە هەموو جێیەك.

-هـیچ كـەس نـاتوانێ هـەر خـۆی سـەربەخۆ بجـەنگێ. تـۆ دەبـێ بـە دەستەیەكەوە پەیوەست بی.

(ماتیزی) دەیزانی سەرباز نابیّ قسە لە قسەی ژەنەرال بکا. بیّدەنگ بوو، بەلاّم دوای کەمیّ بیّدەنگی، پرسی:

- ژەنەرال تکایە لە دەردۆکیم ببوورە: ئایا راستە جوولەکە، لە (یاسی)، سورگومکراون؟

ژەنەرال گوتی:

-هەرگیز کەس لە رۆمانیا سورِگوم نەکراوە. ئەگەر بروا بە قسەی رادیۆی مۆسکۆ، یان لەندەن بکەین، دەبیّ رۆخ جادەکان هەمووی کەلەخ بیّو هەموو رۆژیّ جوو بکوژریّن. ئایا تۆ یەك جوولەکە دەناسی سورِگوم کرابیّ؟ یەك جوولەکە دەناسی کوژرابیّ؟ تۆ دەسەلاّتت هەیە بە ئازادی لە هەموو جیّگایەك بسوورِییتەوە. پیّم بلّیّ بزانم : ئایا تا ئیّستا دیوتە هیچ تاوانیّك بەرامبەر جوولەکەکان کرابیّ؟

(ماتیزی) گوتی:

-من تەنیا یەك شەو لە (یاسی) بوویم. لە مالّی برادەریّکم بووم، ئەفسەرە لە سەرکردایەتی گەورە. ئەو وارخانەیەی تیّدایە، بینا بە قسەی خۆی، پیّشتر هی جوولەکەیەکی سورِگومکراو بووە.

ژەنەرال گوتی:

-دەبوایە دەستوور بدەم دەستگیرت بکەنو بە تاوانی بلاّوکردنەوەی دەنگو باسی درۆ، رەوانەی دادگای سەربازیت بکەن. لە باتی ئەوەی

لێگەڕێم لە بەرەی شەڕدا بگەڕێی، دەبوایە فەرمانی دەستگیرکرانت دەربکەم...

ژەنەراڵ دەنگی توند بوو. (ماتیزی) نەوێرا سەری وەرسووڕێنێ. بەڵام لە ئاوێنەدا، تەماشای ژەنەراڵی کرد. لێخورەکە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا. بەڵام (ترایان) خەندەیەکی گاڵتەجاڕی لە رووی ژەنەراڵ بینی. ژەنەراڵ دەیەویست (ترایان) بترسێنێ. خۆشیی لەمە وەردەگرت.

ژەنەراڵ گوتی:

-ئەو وارخانەیەی دەڵێی تێیدا نووستووی، ڕەنگە هی خێزانێکی جوولەکە بێ کە شاریان چۆڵ کردووە. (یاسی) جێگای بارەگای گشتی سوپایە. ئەو کەسانەی گومانیان لێ دەکرا دەستیان لەگەڵ دوژمن تێکەڵ کردبێ، کۆمۆنیستەکانو بێگانەگومان لێکراوەکان، کە دەشیا کاری سیخوڕی، یان ڕاووڕووت، یان خراپەکاری بکەن، ناچارکران شار بە جێ بێڵن. ئەمە یاسای ئاسایشی سەربازییە. هەموو وڵاتانی دونیا پەیڕەوی دەکەن. کارێکی ئاسایشی سەرەتاییە. ئایا ئەمە سووڕگومییە؟ ئەو کەسانەی جێیان پێ چۆڵ کردوونو نازانن بچنە کوێ، ئێمە لە خانووی سەربازیدا جێگاو خۆراکیان پێشکێش دەکەین. لەبەر وەی نازانن بچنە کوێندەرو ئێمەیش ناتوانین بەرەڵڵای جادەیان بکەین. ئەمە سەربازگەی کاری زۆرەملی نییە.

(ماتیزی) سوور هەڵگەڕا.

(ترایان) لە دڵی خۆیدا گوتی:

(ئەم چۆڵ کردنە کە بۆ پاراستنی ئاسایش دەکرێ، هەموو لەشکرانی دونیا دەیکەن. ئەمە راستە، چۆڵ کردنی ناوچەی سەربازیی لە هەموو جێگایەك دەبێ. (ماتیزی)، هەستی بە شوورەیی کرد کە هەڵەی کردووە. قەپی لە لێوی خۆی دا. بڕیاری دا لەمەودوا، بەر لەوەی پرسیارێك بکا، زیاتر بیری لێ بکاتەوە. لە جەنگو لەبەرەی شەڕدا، یاسای تر هەن. لەبەرەی شەڕدا، هەموو شتێ گرنگیی خۆی هەیە. هەموو شتێ دەرەکەو هەموو شتێ سزای توندی لەسەرە.

نیوەڕۆ، ژەنەرال بنکەیەکی جەندرمەی پشکنی. فراوینی خواردو سەرخەوێکی شکاند. ئینجا کەوتنەوە رێ. (ترایان) نەیدەزانی ژەنەرال بە ترومبێلەکەی خۆی تا کوێی دەبا. . (ترایان) دەیزانی بەرەو بەرەی شەڕ دەڕۆن، بەلام نەیدەوێرا بپرسێ دەچنە کوێندەر. چونکە دەترسا ژەنەرال تاوانباری بکا لە دوای نهێنی دەگەڕێ.. لە ناوچەی سەربازیدا، ناوی هەموو جێگایەك نهێنییە. کە شەو داهات، (ترایان) لە تەك لێخوڕەکە خەوت، کە لەخەو رابوو، ترومبێلەکە وەستا بوو. لە ناو شارێك بوون تەواو سووتابوو و نوقمی تاریکی ببوو.

ژەنەرال گوتی:

-ئێمە لە (بالتزی)ن. پاڵەوانی گەنج دابەزەو ئەرکی گەورەی خۆت جێ بە جێ بکە!

ژەنەرەال گاڵتەچی بوو. (ترایان) هەندێ وشەی سوپاسی ئامادە کرد، بەڵام ژەنەراڵ بە لیمۆزینە لایت نزمەکەی لە تاریکیدا بزر بوو. (ترایان) کاتی نەبوو سوپاسی بکا. داخی دەخوارد کە لەگەڵ ئەو ژەنەراڵە هاتو بڕیاری دا لە بانەڕۆژدا، هەرگیز لەگەڵ ژەنەراڵاندا سەفەر نەکا. ژەنەرالان ئەو پیاوە نین لە کاتی جەنگدا، لەگەڵیاندا بی!

سەیری دەوروبەری خۆی کرد. تاریکییەکی ئەنگوستەچاو بوو. ڕۆژی پێشوو، چەند شەڕێك لێرە قەوما بوو. (ترایان) کۆشا روو بکاتە لایەك. پالتۆکەی کردە بەرو کولەپشتەکەی توند کرد. ئەو ڕۆژە، نزیکەی هیچی نەخواردبوو. ژەنەرال خواردنی لە بنکەی جەندرمە خوارد. وەلێ، (ترایان)ی بانگ نەکرد بۆ خواردن.

(ترایان) بیری کردەوە: (یەکەم جار، گەرەکە دالدەیەك پەیدا بکەم.) دەیەویست کولەپشتەکەی لە جێیەك دابنێ. هەندێ ئاوو پێخەفێك‌و شتێ بۆ خواردن پەیدا بکا. لەو ماوەیەدا زانیاری وەربگرێ لە ماوەی یەك ساڵی داگیرکردنی سۆڤێتیدا، چ لەو شارە رووی داوە. پێ بکەوێ جەنگ چۆن بووەو لەشکری رزگاریخوازی ڕۆمانی چۆن هاتوونەتە ناو ((بالتزی))؟ (ترایان) چەند برادەرێکی خوێندنی لەم شارەدا هەبوو. دەیەویست ڕۆژی پاشی، بە دوایاندا بگەڕێ. قسە لەگەڵ خۆیان‌و خانەوادەکانیان بکا.

بە دەم توند کردنی کولەپشتەکەی‌و ڕێکخستنی کەمەربەندی، پلانی کاری شەوو ڕۆژی پاشی دانا. ئینجا بەو جادەدا ڕۆیشت کە نەختێ

پێشتر، ترومبێلەکەی ژەنەرال ملی پێوەناو لەبەرچاو بزر بوو. خانووەکانی لای دەستە راستی جادە، هەموو سووتابوون. یەك بینای ساغ چییە تارمایی لە تاریکیدا دیار نەبوو. لای چەپەیش هەروەتر. جادە هەمووی داروپەردوو بوو. بۆنی دووکەڵ دەهات، بۆنی سووتان دەهات. هەندێ بینا هێشتا (بەکزی) دەسووتان. یەك ئەستێرە دیار نەبوو. (ترایان) پێی هەڵگرت. ئەمە یەکەم سەعات بوو لە ناوچەی بەرەی شەڕ بەسەری دەبرد. شانازی دەکرد وەکوو رۆژنامەنووس لێرەیە. تا زیاتر دەڕۆیشت، زیاتر هەستی دەکرد لە ناو جەرگەی شەو، لەناو جەرگەی وێرانیو تەنیاییو کەلاوەدا، نقووم دەبێ.

وردو وردە ئارەقەی بە ناوچەوانیدا دەهاتە خوارێ. ملی جادەیەکی تری گرت لە دەستە راست، بەو ئومێدەی لەم داروپەردوو و کەلاوانە بچێتە دەرەوە. بەڵام جادەکە دیسان چووە ناو خانووی سووتاوی تر. هیچ مرۆڤێکی لە هیچ جێگایەك نەبینی. لە وێرانە زیاتر هیچ نەبوو، ئەوانیش هێشتا دەسووتان.

(ماتیزی) وەستا. دەترسا. زراوی لەو شارە چووبوو کە هەمووخانووەکانی سووتابوونو هیچ رووناکیو هیچ زیڕۆحێکی تێدا نەبوو. (ترایان) پیاوێکی قەڵەزراو نەبوو. بەڵام ئێستا، ترسی بەسەردا زاڵ ببوو. ترسی ئەوەی هەبوو، ئەو شەوە تا بەیانی، بە تەنیا، لەناو کەلاوەکاندا بمێنێتەوە. بە وردی گوێی رادێرا. هەستی کرد شار بە تەواوی نەمردووە. ناو بە ناو چاوێکی فسفۆری لە ناو کەلاوەکان

دەبریسکانەوە. ئەمانە پشیلە بوون. تاکە رۆحلەبەریك لە (بالتزی)، پشیلە بوون. ئێستا بەو شەوە، پشیلەی نێرو تۆقاوو بەرەڵلا لە ناو خانووە سووتاوو بۆمباباران کراوەکان دەسووڕانەوە. دەیانو دەیان پشیلە کە ماڵیان سووتابوو و خاوەنەکانیان نەمابوو...

پشیلەی تۆقاو لە جادەی چۆلدا، لە دەنگی پێی (ترایان) دەردەپەڕین. مرۆ لە چاوی فسفۆری پشیلەکانەوە، کە لە ناو کەلاوەکان دەردەکەوتنو بزر دەبوون، ترسی رووداوەکانی دەدی. (ترایان) موچڕکی ترسی پێدا دەهات.

(ترایان)، لە دڵی خۆیدا، گوتی: (نەمدەزانی پشیلە لەو شارەدا ماون کە خانووەکانی هەموو سووتاونو خاوەکانیان نەماون. تەقەلای دا یەکێ بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی شەو تەنیا نەبێ، لە وێلانیو بیبانی بحەسێتەوە. لە دوورەوە، تارمایی بورجێکی قیتی بینی. کلێسە بوو. بۆمبا زەرەری لێدا بوو. هەندێ لای دیوارەکان مابوون. (ماتیزی) چووە ناو حەوشەی کلێسەکە. بۆمبایەك بە گۆڕەکان کەوتبوو و کردبوونییەوە. دەرگای کلێسەکە بە کلیل قوفڵ درابوو. (ترایان) گەڕایەوە جادە. رووی کردە دەرەوەی شار. ویستی لە (بالتزی) بڕواو لابداتە نزیکترین دەگا. بە ئومێد بوو یەکێ لە دێکە ببینێ. شتێ پاڵی دەدا بە زووترین کات لەم شارە سووتاوو چۆلکراوە بڕوا. ئیتر نەیدەویست بۆنی دووکەڵو سووتان هەڵمژێ، پشیلەو تارمایی خانووی سووتاو ببینێ، پێ لە کەستەکی گەرم بنێ.

بە هەشتاوی دەڕۆیشت. تا خێراتر دەڕۆیشت، زیاتر دەترسا. دەتگـوت ڕاوی دەنێن. قەرەنتوویەکی لـە پێش خۆی بینی. یەکێ لــە چـوارڕیانێك، لـەسەر چەقی ڕێگا وەستا بوو. تارمایی پیاوێك بـوو. کـابرا زۆر کەتـە بوو. ئەوەندە گەورە بوو، بە پیاوی ڕاستەقینە نەدەچـوو. ڕەق ڕاوەسـتا بوو. (ماتیزی) گەڕایەوە بۆ ئەوەی خۆی لێ لابـدا. بـەڵام هـەر هەنـدە هەنگاوێکی هەڵێنا، گوێی لـە فەرمانێك بوو:

-بوەستە! بوەستە!

لـەندەهۆرەکە چرایەکی داگیرساند. بە هەنگاوێ کە زایەڵــەی نائاسـایی بوو، بەرەو (ترایان)هات. کەستەکەکانی ئەوەند بە قایم لـە بن پێـی ورد دەکرد، دەتگوت هەموو دیوارەکان تێك دەدا.

(ترایان) چـەکی وێ نـەبوو. سـەرهەنگ (سـتانکۆڤ) زۆری پێـداگرت (ماتیزی) وەڕوەڕێك، یان تفەنگێك وەربگرێ. پەیامنێری جـەنگ دەبـێ چەکدار بێ. ئەمە خورتی بوو. بـەڵام (ترایـان) ڕەتـی کـردەوە. بـیری کردەوە، ئەگەر چەکیشی هـەبێ، قـەت بـەکاری نـاهێنێ. بـە دەسـت بەتاڵی چووبووە جەنگ. چەکی تەنیا چەقۆ بوو. هەڵیگرتبوو بۆ ئەوەی نانی پێ کەرت بکا..

(ترایان) شاری سووتاوی لـە بیرنەما، کتکە پشیلـەی بـەرەڵڵاو تۆقـاوی لـە بیر نەما، تینوێتیو برسێتی خۆی لـە بیر نەما. هیچ شتی لـە بیر نــەما. تەماشای لـەندەهۆرەکەی کرد کە بە هەنگاوی توندو ڕێكو قـایم لـێـی

نزیـك دەکەوتـەوە. ئێسـتا، چـراەی دەسـتی لـەندەهۆرەکـە سـەراپای (ماتیزی) روناك کردبووەوە.

لـەندەهۆرەکە پرسی:

-تۆ کێی؟

(ماتیزی) وەڵامی دایەوە:

-سەربازێکی رۆمانیم.

لـەندەهۆرەکە سەربازێکی ئەڵمانی بوو. پلاکێکی ئاسنی لـە ملی کردبـوو وشەی (ڤێلدن جێندەرمری - ژاندرمەی ئەڵمانی)ی لـەسەر نووسـرابوو. ماوەیەکی زۆر (ماتیزی) بە چاو دابێژت. (ترایان) پێناسەکەی نیشان دا.

(ماتیزی) گوتی:

-دەچمە هێلی بەرایی بەرەکانی شەڕ. بە ترومبێلێك هاتم . ڤەرمانـدەیی رۆمانی لـە کوێندەرە؟

هیچ ڤەرماندەیی رۆمانی لـە (بالتزی) نـەبوو، پۆلیسـی رۆمـانی نـەبوو. رۆژی پێشوو شار رزگار کرابوو. هێزەکانی رۆمانیا لـە چـوونە پێشـەوە بەردەوام بوون. ڤەرماندەیی، رۆژی پاشی دەهات.

سەربازە ئەڵمانییەکە، جێنوکەکانی ماش‌و برنج بوو، بە وردی تەماشـای رووی زەردو تارمایی لـەڕی (ماتیزی) کرد.

لـەندەهۆرەکە پرسی:

-ئەدی هاوڕێکانت لە کوێن؟

(ماتیزی) وەڵامی دایەوە:

- من تەنیام. پێش نیو سەعات، بە ترومبێلی فەرماندەی گشتی هاتم. دەگەڕێم لۆرییەکم دەست بکەوی بچێتە بەرەی شەڕ.

سەربازە ئەڵمانییەکە کەیفی بە سەیر کردنی ئەم سەربازە رۆمانییە هات کە زۆر بە قوتابی قوتابیخانە دەچوو، جلی سەربازی کردبێتە بەر.

سەربازی ئەڵمانی گوتی:

-(بالتزی) دەرەکو خەبارە! شار لە پارتیزانەکان پاك نەبۆتەوە. ئەمە شتێکی دەرەکە.

(ترایان) بیری لەمە نەکردبووەوە. ئێستا، هەستی بە ئەمان دەکرد. لەندەهۆرەکە نارنجۆکی لە کەمەری بەستبوونو مەترەلۆزێکی پیبوو.

سەربازەکە گوتی:

-ئەو ترومبێلانەی دەچنە بەرەی شەڕ، نایەنەوە ئێرە.

باسی کرد پێش سەعاتێك، کاروانێکی نائاسایی بێرەدا رۆیشت. بەڵام هیچ ئومێد نییە کاروانێکی تر بێرەدا بێ. (ماتیزی) داخی خوارد کە ئەو ترومبێلانەی دەچنە بەرەی شەر، بێرەدا ناڕۆن. بەڵام هێمنو ئارام بوو. شاد بوو کە لە پیاوێك راست هات، ئیتر لە ناو ئەو کەلاوانە تەنیا نەبوو.

سەربازەکە گوتی:

-من لە دەستەی هاتو چۆم. ئەگەر ترومبێلێك بێ، رایدەگرم. بەلاّم بۆ ئەوەی بتوانی به ترومبێلێکی ئەلمانی برۆی، پێش هەموو شتێ دەبێ پسوولەی رێپێدان لە فەرماندەی ئێمە وەربگری.

بەو وەختە درەنگە، تەنیا یەك دەستە سەربازی ئەلمانی لە (بالتزی) هەبوون هاتو چۆیان رێك دەخست. رێنمایی ترومبێلانیان دەکرد بۆ بەرەی شەڕو نیشانەی رێنماییان دادەنا. ئەو دەستەیە پێنج کەس بوون. هەمووشیان نەفەری لاچەرە ماشو برلجی بەشی جیرە بوون. لە لۆرییەکدا بوون لە نزیك کلێسا بوو. جەندرمەی ئەلمانییان لەگەڵدا بوو.(ماتیزی) چووە سەر لۆرییەکە.

ئەلمانەکان بە لوتفەوە پێشوازی پەیامنێری رۆمانییان کردو پسوولەی رێ پێدانیان دایە بۆ ئەوەی بتوانێ دەست لە ترومبیلان رابگرێ. بە خێرا ئەو پسوولەیە دەیتوانی هەموو جۆرە ترومبێکێك رابگرێ کە دەچوونە بەرەی شەڕ. کاتێ رۆیشت، ئەلمانەکان دۆستانە دەستیان گوشیو ئامۆژگارییان کرد ئاگاداری خۆی بێ. سەیریان بە ساویلکەیی ئەم پەیامنێرە رۆمانییە دەهات. بەلاّم (ترایان) هەستی دەکرد لە ژێر پارێزگاریدایە. ئەمە یەکەمین جار بوو لەشکری ئەلمانی دەدی. (ترایان)، کە پسوولەی رێ پێدانی لە گیرفان بوو، لە چوارڕیانەکە، لە تەك پۆلیسی رێکخستنی هاتو چۆ وەستا. چاوەڕێی هاتنی ترۆمبێلێکی کرد. کوڵەپشتەکەی لەسەر لێوی پیادەڕۆ دانا. پالتۆکەی بە

سنگییەوە نووساند. سەرما بوو. هیچ دەنگ نەدەهات. پیاو هەستی دەکرد لەناو گۆڕستاندایە. هیچ رووناکی لە هیچ جێگایەك نەبوو. جگە لە دەنگی پێی پۆلیسەکە کە دەهات و دەچوو، هیچ دەنگ نەدەهات. (ماتیزی) خەوی دەهات، بەڵام برسی بوو. پیاو کە برسی بێ، خەوی لێناکەوێ. (ماتیزی) دەستی بە پیاسە کرد.

پۆلیسی ئەلمانی هاواری کرد:

-ئاختونگ! ئاگادار بە! ئەوێ مینی لێیە!!

(ترایان) جارێکی تر لە تەك کولەپشتەکەی دانیشت. داینابوو تا بەیانی لە دەم جادەدا چاوەڕێ بکا. چونکە بە بێباکی، بە تەنیا، بە رێ کەوتبوو. لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە: (کەس ناتوانێ بە تەنیا بچێتە جەنگ). ژەنەرال راستی دەکرد، بەڵام (ماتیزی، بە خەیاڵیدا نەهاتبووکە لەسەراپای ئەم شارەدا، نە داڵدەیەك، نە کەسێك، نە پەرداخە ئاوێکی دەست ناکەوێ. نەیدەزانی جەنگ بە هەر کوێدا بڕوا، هەموو شتێ لەناو دەبا.

سەربازە ئەلمانەکە چووە لای (ماتیزی) و پرسی:

-فڕەنسی دەزانی؟ من نەختێ فڕەنسی دەزانم. هەڵمەتم بۆ فڕەنسا کردووە.

خەڵکی رۆمانیا فڕەنساو فڕەنسییەکانیان خۆش دەوێ. لە قوتابیخانەدا، هەموو قوتابییەکان فێر دەکرێن کە فڕەنسا خوشکە گەورەی رۆمانیایە.

خەڵكی رۆمانیا شاد دەبن گوێیان لێ بێ باسی فڕەنسا دەكرێ. كە گوێیان لەم ناوە دەبێ: (فڕەنسا)، هەست دەكەن گوێیان لە ناوی خزمێكی زۆر ئازیزو زۆر باش دەبێ.

(ترایان)گوتی:

– قەت فڕەنسام نەدیوە. ئایا فڕەنسا خۆشە؟!

سەربازەكە گوتی:

-فڕەنسا جێگایەكی ترسناكە. فڕەنسا زۆر رێگرو پیاوكوژو قۆڵبڕی تێدایە. فڕەنسا زۆر ترسناكە!

(ترایان) هەستی كرد شتێكی سەرەكی لە بیر كردووە. ئەڵمانیا لەگەڵ فڕەنسادا، لە جەنگدایە. ئەم سەربازە داگیركەر بووە لە فڕەنسا. ئەم سەربازە، كە خاكی (بێسارابی)ی رۆمانیای رزگار كردووەو لە شەڕی رزگاریدا هاوڕێی ئەمە، بۆ فڕەنسا دوژمنە. (ترایان) فڕەنسای خۆش دەویست. بەڵام برادەرەكەی دوژمنی فڕەنساییەكان بوو. ئەم سەربازە ئەڵمانییە، لە فڕەنسا، دوژمن بوو و لێرە رزگاركەر بوو. هەمان كەس، لە یەك كاتدا، بۆ هەندێ كەس دوژمن بوو و بۆ هەندێكی تر رزگاركەر بوو. بۆ نموونە رووسەكان داگیركەرو دوژمنی رۆمانیا بوون، لە هەمان كاتدا، رووسەكان هاوپەیمانو دوستی فڕەنسا بوون. لەو كاتەدا، مرۆی فرەنسی لە تەك پۆلیسی رووسی هەستی بە ئەمان

دەکرد، ریك وەك ئەوەی (ماتیزی)، لە تەك سەربازی ئەلمانییدا، هەستی بە ئەمان دەکرد.

شەوێکی هاوین بوو، بەریێ فێنك بوو. (ماتیزی)، لەسەر گیای دەم جادەدا، خۆی گرمۆڵە کرد. شاقەڵی پالتۆی بەسەر زرانییەکانی دادا. سەربازە ئەلمانییەکە بە منگە منگە دوور کەوتەوە. (ترایان) خەوت. کە بە ئاگا هات، دیتی سەربازی ئەلمانی دەستی لەسەر شانی داناوە.

سەربازەکە گوتی:

-شەو باش! من دەچم دەخەوم. ئێستا نۆرەی هاوکارەکەمە.

نیوەشەو بوو. ئاسمان پڕ ئەستێرە بوو. (ماتیزی) خەوی لێنەکەوتەوە. دەستی بە پیاسە کرد. پاسەوانی نوێ هاواری کرد:

-ئاختونگ!! مین!

(ماتیزی) پیاسەکەی بڕی. هەموو جێیەك مین بوو. (ماتیزی) دووبارە لە تەنیشت کوڵەپشتەکەی دانیشت. کە دووبارە بۆرژا، پاسەوانێکی نوێ هات. ئەو شەوە، ئەمە سێیەمین پاسەوان بوو. رۆژ گەزەنگی دا. (ماتیزی) دەستی بە پیاسە کردەوە. شار رووناکتر دەرکەوت. شتێکی غەمناك بوو.

تارماییەك دەرکەوت.لە زەوییەکی تەنیشتەوە هات. بە روونی دەرکەوت. کابرایەکی مەدەنی بوو. خەڵکی ناوچەکە بوو.

(ترایان)پرسی:

-جەنگ چتۆیی بوو؟

کابرای مەدەنی وەڵامی دایەوە:

-هیچ جەنگ نەبووە.

کابرا لە ناوکەلاوەکان دەرکـەوتبوو. ریشـی نەتاشـیبوو. جلـی شـڕی لەبەر بوو. جلی کەسانی دەربەدەرا.

کابرای ریشنەتاشاو گوتی:

-بەر لەوەی هێزەکانی ئێمە بێن، رووسەکان رۆیشتن. هـیچ شـەڕ لـە (بالتزی) نەکراوە.

(ماتیزی) پرسی:

-ئەی شار چۆن وا کاولو کامباخ بووە؟

کابرا وەڵامی دایەوە:

-پارتیزانەکان!! دوای کشانەوەی رووسەکان، پارتیزانەکان ئاگریان لە شار بەرداو هەموو شتێکیان بە دینامیت پەلەخاند.

بەم جۆرە، (ترایان) هەستێکی تازەی بۆ پەیدا بوو. ئەو هەستەی هـەموو کەس لە کـاتی جەنگـدا بـۆی پەیـدا دەبـێ: (ڤـین). خـۆی پێنـەگیرا، ڤیژاندی!! تاوانباران سەراپای شارێك دەتەقێننەوەو دەیکەن بە کەلاوەو خۆڵـەمیش... ئەمە تاوانێکی دڕندانەو پووچە!!!

کابرای مەدەنی کە رووداوەکەی دیبوو، گوتی هەزاران کەس بە هـۆی تەقینەوە کوژاون. پارتیزانەکان خانووەکانیان بە خەڵکەکەوە تەقاندەوە. (ترایان) قینی زیاتر جۆشا.

وردە وردە دونیا رووناك داهات. بـە روونـاکیی رۆژ، کـەلاوەکان بـە شێوەیەکی روونترو خەفەتناکتر لـە کاتی تاریکی، دەرکەوتن.

مارسیدسێك لـە ناو کەلاوەکان دەرکەوت. پۆلیسەکە ئاماژەی بۆ کـرد بوەستێ. دوو ئەفسەری ئەڵمانی بـوون. یـەکێکیان دەرگـای کـردەوەو پێکەنی، ئاماژەی بۆ (ماتیزی) کرد سوار ببێ.

(ترایان) سوار بوو. ترومبێلەکە کەوتەوە رێ بەرەو باشـوور. ئەفسـەرە ئەڵمانییەکان خەریکی تەماشـاکردنی نەخشـەیەك بـوون. هـیچ قسـەیان نەدەکرد. لەوە دەچوو زۆر سـەرقاڵ بـن. مارسیدسـەکە تیـژ، بەسـەر خاکی نانگرو بە پیتی (بێسارابی)دا دەڕۆیشت. تەبارە گـەنم لـەم بـەرو لەو بەری ئەو رێگایەی دەچووە بەرەی شەڕ، وەکـوو دەریـای زێـڕین کەرویشکەی دەکرد.

## (١٥)

ترومبيلە ئەڵمانییەکە کتوپڕ وەستا. (ترایان) لە چەقی ڕێگا دابەزی. مارسیدسەکە بە ڕێگایەکی دەشتاییدا بەرەو گوندێك کەوتە ڕێ چەند کیلۆمەترێك، لە لای راستەوە دیار بوو. (ترایان) چاوەڕێی ترۆمبێلێکی تری کرد بۆ ئەوەی دوورتری ببا.

(ترایان)، کاتێ کوڵەپشتەکەی لە دەم ڕێگا دانا، دیتی تەبارەیەو گوڵە گەنمەکان لێکراونەتەوە. قاتۆرەکەیان هێشتا بە پێوەیە، بەڵام بێ گوڵ !! تەبارە گەنم گوڵەکانی لێکرابێتەوە، لە کۆمەڵە کەسێك دەکا سەریان بڕابێ بەڵام هێشتا بە پێوە بن. دیمەنێکی ناجۆر بوو.

(ترایان) لە (ئیزڤۆر)، فێر ببوو، ڕێز لە گەنم بگرێ. گەنم یانی نان. لە (ئیزڤۆر))، دەیانگوت نان رووی مەسیحە! دابی ئایینی مەسیحی بە نان دەکرێ کە جەستەی (خودان)ە. ئەوەی گەنم قەتڵو عام دەکا، جەستەی (خودان) قەتڵو عام دەکا. لێرە، تەبارە گەنم قەتڵو عام کرابوو. جێ جێیە، هەندێ پەڵەی ڕەش دیار بوون، شوونی ئاگری کۆن بوون. (ماتیزی) بیری کردەوە ئەم قەتڵو عامەی گەنم تەنیا لە پارتیزانە

هاوشـارەکان دەوەشـێتەوە کـە (بالتزی)یـان وێـران کـردووە. ئـەم قەتڵوعامە تەنیا لـە دوژمن دەوەشێتەوە.

(ترایان) نکوولی دەکرد بۆچوونی وەکوو بۆچـوونی سـەربازانی هـەموو لەشکری دونیا بێ. ئەو، لەو جێیە بوو کە رۆژی پێشتر شەڕی لێ قەوما بوو. ئیتر ئەویش بۆچوونی وەکوو هەموو سـەربازانی کـاتی جـەنگ وا بوو. هەر سەربازێك، کە بە قەتڵو عامێك دەزانـێ، بـە وێرانکارییـەکی درندانە دەزانێ. بە ناچاری دەڵـێ: (ئەمـە ئیشـی دوژمنـە!) لـە کـاتی جەنگدا هەموو کارێکی تاوانبارانە، ئیشی دوژمنە. هـەموو سـەربازێکی هـەموو لەشـکرێك بـەم چەشـنە بـیر دەکاتـەوە. هێـزو ئـوزرەی هـەر سەربازێك لەو هەستەدایە کە خۆی بە باش دەزانێو دوژمن بە خراپ! ئەم هەستە بسڕەوە، هیچ سەربازێك، لە هیچ جێگایەك نامێنێ بجـەنگێ. لەو ساتەدا، بۆچوونی (ترایان) وەکوو بۆچوونی هـەموو سـەربازێك وا بوو کە هاتووەو کە دێتە سەر ئەم خاکـە. ئـەو، بـە سـاویلکەیی، بـە شێوەی کارەساتباری هەموو سەربازێك دەژیا.

(مـاتیزی) دەیزانـی رووسـەکان لـەم جەنگـەدا، تـاکتیکی (زەوی سووتمان)ی مەنگۆلی بەکار دێنن. لە بووڵەو سووتمان زیاتر هـیچ شـتێ لە دوای خۆیانەوە جێ ناهێڵن. ئەو تەبارە گەنمانەی (ماتیزی) تەماشـای دەکردن، نەسووتابوون. بەڵکو بە سادیزمیو بە دڕندەیی سـەربڕابوون. (ترایـان) زەویو رووەکـی خـۆش دەویسـت. لێـرە، هـەتك کـردنو پیرۆزیی شکاندن دەرهەق بە تەبارە گەنمو بە نـان کرابـوو کـە رووی

(خوردان)ە. تەنیا ئەو تاوالبارانەی شاری (بالتیزی)یان بە هەزاران کەسی زیندووەوە سووتاند بوو، ئەو کـارە کرێـتو ئـەو پیرۆزشـکاندنەیان لیٚ دەوەشایەوە، رووسەکان دەیانتوانی ئەم گەنمە بسـووتێنن، بـەڵام شـتی وایان نەکردبوو. ئەوانە، یەك یەك گوڵەکانیان پەڕاندبوو.

(ترایـان) بـە پـیٚ بـەرەو (کیشـینف) کەوتـە ریٚ. نـاو بـەناو، سـەری وەرردەسووڕاندو تەماشـای دەکـرد، هـەر بـە ئومێـد بـوو ترۆمبێلێـك دەربکەویٚ..

چەند لادێیەك لە نزیکەوە دەرکەوتن.

(ماتیزی) لە لادێیەکانی خەڵکی (بێسارابی) پرسی:

-ئەوە ئەم تەبارەیە چی لێهاتووە؟ کـیٚ ئـەم قـەتڵو عامـەی کـردووە؟ پارتیزانەکان؟

لادێیەکان وەڵامیان دایەوە:

-نا. پارتیزانەکان نەبوون. لەشکری رۆمانی بوو ئەم گەنمەی سەربڕیٚ.

لەشکری رۆمانی لە لادێیان پێك هاتووە. هـیچ لادێیـەك لـە دونیـادا، دەستی ناڕوا بەم جۆرە پیرۆزیی پێشێل بکا!. لادێیی دەزانیٚ ریٚزی گـەنم بگریٚ. لادێیی دەتوانیٚ لە ساتی عەنرین، یان لە کاتی مەستیدا، سـەری پیاوێك بـبڕیٚ، بـەڵام هـەرگیزاو هـەرگیز، وەکـوو ئـەم تەبارەیـە، بـە سادیزمیی گوڵی زێڕینی گەنم نابڕیٚ.

لادێیەکان گوتیان:

-پێش سێ رۆژ، لەشکری رزگاریخوازی رۆمانی لە هنداو دێ دەرکەوتن. ئەو یەکە سەربازییەی هاتنە ئێرە، بە مەلەو بە گەمیەو بە عارەبانە، لە (پرووت) پەڕیبوونەوە. سەربازەکانمان وەك شێر دەجەنگانو وەك (با) دەچوونە پێش. بەڵام تا پرد دروست نەکرایە، ئاشپەزخانەو بەشی جبەو ئازووقە نەیاندەتوانی لە (پرووت) بدەنو بپەڕنەوە. ئەوان لە دواوە مابوونەوە. کە سەربازەکانمان هاتن، برسی بوون. سێ رۆژ بوو هیچ خواردنیان لە گوندان دەست نەکەوتبوو. ئیتر فەرماندە دەستووری بە سەربازەکان دا گوڵە گەنم بە سونگی لێ بکەنەوەو لە ناو قوتووی بەتاڵی خواردن بیکوڵێنن.

پاڵەوانێتیی سەربازە رۆمانییە رزگارکەرەکان دڵبزوێن بووکە بە سونگی گوڵەگەنمیان دەبڕیو لە ناو دەستی خۆیان هەڵیاندەگلۆفتو لە ناو قووتووی خواردنی بەتاڵ دەیانکولاند. (ماتیزی) زۆری غەم پێ خوارد. بەڵام یاسای جەنگ توند بوو! قەت نەیدەتوانی باسی ئەم شتە بکا. سانسۆر روخسەتی شتی وای پێ نەدەدا. هەرگیز (نەیدەتوانی بنووسێ سەربازانی رۆمانی، بێ ئەوەی هیچ خواردنیان هەبێ، دەجەنگن.) لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەو شتەی لێرە رووی دابوو سەرشار بوو لە گەورەییو مەزناتی.

(ترایان ماتیزی) بە پێ، کەوتەوە رێ. زیاتر رۆیشت. قرچەو بزرقانی خۆر بوو. (ماتیزی) هەستی دەکرد ئەوەندەی بیبەشیی چەشتووە لە

هۆرو دۆر چووە. تینوو بوو، برسی بوو، بە هیلاك چووبوو. خەوی دەهات. عارەبانەیەك هات دوو ئەسپ رایاندەکێشا. سوار بوو و چەند کیلۆمەترێك بە عارەبانەکە رۆیشت.

ئینجا سواری لۆرییەکی سەربازیی بوو، نانی دەبرد.

دوای نیوەڕۆی ئەو رۆژە، گەیشتە (کیشینف).

شار دەسووتا. لە گەڕەکەکانی پەڕگەی شار شەڕ بوو. (ترایان) گەیشتە بەرەی شەڕ، بەڵام لە هەمان کاتدا، داخی دەخوارد. (ترایان) نەیدەویست ئەم دیمەنە ببینێ. نەیدەویست ببینێ شاری سەردەمی منداڵێتیی و هەرزەکاریی خۆی، دەسووتێ و دەبێ بە قەرەبرووت.

## (١٦)

(ترايان) بە هەناسەبڕکێ داکشایە ناو شار، ئەو شارەی رووسەکان ماوەی یەك ساڵ داگیریان کردبوو. چەند کیلۆمەترێك بەولاوە، لە باشوور، شەڕ بوو. لە تاخەکانی رۆژهەڵات، پارتیزانەکان لە ناو خانووەکان سەنگەریان گرتبوو. هێمان دەستوەکەرییان دەکرد.

(کیشینف) کەسی تێدا نەمابوو. رووسەکان سێیەکێکی خەڵکەکەیان سوڕگوم کردبوو. فەرمانبەرە کۆمۆنیستەکان لەگەڵ لەشکری سوور رۆیشتبوون. خەڵکەکەی تر رایان کردبوو بۆ گوندان، یان بۆ دەوروبەری شار! خانووەکان چۆل بوون. (ماتیزی) لە هەموو جێیەك گوێی لە هەمان رستە دەبوو: (پارتیزانەکان خراپترین ئیشیان کردووە!) پارتیزانەکان کەسانی مەدەنی خەڵکی (بێسارابی) بوون. مەفرەزە، یان لەشکریان لێ دروست کرابوو. لە کاتی کشانەوەی لەشکری سۆڤیێتدا، پاشەنگ بوون. پێش ساڵێك، کە (بێسارابی) داگیرکرا، ئەمانە پێشەنگی لەشکری سوور بوون. پارتیزانەکان زۆربەیان جوولەکە بوون.

(ماتیزی) دەیزانی ئۆمـەتی دیانـان، جوولـەکـە بـە سـەبەبکاری هـەموو نەهامەتێك دەزانن. لـە سەدەکانی ناوەڕاستو تەنانەت دواتـریش، هـەر کاتێ بوومەلـەرزەیەك دەبوو، هەر گاوێ پەتایـەك دەهـات، هـەر تـاوێ وشـکە سـاڵیو خـەلاو گرانـی دەبـوو، بـە کۆمـەڵ جوولـەکـەکانیان دەسووتاند، قەتڵو عامیـان دەکـردن. (ترایـان) داوای نـاوی تایبـەتیو نازناوو شتی راستی دەکرد بۆ ئەوەی تووشی هەڵـە نـەبێ. دەیەویسـت تەنیا شتی راست بنووسێ. بـەلام میللـەت راستیان دەکـرد: پۆلیسـی سـۆڤێت، فەرمانـدەکانی ئوردوگـای زینـدانیانو ئۆردووگـای کـار، فەرماندەکانی مەفرەزەی پارتیزانەکان، بە زۆری جوولـەکەی (بێسارابی) بوون.

کلێسیەیەکی بچووك هەبوو، لـە ناوەڕاستی شار دوور نـەبوو. (ترایـان) زۆر ئاشنای بوو. چووە ناو کلێسەکە. لـە کاتی داگیرکرانی رووسیدا، کلێسەکە کرابوو بە شانۆ. شانۆیەکیان لـە جێگای میحراب رۆنا بـوو، دەستەیەك دەورگێڕی جوولـەکـە دەوریـان لـەسـەر شـانۆکە گێڕابـوو. نمایشەکان بە زمانی رۆمانی بوون. (ماتیزی) ناوی ئەو نیگارکێشەی لای خۆی تۆمـار کـرد کـە دیواربەنـدێکی گـەورەی خوانەناسـی لـەسـەر ئایکۆنی دیوارەکان کێشابوو و نیگارکێشێکی جوولـەکە بوو.(مـاتیزی) دەیناسی. ئەو هونەرمەندە جوولـەکانەیشی دەناسی کە لـەم کلێسـەیەدا، دەوریان گێڕابوو و ئێستا لـەگەڵ لـەشکری سوور رۆیشتبوون.

بەکارهێنانی قەڵەم دژی خەڵك، کارێکی نامرۆڤانەیە! (ترایان)، لەو کاتەوە لە لاپەڕەی (ڕووداوی جیاواز) بوو، هەمیشە خۆی لە تاوانبار کردنی خەڵك بە دوور دەگرت. بەڵام ئەم جارە، خۆی پێ بەرزەفت نەکرا. پیاو، کە لە تەمەنی بیست و یەك ساڵیدا، دەبینێ کلێسەیەك ڕاگەڕاوە، کراوە بە شانۆ، یاخی نەبوون بێ زاخییە. تووڕەنەبوون بێ غیرەتییە. (ترایان) تووڕە ببوو. ناوو ناوی خانەوادەی ئەو دەورگێڕانەی لە دەفتەرۆکەی یاداشتی تۆمار کرد کە بە دەستی خۆیان کلێسەی خودای (ترایان ماتیزی)یان ئالوودە کردبوو.

لەشکری ڕۆمانیاو ئەلمانیا (کیشینف)یان داگیر کردبوو. (ترایان) لەبەر شەکەتی لە هۆرو دۆر چووبوو. بڕیاری دا داوای یارمەتی لە دەسەڵاتداران بکا. چووە دەرەوە بۆ سەر جادە. لە پێش کلێسە وەستا. بێرییە فەروەکەی لەسەر کردەوە. لەبەردەم کلێسەی ئالوودە، دوعای کرد. ئینجا، بە پێ کەوتەوە ڕێ. لە دوای بنکەی فەرمانبەرانی ئاگرکوژێندا گەڕاو داوای لە فەرماندە کرد روخسەتی بدا لەو ماوەی لە (کیشینف)ە ، خواردن لەگەڵ سەربازەکان بخوا.

(ترایان) گوتی:

-نازانم ماوەی چەند لێرە دەمێنمەوە. هەوڵ دەدەم پێ بکەوم ئەو برادەرانەم کە لە ژیاندا ماون، چییان بەسەر هاتووە. دەمەوێ بپرسم لە سەردەمی داگیرکراندا، لە کاتی داگیرکرانی شاری (بێسارابی)و لە حانی ڕزگاربوونیدا، چ ڕووی داوە. دەمهەوێ مامۆستاکانم،

کتێبفرۆشەکەم، کۆنە فرۆشەکانو هەموو ئەو کەسانە ببینم کە دەمناسین. ئەوان دەتوانن بۆم باس بکەن، لێرە چ قەوماوە.

(ترایان) شەکەت بوو. فەرماندەی ئاگرکوژێن بایسکلێکی پێشکێش کرد بۆ ئەوەی بتوانێ بە ئاسانی هاتو چۆ بکا. (ماتیزی)، بە پایسکل، چووە ناو شاری گڕگرتوو. چووە شەقامی سەرەکی، شەقامی ئەلکسەندەری خاس. تاخی رۆژئاوا کەمتر وێران ببوو. (ترایان) بە ئومێد بوو بتوانێ ژوورێك لەوێ پەیدا بکا. گەڕەکەکە، زۆر خانووی ساغی تێدا مابوو، بەڵام چۆل بوون. (ترایان) دەیەویست ژوورێکی لە خانوویەکی ئاوەدان دەست بکەوێ. خانوویەکی دی ناوی دختۆرێکی لەسەر دەرگا درابوو. لە زەنگی دەرگای دا:

کابرایەکی زی کراوەی بێ دوگمە دەرگای کردەوە. (ماتیزی) گوتی:

-دەمەوێ چەند رۆژێك لێرە بژیم.

کابرا زەق زەق تەماشای کردو لە وڵامدانەوە دوودڵ بوو.

(ترایان) پرسی:

-ئایا تۆ دختۆری؟

کابرا سەری (ئاریێ)ی لەقاند. بەڵام هێشتا هەر رارا بوو. نە بە (ئا)و نە بە (نا) وەڵامی نەدایەوە.

(ترایان) گوتی:

-من پەیامنێری جەنگیی سەر بە سەرکردایەتی لەشکرم. کاتی خۆی لە (کیشینف) قوتابی سانەوی بووم، سانەوی شا فردینان. بۆ چەند رۆژێك هاتوومەتە ئێرە. ئەگەر ژووریکتان بۆ من هەبێ، چاکەیەکی گەورەم لەگەڵ دەکەن.

دختۆر بە کپ‌و بێدەنگی لەبەردەم سەربازەکە مایەوە. بیری کردەوە.

(ترایان) گوتی:

بە هیچ جۆرێ سەخڵەتتان ناکەم . بە رۆژ، لە ماڵەوە نابم، دەردەچم.

دختۆر گوتی:

-تکایە یەك خولەك سەبر بگرە!

چووەوە ژوورێ. بە پارێزەوە، پەردەی پەنجەرەکانیان لادا. لە ژوورەوە، بە چاوی پەرۆشەوە تەماشای (ترایان)یان دەکرد.. (ترایان) هیوایەکی زۆری هەبوو کە دختۆر وەڵامی (ئارێ)ی بداتەوە. دەیەویست، بە زووترین کات لە ناو پێخەفێك هەڵاژێ. بە هیلاك چووبوو.

بیری لە کلێسەی راگەڕاو، لە شاری سووتاو، لە تەبارە گەنمی سەربڕاو، دەکردەوە، دختۆر هاتەوە. دوگمەی زی کراسیی داخستبوو و کەرەوێتێکی بەستبوو. لە جاری یەکەم بە پارێزتر بوو.

دختۆر گوتی:

-ژووریکمان هەیە! ژووریکمان هەیە، بەڵام نازانم بە کەڵکە تۆ، دێ، یان نا؟ خۆت دەزانی، ئێمە لە بارو دۆخێکی تایبەتیداین.... ئێمە جوولەکەین.

دختۆر خۆی تاوانبار دەکرد کە جوولەکەیە. وەك ئەوەی خۆی بە گوناهێك تاوانبار بکا.

(ترایان ماتیزی) گوتی:

– برادەرەکانی (کیشینف)م، نزیکەی هەر هەموویان جوولەکەن.

ناوی رۆژنامەنووسەکان، شاعیرەکان، کۆنەفرۆشەکان، کتێبفرۆشەکانی هێنا. ئەمانە ئەو کەسانە بوون کە لە ماوەی ئەو هەشت ساڵەی لەو شارە بوو، ناسیاوی لەگەڵ پەیدا کردبوون.

(ماتیزی) گوتی:

-لە پارێزیی تۆ دەگەم! بەو پێیەی بۆیان باس کردووم پارتیزانو پۆلیسە کۆمۆنیستەکانیش زۆربەیان جوولەکە بوون. بە تێکڕایی، هەموو ئەوانەی وایان لە شارو لە خەڵکەکە کردووە جوولەکە بووین. من خۆم رقم لە جوولەکە کۆمۆنیستەکان دەبێتەوە. بەڵام نەك لە هەموو جوولەیەك هەر لەبەر ئەوەی جوولەکەن! ..

دختۆر گوتی:

-ئێمە کە لێرە ماوینەتەوەو کاتێ لەشکری سوور کشایەوە، لەگەڵیان نەچووین، بەلگەیە کە ئێمە کۆمۆنیست نین. ئەوانەی تاوانیان کردبوو لەگەڵ رووسەکان رۆیشتن. ئەوانەی ویژدانیان ئازاری دەدان، نەماون. ئێمە دژی ئەوانین.

(ترایان) لە پلیکانە سەرکەوت. بەر لەوەی دەرگا بکاتەوە، دختۆر گوتی:

-با پێت بلێم، ئێمە ژمارەیەکی زۆرین لێرە. کۆبووینەتەوە سەر یەك. ژیانمان باش نییە. ئێوە دەتوانن بۆ خۆتان خانوویەکی تر بدۆزنەوە، هەموو جۆرە خۆشگوزەرانییەکی تێدا بێ.

(ترایان) گوتی:

-ئێستا، کە دانت پێدانا ئێوە جوولەکەن، زیاتر بە سووربوونەوە داوات لێدەکەم میوانداریم بکەن. شادو گوشاد دەبم لە ماڵی ئێوە بژیم. دڵنیات دەکەمەوە ئێرەم زۆر پێ باشە، با خۆشگوزەرانیش نەبێ. بەڵگەشتان بۆ دەبێ کە سەربازی رۆمانی دژەسامی نییە. دەسەلمێ کە هاورێی جوولەکانە. من حەز دەکەم ماوەیەکی زۆر قسە لەگەڵتانگۆ بکەم. ئێوە یەکەمین رۆشنبیری رۆمانین لە (بێسارابی) دەتانبینم. من دڵنیام، بۆچوونتان لە بارەی رووداوەکانی ئەم دواییە راستو دروستە.

ئێستا، (ترایان) لەو ماڵە بوو. دختۆر، یەکەم دەرگای دەستەراستی کردەوە. ژوورێکی بچووکی تایبەت بە خزمەتکاران بوو. یەك پەنجەرەو

یەك تەختی چوارپای لێ بوو. (ترایان) كوڵەپشتەكەی فڕێدایە سەر چوارپاكە. لە تەك كوڵە پشتەكە دانیشت. یەقەی چاكەتەكەی كردەوە.

دختۆر گوتی:

-ماڵ هەموو گیراوە. برادەرەكانمان خانووەكانی خۆیان جێ هێشتووەو هەموو هاتوونەتە ئێرە. بۆ ئەوەی ئەگەر شتێ قەوما، هەموومان بە یەكەوە بین. زۆر بە ناخۆشیی. بارو دۆخ خڕی كردووینەتەوە سەر یەك ، تێدەگەی!؟

دختۆر لەسەر كورسییەك دانیشت. پرسی:

-جوولەكە چییان بەسەر دێ؟ لەو جێگایانەی پێیاندا هاتی، چیت بینی؟ ئەڵمانەكان دەیانەوێ چمان لێ بكەن؟

دختۆر هەوڵی دەدا نیگەرانی خۆی بشارێتەوە، خۆی بە ئارامی پیشان بدا. بەڵام ئەستەم بوو. دانی پێدانا كە چەند شەوێكە، هیچ یەكێ لە دانیشتوانی ئەو ماڵە چاویان نەچۆتە خەو. شەو، یەك لە دوای، بە خەبەر دێن و قسە دەكەن.

(ماتیزی) گوتی:

-من ئەوەتا هاتوومەتە (بێسارابی)! شەوێك لە (بالتزی) بووم. لە سەفەرەكەمدا، تەنیا چەند لادێیەكم بینیوە. ئاگام لێ نییە چ رووی

داوە. لە هەموو شوێنی تەنیا باسی تاوانە دڕندانەکانی پارتیزانەکانیان بۆ کردووم.

دختۆر گوتی:

-ئێمە ترسمان لەوەیە سوڕگوم بکرێین. تۆ پێت وایە شتی وا بکری؟ یان گوللەباران بکرێین ؟ ئەلمانەکان، لە جێیەکانی دی چییان لە جوولەکەکان کردووە؟

(ترایان) گوتی:

-ئەلمانەکان هیچ پەیوەندییان بە بەڕێوەبەرایەتی (بێسارابی)یەوە نییە. دەسەلاتدارانی رۆمانی دێنە ئێرە. لە رۆمانیا، هیچ شتێ دژی جوولەکەکان نەکراوە. ئیتر هیچ شتێ لە دژی جوولەکەکانی (بێسارابی) ناکرێ. دختۆر، دلنیا بە!!

دختۆر گوتی:

-کە مرۆۋ جوولەکە بێ، خاترجەمیی کارێکی دژوارە. دمگۆ هەیە کە... لەبەر ئەوەیە لێت دەپرسم لە جێگای دیکە جوولەکە چییان بەسەر هاتووە؟

(ماتیزی) دەستی لەسەر دەستی دختۆر دانا. ویستی زاتی بخاتە بەر.

-تا من لێرە بم، کەس پێ ناوێتە مالی ئێوە. ترستان نەبێ! نووسینێك لەسەر دەرگا دەدەم کە یەکێکی سەر بە سەرکردایەتی لەشکری گەورەی جەنگی لێرە دەژی. ئیتر کەس پێی بەم مالە ناکەوێ.

دختۆر پرسی:

-تۆ خۆت چۆنی تێدەگەی؟ ئایا بە رای تۆ، چیمان لێدەکەن؟ بیرو رات لەم بارەیەوە چییە؟ کە دەزگای بەڕێوەبەرایەتی رۆمانی لە شار دابمەزری، ئێمە ئیتر ترسمان نامێنێ! بەرێ، ئێستا زۆر نیگەرانین. چەمەڕای هەموو شتێ دەکەین.

(ماتیزی) گوتی:

- هیچتان بەسەر نایە! راستە خەڵك لە پارتیزانەکان تووڕەن کە زۆربەیان جوولەکەن، بەڵام دەسەڵاتدارانی رۆمانی هەرگیز هیچیان لە دژی جوولەکەکان نەکردووەو دڵنیام هیچیش ناکەن. من خۆیشم دوو سەعات زیاتر نابێ، لە جوولەکە کۆمۆنیستەکان تووڕە بووم. کاتێ کە بینیم دەستەی (ئێدی تال)ی جولەکە کلێسەیان کردووە بە تیاترۆ. لە رکان هەموو گیانم لەرزی. ئەم رقە بەرامبەر جوولەکە (کۆمۆنیستەکان)ە . دژی ئەو کۆمۆنیستانەی کاری خراپیان کردووە، نەك دژی هەموو جوولەکەیەك. بەڵگەیش ئەوەیە ئەوەتا من لەماڵی ئێوەم.

دیار بوو دختۆر ئارام ببووەوە. لانی کەم بۆ ئەو ساتە. بەڵام دوای کەمێ، دووبارە چاوی تاری داهات.

گوتی:

باسی زۆر شت دەکەن.. باسی شتی زۆر ترسناك دەکەن، ترسناك...

(ماتیزی) گوێی لە ترپەی چەند پێیەك بوو لــە پشــت دەرگــا، دەهــاتن. دانیشتوانەکانی دیکەی ماڵەکە بوون، لە ســەر پەنجــەی پــێ، هاتبوونــە پشت دەرگاو گوێیان دابووە قسەکان.

(ماتیزی) دووگارکی کردەوە:

–ئێوە هیچتان بەسەر نایە، دختۆرا ئێستا، تۆ پارچە کاغــەزێکی ســپیو قەڵەمێکم بدەرێ.

کــاتێ (مــاتیزی)، خــەریك بــوو لەســـەر پارچــە کاغــەزێکی گــەورەی دەنووسی: (ترایان ماتیزیی، پەیامنێری جەنگیی ســەر بــە ســەرکردایەتی گشتی، لێرە دەژی.)، سەری دەسووڕا، سەرەگێژەی گرتبوو.

دختۆر، سەرنجێکی پیشەوەرانەی لە ڕەنگــی پــەڕیوی ســەربازەکە دا، گوتی:

–شتێ ناخۆی؟ خواردنمان هەیە. بەڵام نانمان نییە. حەزت لە چییە؟

(ماتیزی) گوتی:

–من لەگەڵ فەرمانبەرانی ئــاگرکوژێن خــواردن دەخــۆم. بــەڵام ئــەمڕۆ ئێوارێ ناچم. زۆر کەشەنگم، برسیشم نییە. سوپاســـت دەکــەم. هیچــم ناوێ.

لەسەر نوێنەکە راکشا. بیری کردەوە، دختۆر نانی نییە. هیچ نانــوایی نەمابوو.

(ترایان) گوتی:

-بەیانی، دەچمە جەم فەرمانبەرانی ئاگرکوژێن، نانتـان بـۆ دێـنم. ئێـوە چەند کەسن؟!

دختۆر گوتی:

-چـل. ئێمـە چـل کەسـین، لــە پێـنج ژووردایـن. کـووی بتـوانین وا دەخەوین. لە هەر جێیەك بێ: لەسەر چوارپا، لەسەر زەوی،...

(ماتیزی) گوتی:

-کەوابێ، من نابێ ئەو تەختەتان لێ داگیر بکەم. دەبێ برۆم. سوپاسـتان دەکەم. ناتوانم میوانداریتان قەبووڵ بکەم.

دختۆر گوتی:

-کەس لێرە ناخەوێ. ئەم ژوورە بەتاڵە. تکایە مەڕۆ، لێرە بمێنەوە.

(ماتیزی)، بۆ یەکەمین جار لە ژیانی خۆیدا، تێگەیشت تۆقین یانی چـی؟ ئەمانە لە ترس و تۆقاندا دەژیان. لە رۆژگاری تـرس و تۆقانـدا، خـەڵك خۆیان دەدەنە پاڵ یەك. وەك ئەوەی لە ماڵی دختۆر خۆیان دابـووە پـاڵ یەك. (ترایان)، بە خۆشەویستی، بـە هوشـیاری، بـە سـۆزو بەزەییـەوە، تەماشای دختۆری کرد.

دختۆر گوتی:

-تۆ پێت وایە ئێمە هیچمان بەسەر نایە؟ بە راستی پێت وایە؟

(ماتیزی) گوتی:

-چەند ڕۆژی تر، دەسەلاتدارانی ڕۆمانی دێن، هەموو شتێ ڕێک دەکەوێ. ئێوە هیچتان بەسەر نایە. من دڵنیام.

(ماتیزی) نووسینەکەی بە دەبوس لە سەر دەرگا چەسپاند. شادو گوشاد بوو کە توانی لە دەرگای بدا. ڕاستە، ئەمە تەنیا پارچە کاغەزێکی سادەیە، بەلام چل کەس چەپاڵە دەدا. (ترایان)، کە ئەم پارچە کاغەزەی لە دەرگا دا، هەستی کرد دانیشتوانی ماڵەکە ئۆخەیان لە خۆیان کردو هەناسەیان هاتەوە بەر. هەستی کرد تەنیا پارچە کاغەزێك بە پەنجەکانی لە دەرگا نادا، بەڵکە کارێك جێ بە جێ دەکا. کارێکی باش دەکا!! کارێکی باش کە هیچی بۆ وی تێناچێ. کاری باش هەمیشە خۆڕایە. کردنی ئاساندە. بۆ ئەوەی بتوانی کارێکی باش بکەی، تەنیا زاتی دەوێ، کەمێ زاتو بەس!!

(ماتیزی) کە گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی، بادییە ئاوێکی خواردەوەو لەسەر تەخت هەلاژا. بەلام سەرەگێژەو لاسەرێشەی هەر مابوو. بێ شك، ئەمە بە هۆی شەکەتیی بوو. بە هۆی خۆری بزرقانی بەیانی بوو، لەوانەیشە لەبەر خواردنی نانی وشك بێ کە لە ناو ئەو لۆرییەی پێ دەچووە (کیشینف) ، خواردبووی‌و یەك قومە ئاوی لەسەر نەکردبوو.

(ماتیزی) پرسی:

-دختۆر، ئەو ماوەی لەماڵتان دەبم چاوتان لـە مـن بـێ! بـەم دواییـە کاری زۆرو سەختم کردووە. کەم خەوتووم. سـێ مانگـە، یـەك شـەو چییە لەسەر چوارپا نەخەوتووم. تەنیا لە ناو قـەتار خـەوتووم. تووشـی کەمخوێنی هاتووم. کرابوومە عەسکەر لە (برازۆڤ). شەویش لە رۆژنامە کارم دەکرد . ناتوانی هەندێ دەرزی بەهێزبوونم لێ بدەی؟!

دختۆر بە داوای (ترایان) کەیفخۆش بوو. دختۆر، کە ماوەیەك بوو لـە ماڵی خۆی زیندانی بوو، کاتێ دەرزی بۆ (ترایـان) ئامـادە دەکـردو بـە وردی چـاوەکانی دەپشـکنی، هەسـتی دەکـرد بۆتـەوە دختـۆر. ئـەو پیاوەی (ترایان)ی دەپشکنی ئیتر زیندانییەکی جوولـەکە نـەبوو کـە لـە ترسی ئەوەی نەوەك شتێ روو بدا، شەو خەوی لێنەدەکەوت، بـەڵکو سەر لە نوێ ببووەوە بە (دختۆر). بەمەوە، لەپڕ دەنگی گۆڕا، سـەرنجی گۆڕا. دووبارە، بوونەوەی بە دختۆر، ژیانی بۆ گێڕایەوە . لە ناو ترس‌و تۆقان دەری هێنا.

(ماتیزی) دەرمانی بەهێزبوونی وەرگرت‌و خەوت. ئەو شەوە، لە ماڵەوە دەرنەچوو. تا سبەینێ خەوت. چل کەسەکە شـاد بـوون کـە (ترایـان) نارِوا. (ماتیزی) نەیدەتوانی بەرگرییان لێبکا، بەڵام کە لەوێ، لە مـاڵی ئەوان بوو، کە نووسـینەکەی لەسـەر دەرگـا دابـوو، ئەمـە ئـارامی بـە جوولـەکەکان دەبەخشی!

(ماتیزی)، دەوری نیوەشـەو، بـە خەبـەر هـات. ئەوانـەی دەوروبـەری نەخەوتبوون. (ترایان) گوێی لێبوون بە دەنگی بـەرز قسـەیان دەکـرد.

ژنەکان پێدەکەنین، ڕەنگە ئەمە یەکەم جار بێ، دوای ئەو هەموو ڕۆژە تەنگانەیە، پێدەکەنین!

## (١٧)

سبەینەی پاشی، (ترایان) لە خەو رابوو. لە دالآنەکە، لەبەر دەرگای ژوورەکەی، گوێی لە دەنگی نزمی چەند پێیەك بوو. بە دەنگی نزم قسەیان دەکرد. دختۆر لە دەرگای دا. هاتە ژوورەوە. کەرەوێتی بەستبوو. جلێکی تری لەبەر بوو. سیمای گۆڕا بوو. قوتوویوك دەرزیو جانتای دختۆری هێنابوو.. دختۆر دەرزییەکی تری لە (ترایان) دا. ئینجا گوتی:

-ئێمە یەك عەنبار خۆراکمان هەیە، لە ژێرزەمینێك تەقەتمان کردووە. زۆر لێرە دوور نییە. بەڵام ناوێرین بچین شتێ بێنین. ئێستا، چوونە جادە باش نییە. برسی ببین باشترە. زۆر دوور نییە. دەوری پێنج سەد مەترێك دوورە، بەڵام ڕێگاکە بە ناو گۆڕەپانێکدا دەڕوا. زەحمەت نییە تا عەنبارەکە لەگەڵ خوشکم بچی؟ ماوەکە پێنج سەد مەتر ڕێیە. لەگەڵ تۆدابێ، ترسی نییە.

(ترایان) گوتی:

-دختۆر، بەوپەڕی شادمانی لەگەڵیدا دەچم! من لە خزمەت ئێوەدام.

چـل جوولـەکەکـە، لــە ترسـی سـەربازان، خۆیـان شـاردبووەوەو لــە ژوورەوە دەرگایان لـە سەر خۆیـان داخسـتبوو. لـە ترسـی سـەربازان، ئازووقەیان شاردبووەوە. لـە ترسـی سـەربازان، نەدەچـوون ئازووقەکـە بێنن. (ماتیزی)یش سەرباز بوو. لەگەڵ ئەوەیشدا، نهێنـی خۆیـان لــە لا درکاند.

دختۆر گوتی:

-بمانبوورە کە داوای ئەو یارمەتییەت لێ دەکەین. شەوێ دی، ئەوەنـدە خواردنەی لــە ماڵـەوە مابوومـان، خلاسمـان کـرد. لـەوما داوای ئـەم یارمەتییەت لێدەکەین. دووبارە داوای بوردنت لێ دەکەین...

(ترایان) گوتی:

-ئاساییە ئەم یارمەتییەتان بدەم. ئەمە یارمەتییەکی کەمو ئاساییە.

دختۆر گوتی:

-جەنابی (ماتیزی)، دەزانم ئەم شەو لە ماڵەوە دەرنەچووی. دەزانم هیچ سالووخی تازەت وەرنەگرتووە. بەڵام ئایا تۆ رات چییە؟ پێـت وایـە چ لە ئێمەی جوولەکە دەکەن؟ بۆی هەیە لەم ماوەیەدا، بیرت لــە حـاڵی ئێمە کردبێتەوە! پێت وایە چیمان لێدەکەن؟

(ماتیزی) هەوڵی دا دووبارە زاتـی بخاتـە بـەر. دەرگـا نیـوە کرایـەوە. خوشکی دختۆر لە سەر کۆسپەی دەرگا دەرکەوت.

دختۆر گوتی:

-ئەمە (سیلڤیا)ی خوشکمە. دەرمانسازە.

(سیلڤیا) ژنێکی جحێلی چاو ڕەش‌و ڕەنگ ئەسمەر بوو. (ماتیزی) سلاوی لێ کردو بە شادییەوە تەماشای کرد. ژنە شەپقەیەکی گەرگەڕی لەسەرو جلێکی ڕەشی پۆشتەی لەبەرو پێلاوێکی پانی بەرزی لە پێ بوو. وەك ئەوەی بچێتە تەماشای نواندنێك، یان بچێتە وادەو ژوانێکی گرنگ.

دختۆر گوتی:

-(سیلڤیا) لەگەڵت دێ. چونکە ژن مەترسیی کەمتر لەسەرە تا پیاو. جێگاکە دوور نییە. پێنج سەد مەترە!

(سیلڤیا) لە پلیکانە چووە خوارێ بۆ سەر جادە. (ترایان) کەوتە شوێنییەوە. لەسەر کۆسپەی دەرگا، دختۆر، بە نیگەرانی، تەماشای کردن.

گوتی:

-وا چاکە (سیلڤیا) بازووت بگرێ . کە (سیلڤیا) بازووت بگرێ، کەس ناوێرێ بیگرێ.

لەوانەیە بە درێژایی شەو،خەریکی ئامادە کردنی ئەم وردەکاریانە بووبن. وەك ئەوەی گفت‌وگۆ لەسەر وردەکاری شاندێکی ئازا بکەن. (سیلڤیا) قۆڵی لە قۆڵی (ترایان) هەڵکێشا. جوانترین ئارایشی بۆ چوونە دەرەوە بە کار هێنابوو. بۆ ئەوەی کەس زەن نەبا جوولەکەیە.

(سیلڤیا) بازوو و دەستی بچووکی لە قۆڵی (ترایان) وەرهێنابوو، دەستو بازووی دەلەرزی. (ماتیزی) دەیزانی (سیلڤیا) چاوەڕێ دەکا ئەم زاتی بخاتە بەر، چاوەڕێی قسەیەکی لێدەکرد، چاوی لێبوو دڵنیای بکاتەوە کە هیچ روو نادا.

(سیلڤیا) گوتی:

-دوور نییە. پێنج سەد مەترە. لە جادە دەپەڕینەوەو یەکسەر لەوێین، یەکسەرا

دوای شاری (بالتزی)، دوای گوندە سووتاوەکان، دوای تەبارە گەنمی بە سونگی سەربڕاو دوای وێنەی کلێسە کە ببوو بە تیاترۆ، دوای ماڵی دختۆر کە چل جوولەکە بەدەم ترسو تۆقانی بانەرۆژ تێیدا دەژیان، دوای ئەو هەموو وێنانە، ئەو کچە جحێلە بازووی (ترایان)ی گرتبوو، لە گوڵێکی دەکرد لە ناو دارو پەردوودا، چووزەرەی دابێ.

دوای ئەوەی لە جادە پەڕینەوە، چوونە سەر پیادەڕۆی ئەوبەر. لەنکاوڕا (سیلڤیا)، وەستاو گوتی:

-ئەوانە بۆ لای ئێمە دێن.

وەك گەڵا دەلەرزی. وەك مامزێ کە لە قەراخ جەنگەڵێ تفەنگی شکارچی دەبینێ، نیشانەی لێگرتووە. لەرزی پێدا هات.

(سیلڤیا)، بە نائومێدی تەماشای سەربازێکی کرد بۆ لایانەوە دەهات. بە دەست ئاماژەی بۆ دەکردن، بوەستن.

جێگری ئەفسەرێکی کەڵەگەت‌و چوارشانە بوو. بە  رارایی دەڕۆیشت. جلێکی سەربازی نوێ‌و بە نەخش‌و بریقەداری لەبەر بوو.

(ترایان) گوتی:

-برادەرێکی بوخاریستی خۆمە. مەترسە خانم، مەترسە! برادەرێکی خۆمە.

ئەو جێگرەی جلی نوێی لەبەر بوو و دەهاتە لایانەوە، کومیسەرێکی پۆلیسی سیاسی (بوخاریست) بوو. وەکوو (ماتیزی)، نیشانەی زەردی (ر، ب-راگەیاندن‌و بانگەشە)-ی لە بەرۆکی چاکەتی دابوو. ئەمە نیشانەی پەیامنێرانی جەنگ بوو. بە شادی بەرەو (ماتیزی) هات. بە شێوەی ئامادە، لەبەردەم (سیلڤیا) وەستا. داهاتەوە. دەستی (سیلڤیا)ی ماچ کردو خۆی پێشکەش کرد. (سیلڤیا) دەلەرزی‌و بازووی (ترایان)ی دەگوشی.

(مارتیزی) پرسی:

-کەی هاتی؟

تەماشای نیشانەی سەر سینگی کۆمیسێرەکەی کرد و گوتی:

-نەمدەزانی تۆ پەیامنێری جەنگی.

یاریدەر بە ئیعجابەوە، تەماشای (سیلڤیا)ی کرد .بێ ئەوەی چاوی لەسەر هەڵگۆزێ. وەڵامی (مارتیزی) دایەوە:

-ئەم جلە سەربازییەم لەبەر کردووە چونکە رەحەتترە.

سەرنجێکی وای لە (مارتیزی) دا مانای هەڵوێستەکەی پێشان دەدا. وەکوو پۆلیس هاتبووە (کیشینیف). بەڵام جلی پەیامنێری جەنگی کردبووە بەر بۆ ئەوەی چالاکی راستەقینەی خۆی بشارێتەوە.

(ترایان) نەیدەزانی جلی سەربازیی پەیامنێرانی جەنگ بۆ خۆشاردنەوەی پۆلیس بەکار دێ.

(ترایان) حەزی لە نیشانەی پیشەکەی دەکرد. ئەزیەتی پێدەخوارد پۆلیس نیشانەکەی بەکار بێنێ.

کۆمیسۆرەکە پرسی:

-کەی دەتوانم بتبینم؟ چەند هەنگاوێك لێرە بەولاوە، نووزگەیەکم هەیە. پۆلیسەکە بە بازوو، ئاماژەی بۆ بینایەکی بەرد کرد، ئالای سێ رەنگی لە سەر بالکۆنەکەدا دەشەکایەوە.

کۆمێسەرەکە گوتی:

(لەگەڵ خانم وەرن، زۆر شانازی دەکەم لە نووزگەکەمدا، پێشوازی لە شاعیرێکی ناودارو ئافرەتێکی تۆڕنو بەدەو بکەم... کەی دەتانەوێ، وەرن.

پۆلیسەکە سەر لە نوێ، ئامادە، وەستا. داهاتەوە. بە رێزەوە، دەستی (سیلڤیا)ی ماچ کرد. سڵاوی لە (ترایان) کردو رۆیشت.

به شانی پانو پۆڕو به ڕۆیشتنی ڕاڕاو به جلی سەربازی نـویێو بـه نیشانەی (ر.پ)ی، ڕۆیشتو دوورکەوتەوه.

(سیلڤیا) گوتی:

تکایه بمبووره که ترسام . وەخت بوو ببووریێمـەوه. دەمزانـی هـیچ نییه.، بەڵام..

(مـارتیزی) هیچـی نـەگوت. بـەم هەڤدیتنـه پەشـۆکا. دڵنیـا بـوو پۆلیسەکه نەیزانیوه (سـیلڤیا) جوولەکەیـه. لـه شـوێنانی تـر،هیچ تۆڵەیان لــه جوولــەکان نەکردۆتـەوه. دختـۆر ئـەوەی خسـتبووه مێشکیەوه که خەباره، جوولەکه بیت.

(ترایان)، به بێ دەنگی دەڕۆیشت. ڕەبەلی ببـوو. (سـیلڤیا) چـووه حەوشەی بینایەیەك، له بەردی نەقاری بوو. لەو بینایەی دەکرد که دختۆری تێدا بوو. (ترایان) کەوته شوێنییەوەو له حەوشـه وەسـتا. هاتنی سەربازێك هەموو دانیشتوانەکانی تۆقاند. ئەم ماڵـەیش وەکوو ماڵی دختۆر، دەیان جوولەکەی لێ خڕ ببووەوه سەر یەكو هـەموو دەرگاکانیان لەسەر خۆیان کلیل دابوو.

(ترایان) تەماشـای کـرد، (سـیلڤیا) برادەرەکـانی مـاچ کـرد کـه، هەرچـەندە پێـنج سـەد مـەتر لـەوێ دوور دەژیـا، ده ڕۆژ بـوو نەیدیبوون. (ترایان) دەیزانی ئەگەر بچێته ناو ماڵەکه، دەیدەنه بـەر هەمان پرسیار، هەمان پرسـیار کـه دختـۆری ڕەشـبین، هـەر پێـنج

خولەك جارێك، لێی دەکرد.: (پێت وایە چ لە ئێمەی جوولەکە دەکەن؟) لە حەوشەدا مایەوە. سەری دانەواند بوو، چاوەڕێی (سیلڤیا)ی دەکرد. چەند جارێك چاوی بڵند کردو کەسانی تۆقاوی بینی لە ژوورەوە چاویان تێبڕیبوو، یەك تاکە پرسیاری ڕەشبینیان لە چاودا بوو: (پێت وایە چ لە ئێمەی جوولەکە دەکەن؟) لە پشت هەر پەردەیەکەوە، لە پشت هەر پەنجەرەیەکەوە،، بە هەمان ڕەشبینییەوە، ئەم پرسیارەی بۆ دەهات. ئەویش سەری دانەواند بوو. (ترایان مارتیزی)ی پەیامنبێری جەنگ، دەتوانیّ چ وەڵام بداتەوە؟

(سیلڤیا)، پشتی چەند خولەکێك، هاتەوە. دوو پیاوی لە دوو دەڕۆیشت، چەند کیسەیەکی قوڕسیان هەڵگرتبوو.

(ترایان) هەڵیگرتن. زۆر قوڕس بوون. بە کۆڵی خۆی داداناو شان بە شانی (سیلڤیا) ڕۆیشت. لە بن ئەو بارە گرانە کووڕ ببووەوە.

(سیلڤیا) گوتی:

-سوپاست دەکەم. تۆ نەبای، کەهال بوو من بتوانم بێم. گیانبازییەکی زۆر ترسناکە.

(ترایان)، کە لە ژێر بارەکە کووڕ ببووەوە، گوتی:

-ئاساییە! ئاسایی بوو لەگەڵت بێم.

لە ماڵی دحتۆر، وەك ئەوەی بە پەرۆشەوە، چاوەڕێی دەستەیەك بن بە ئەركێكی ترسناك دەرچوون، چاوەڕێی (سیلڤیا) و (ترایان)یان دەكرد.

(ماتیزی) بارەكەی لەسەر كۆسپەی دەرگا دانا. دەستی دایە بایسكلەكەی. چۆڕاوگەی ئارەقەی نێوچەوانی سڕییەوەو چوو، شار ببینێ.

* * *

شەڕ بڕابووەوە. تەنیا ئاگر مابوو، بەردەام گەڕەكەكانی هەڵدەلووشی. دۆستو ناسیارەكانی (ماتیزی) دیار نەبوون. كەسی نەبینی. لەم سەر تا ئەو سەر، شاری تەی كرد. كەسیان نەمابوو: سوورگوم، كوژراو، پەناهەندەو شاراوە بوون. تەنیا قەشەكان لە جێگای خۆیان مابوون. قەشە (بێسارابی)یەكان. بە جوبەی كۆنو لەبەر هەتاو كاڵ بووەوەی وەكوو جوبەی قەشەی (ئیزڤۆر). خاچی زێڕیان لە مل بوو. نیوەڕۆ، (ترایان) لە تاخی كرێكاران، فراوینی لە ماڵی قەشەیەك خوارد.

قەشەكە گوتی:

–ژیان لەسەردەمی داگیركردنی سۆڤێتیدا، بریتی بوو لە یەك شت.

هەگبەیەکی بە حەمایلی لە دۆلابێك دەرهێنا. هەگبەکە پەنجا سانتیمەتر بوو. بەندێکی پێوە بوو بۆ ئەوەی بە شانی وە بکەی. هەگبەکە چنکە نانی وشکی تێدا بوو.

قەشەکە گوتی:

-لە سەردەمی داگیرکردنی سۆڤێتیدا، هەر کەسە هەگبەیەکی وای هەبوو. لە هەر جەمێکدا، پارچە نانێکمان دەگرت‌و لە ناو ئەم هەگبەیەمان دەنا. شەو، بەر لەوەی بخەوین، هەگبەی نانە وشکەکەمان لە تەك خۆمان‌و لەبەر دەستمان دادەنا. بۆ ئەوەی لە تاریکی، بتوانین زوو بیبینینەوە. لەو ناوچانەی سۆڤییەت داگیریان کردبوو، هەموو کەس وایان دەکرد. هەموو دەیانزانی کە هەموو شەوێ مەترسی دەستگیرکران‌و سورگوم کرانیان لەسەرە. پۆلیسی سۆڤێت، هەمیشە شەو دێن. هەموو شەوێ، خەڵك خۆیان بۆ سورگوم کران ئامادە دەکرد. ئەم هەگبە نانە وشکە، تاکە شتێك بوو دەیانتوانی لەگەڵ خۆیانی ببەن. بۆ ئەوەی لە کاتی گوازرانەوەیان بۆ ئۆردووگاکانی (ئوورال)و (سیبیریا)، لە برسان نەمرن. چونکە گوازرانەوەکە چەندین‌و چەندین رۆژ درێژەی دەکێشا. دەتوانی خۆت لێی بکۆڵیتەوە، ئاخۆ یەك ماڵ لە (بێسارابی) هەیە هەگبەی نانی وشکی خۆی نەبووبێ؟ لە هەموو ماڵێك هەبوو. چونکە هەموویان، بێ بواردن، هەموو شەو چاوەڕێیان دەکرد پۆلیسی سوور سەعات دووی بەیانی بێتە سەریان.

قەشە بەردەوام بوو:

-بە پێچەوانەوە، لە سەردەمی داگیرکردنی سۆڤێتیدا، مرۆڤ خۆشییەکیشی هەبوو هیچ کەس، لە هیچ جێگای تردا، نەیبوو. .. شادیەکی گەورە بوو، هیچ شادی وا نەبووە: شادی ئەو مرۆڤەی کە بەیانی بە خەبەر دەهات لە ناو (نوێنی خۆی) بوو، شادی ئەوەی کە ئەو شەوە دەستگیر نەکرابوو. شادییەکی ئەوەندە گەورە بوو، هەموو کەس سبەینان بە رۆندکی ئاگرینەوە سوپاسی خوایان دەکرد، پێیان وابوو بەختەوەرییەکی دەگمەنیان دەست کەوتووە: بەختەوەر بوون کە بەیانی ، لە ناو پێخەفی خۆیان بەخەبەر هاتوون، نەك لە ناو فارگۆنی قەتاری سورگوم کراوان!!...ئەم شادییەیش وەکوو هەموو شادیەکی مرۆڤایەتی زۆر بەردەوام نابێ. لە ماوەی یەك ساڵدا، سێیەکێکی خەڵکی (بێسارابی)، واتە نزیکەی یەك ملیۆن کەس، سورگوم کران. ئەوانەی تریش چاوەڕێ دەکەن ساڵانی دادێ سورگوم بکرێن. هەندێ گوند هەموو خەڵکەکەیان سورگوم کراون. هەموویان!! یەك کەسیان تێدا نەماوە!. (مۆنگۆل)و خەڵکی ئاسیاییان هێناوەتە جێگەیان.

ئەو رۆژە تا ئێوارێ، (ترایان) بیری لە هەگبەی نانی وشك کردەوە. لێی کۆڵییەوە. ئێستا، خەڵك نانیان نەماوە. پشتی هاتنی هێزی رۆمانی، خەڵك نانیان لە ناو ئاو دەنواندەوەو دەیانخوارد. (ترایان)، ئێستا زانیاری لەبارەی بارو دۆخی خەڵك لە سەردەمی داگیر کردنی سۆڤێتیدا، پەیدا کردووە.

لە دڵی خۆیدا گوتی:

-هەرچی لەمەو دوا بە دەستی بێنم ، شتێکی سادەو بێ نرخە. گرنگ ئەوەیە هەموو کەس، هەموو شەو کە دەخەوتن، ئەو هەگبە نانەیان لە بن سەر بوو. ئەوەی تر گرنگ نییە. هیچ گرنگ نییە.

(ترایان) قەناعەتی هات، ئیتر هیچ شتێ نەماوە بیەوێ ببینێ. ئەرکی وەکوو پەیامنێر کۆتایی هاتووە. نەخشەی دانا لە (کیشینف) بڕوا . دەیەویست بە پایسکل، گونداوگوندو شارەو شار بڕوا تا دەگاتە (دانوب). لەوێوە بۆ (بوخاریست). دەیەویست کتێبێك لە بارەی شەهیدبوونی (بێسارابی) بنووسێ. تەنانەت ناونیشانیشی بۆ دانا بوو: (پەیامنێر لە کەنارەکانی دنی یێستەر).

ئەو شەوە، زوو خەوت. بژی خواردنی نەدەکرد. خەوتو چرای بە داگیرساوی هێشتەوە.

نیوە شەو، یەکێ، بە توندی ، لە پەنجەرەی دا. زۆر بە توندی!!

کۆمەڵە سەربازێکی کلاوخوودە لەسەرو نارنجۆك لە کەمەرو تفەنگی بە سونگی بە دەست، لە حەوشە، لە ژێر پەنجەرەی ژووری (ترایان) وەستابوون. دراوسێکان، لە پشت پەنجەرەکان بوون. هەموو رووناکییەکان کوژابوونەوە. سەربازەکان رۆمانی بوون. دەوریەی شەو بوون، تا بن ددان چەکدار بوون. دەورییەکە دوو مەترەلۆزیشیان پێ بوو.

سەرتیپ پرسی:

-تۆ (ترایان ماتیزی)ی پەیامنێری جەنگیت؟

تیشکی چرای لە رووی (ترایان) دا کە لە کونی پەنجەرەی کراوەدا قسەی لەگەڵ دەکرد.

(ترایان) وەڵامی دایەوە:

- نووسینی سەر دەرگات نەخوێندەوە؟ ئەم ئیشە چ مانای هەیە؟ بەیانی لای فەرماندە شکات دەکەم.

سەرۆکی دەوریەکە گوتی:

-ببوورە!

(ترایان) گوتی:

-بەیانی لای فەرماندە داوای بوردن بکە. ئێستا لێمگەڕێن ئیسرەحات بکەم!

بەڵام سەردەستەو سەربازەکانی دەوری، لە جێی خۆیان نەجوولانەوە.

(ماتیزی) پرسی:

-ئیتر چیتان دەوێ؟ تکایە یەکسەر لە حەوشە بڕۆنە دەرەوە!

سەرۆکی دەوریەکە پرسی:

-تۆ لەم ماڵە تەنیای؟

-کە لەسەر دەرگا نووسیومە من لەم خانووەدام ، مانای وایە، هەرچی لەم خانووەدایە لە ژێر لێپرسینەوەی مندایە. من، سەرۆکەکانی خۆم نەبێ، ئیشی خۆم بە هیچ کەس نالێم. واتە سەرکردایەتی گەورەی لەشکرو کەسی تر نا.

(ماتیزی) ویستی پەنجەرەکە دابخا. ئەوەندە بە توندی قسەی کرد، قەت شتی وا نەبووە. ترس وای کرد ئەم وەڵامە توندو کتو پڕە بدایەوە. بە کورتیو ئاسایی ترسا.. رکی لە دەورییەکان دەبووەوە. هەرچەندە خۆیشی جلی سەربازی لەبەر بوو، رکی لە جلی سەربازی دەبووەوە. چەندینو چەندین رۆژ، گوێی لە باسی دەستگیر کرانو هێرشی پۆلیس ببوو، جۆرە نیگەرانییەك رۆحی داگرتبوو. ترسێکی بێ مانا بوو. بەڵام نەیدەتوانی خۆی لێ رزگار بکا. ئایا ترسی ئەو چل جوولەکەی گرتبووەوە کە لەو ماڵە دەژیان؟ بۆی هەیە!! ترسیش درمە. خەڵ لە یەکتری دەگرێتەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا، دەیزانی ترسان لە چارەنووسی هاورێکانی، کارێکی بێ هوودەیە.

دختۆرو جوولەکەکانی تری ماڵەکە ئۆخژنیان لە خۆیان کردو هەناسەیەکی رەحەتیان هەڵکێشا. پێیان خۆش بوو کە دیتیان (سەربازەکەیان) توندەو لە دەسەڵاتەوە، قسە لەگەڵ دەورییەکە دەکا.

سەرۆکی دەورییەکە گوتی:

-جەناب،، ئێمە نەهاتووین تۆ بەرزەفت بکەین. بمانبوورە. تۆ هەقی خۆتە هەر کوێت پێ باش بێ، لەوێ بژی. تەنانەت دەتوانی پێنج نهۆم

بۆ خۆت بگری. ئەمە پەیوەندی بە ئێمـەوە نییـە. مـادام کاغـەزت لـە دەرگا داوە، پەیوەندی بە ئێمەوە نییە.

(ماتیزی) پرسی:

-ئەی بۆچی لـە پەنجەرەتان دا؟

سەرۆکی دەورییەکە گوتی:

-هەندێ جوولـەکە لـەم ماڵەدا دەژین. ئێمە ئاگاداری تـەواومان هەیـە. جوولـەکە لـەم ماڵەدا هەن. لـە بیناکانی دەورو بەری ئێرەیش هەن. ئەو جوولـەکانە خۆیان شاردۆتەوە. هاتووین تۆ ئاگادار بکەینەوە.

(ماتیزی) گوتی:

-دەزانم جوولـەکەی تێدان.

-دەزانیو لـێرەیش دەبی؟! (سەرتیپ گێژ ببوو). تۆ نازانی جوولـەکە چ دەکەن؟

(ترایان ماتیزی) دەیزانی. دەیزانی سەرکردەکانی دەستەی تیرۆریستەکان جوولەکەن. بەڵام جوولـەکەکانی ئـەم ماڵـە، هەرچـەندە جوولـەکـەن، تیرۆریست نین. بەپێچەوانەوە، ئەوانە تیرۆر دەکرێن

سەرکردەی دەورییەکە گوتی:

-ئێمە ناچارین ئاسایشی سەربازەکانمان بپارێزین. ئێمە ناچـارین ئاگـادار بین جوولـەکە سەربازەکانمان نەکوژن. ئێمە لـەبەر ئەمە هاتووین. ئەرکی

ئێمەیە هۆشداریتان بدەینێ. گەڕەك یەشتا پـاك نەکراوەتـەوە. ئێـوە لــە مەترسیدان.

(ماتیزی) تەماشای کلاوخوودە ئاسنەکانی کرد، تەماشای سونگییەکانی کرد کە بە تاریکی، لـە ژێر پەنجەرەدا دەبریسکانەوە. تەماشای نارنجۆکی کەمەری سەربازەکانی کرد. بۆچوونی دەورییەکە شتێکی ماقوولْ بـوو. ئەوان ناچار بوون ژیانی سەربازەکان بپـارێزن. (ترایـان) ســەرباز بـوو. ئیدی سەربازەکان ناچار بوون بیپارێزن. بەرگری لـە ژیانی بکەن.

(ماتیزی) گوت:

-خاوەنی ئەم ماڵـە دختۆرە. من ئێستا چارەســەر لای ئـەو وەردەگـرم. بۆیە لێرە دەژیم. ئەو، یەکێکە لـە برادەرانی خۆم. من لـە ماڵی ئەو، بـێ ترس‌و ئارخەیانم. هیچ ترسێکم نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، سوپاستان دەکـەم کە ئاوها چاوتان لـە منە.

سەردەستە پرسی:

-تۆ دڵنیای دختۆر جوولەکە نییە؟

- جوولـەکەیە. بەڵام یەکێکە لـە دۆستە دێرینەکانی خۆم. گوتم من لێرە بێ ترس‌و ئارخەیانم.

-دختۆری جوولـەکە چارەسەرو سەرپەرشتی تۆ دەکا؟

سەردەستە گێژو گەوشەك ببوو. نەیدەتوانی باوەڕ بە شتی وا بکا:

-تا ئێستا ژەهرخواردوو نەکراوی؟ سوپاسمان بکە کە لە کاتی خۆیدا هاتین.!

(ترایان) گوتی:

-پێمگوتی ئەم دختۆرە یەکێکە لە برادەرە دێرینەکانی خۆم. پیاوێکی چاکەو یەکێکە لە برادەرە دڵسۆزەکانم. مادام من متمانەم پێ هەیەو چوومەتە ژێر سەرپەرشتی وی، ئێوە چ هەقتان هەیە؟ من نە لەو دەترسمو نە لە جوولەکەکانی تر. ئەمەیەو تەواو! من ناترسم.

سەردەستە گوتی:

-(ئەرکی ئێمەیە ژیانی سەربازەکانمان بپارێزین.) ئێرە شوێنێکی دەرەك و خەبارە! تۆ دەبێ لەم ماڵە بڕۆی. ئەگەر تۆ شتێکت بەسەر بێ، بەرۆکی مە دەگرن!

(ماتیزی) گوتی:

-سبەی بەیانی، دەڕۆم. ئێستا، شەوتان باش!! سبەی بەیانی، دەڕۆم!!

سەردەستە گوتی:

-بۆ سەلامەتی خۆتانە! سەخڵەتمان کردی! بە خراپە وەری مەگرە!! ئێمە دەزانین جوولەکە چ تاوانیان لێ دەوەشێتەوە. هەموو شەوێ، کوشتن هەیە!.

سەردەستە، بەر لەوەی بڕوا، گوتی:

-ئەم شەو، زۆر ئاگادار بە! ئەگەر کەوتیتە بەر هێرش، تەقە بکە! یەکسەر لێیان ئاگر دە! دەوروبەر لە جادە هەیە، هەر سەد مەتر دوورن!. دەگەنە هانات. بەڵام زۆر وریا بە! دەرگای ژوورەکەت باش گارە دەو سبەی لەگەڵ گەردوگۆڵی بەیانی، لێرە برۆ.

(ماتیزی) خەندەیەکی تاڵی کرد. سوپاسی سەردەستەی کرد بۆ ئامۆژگارییەکانی.

(ترایان) لە دڵی خۆیدا گوتی: (ئەگەر بزانن چەکم نییە، زراویان دەچی!)

گوێی دایە دەنگی دراوسێکان. لە ژوورەکانی تەنیشت دەجوولانەوە. وروژابوون. (ترایان)یش وروژا بوو. دەستی بە ئامادەکردنی کولەپشتەکەی کرد. ئەو شەوە، ئیتر خەوی لێنەکەوتەوە. دۆخێکی زۆر ناخۆش بوو!! حەزی دەکرد لە کتێبەکەیدا باسی بکا. بەڵام دڵنیا بوو ئەم بەشە قەدەغە دەکرێ، هەروەکوو بەسەرهاتی گەنمی سەربڕاویش قەدەغە دەکرێ

سبەینەی رۆژی پاشی، (ترایان) بە کەلەجارِی روخسەتی لە دختۆر وەرگرت. حەزی نەدەکرد ئەو چل جوولەکەیە جێ بێڵێ‌و بێ ئەوەی ئاشنایەتییان لەگەڵ پەیدا بکا، بروا. (ترایان) ویستی لە دختۆر بپرسێ بۆچی ئەوانەی ماڵەوە خۆی لێ دەشارنەوە. بەڵام رای خۆی گۆڕی. رەنگە نەیانویستبێ سەخڵەتی بکەن! کێ دەزانێ؟! ئەستەمە مرۆڤ لە

بیری یەکێکی تر بگا، ئەگەر لە هەڵوێستێکی وەکوو هەڵوێستی ئەو نەبێ. (ماتیزی)یش هەڵوێستی وەکوو جوولەکەکان نەبوو.

(ترایان) گوتی:

-نووسینەکە لە سەر دەرگا جێ دێڵم، نامەیەکیش دەنووسم کە، تا دێمەوە ئەم ژوورە هی منە! بەم جۆرە سەرباز نایەنە ناو ئەم ماڵە. ئێوە بڵێن کە من بۆ ماوەی بیستو چوار سەعات رۆیشتوومو لەو ماوەیە، دێمەوە. دەسەڵاتدارانی رۆمانی دێنو هەموو کاروبار رێک دەخرێ. بۆ ئێستا، لێگەڕێن نووسینەکەم لەسەر دەرگا بێ. هیوادارم خودا لە پەنای خۆتان گرێ!!. هەر خوا دەتوانێ، بە راستی، بە هانای مرۆڤەوە بێ.

(ترایان) کوڵەپشتەکەی لەسەر پایسکلْ قایم کرد. بە دەست ئاماژەیەکی کرد. دەمو چاوی (سیلڤیا) لە پەنجەرەو لە پەنا پەردە دەرکەوت. دەگریا.

(ماتیزی) گوتی:

-خودا لە پەنای خۆتان گرێ!

بە پایسکل چووە سەر جادەی پڕ سەرباز.

# (١٨)

(ماتیزی)، کە لە بەرەی شەڕ گەڕایەوە، گۆڕابوو. سێ مانگی پێ چووبوو. چاکەتەی رەنگی دابووەوە. چاکەتێکی هاوینی بوو. خۆی، لە (پروت)و لە (دنی یێستەر)و لە (دانووب) شووشتبووی‌و لەبەر خۆر وشکی کردبووەوە. چەکمەکەی داڕزابوو. نیشانەکەی سەر سینگی چاکەتی‌و خوارگیرفانی راستەی، رەنگی کاڵ ببووەوە. تەنیا گوڵی ئاسن، گوڵی فەرووەی سەر بێرییەی شکاری چیایی نەگۆڕابوو.

سەرهەنگ (ستانکۆڤ) پرسی:

-بۆ وا زوو گەڕایتەوە؟

خۆی پیاوێکی میهرەبان‌و بە ئەدەب بوو بەڵام گەڕانەوەی (ماتیزی)ی پێ خۆش نەبوو. بە هاتنەوەی (ماتیزی) قەڵس بوو.

(ترایان) گوتی:

-هیچ نەمابوو ببینم. بۆ ئەوە چووبووم لە رزگاری (بێسارابی) ئامادە بم. ئێستا (بێسارابی) رزگار بووە. هێزەکانمان، دوورتر دەڕۆن، بۆ ناو

رووسیا. تا دوا شاری رۆمانیا رزگار بوو، من لەوێ مامەوە. هەموو قۆناغەکانی ئەو شەڕەم بینی. هاتمەوە تا چی لەوێ دیومە بە شێوەی کتێبێك بە خەڵکی بگەیەنم.

سەرهەنگ پرسی:

-حەزت نەکرد لەگەڵ ئەو سەربازە رۆمانییانەی چوونە ناو رووسیا، لە (دنی پێستەر) بپەڕیتەوە.؟

(ماتیزی) گوتی:

-جەنگی سەربازەکانمان لەناو رووسیا، جەنگێکی ترە. جەنگی رزگاری نییە. شتێکی ترە.

سەرهەنگ گوتی:

-ئەو جەنگەیش کە لە سەر خاکی رووسیایە، جەنگی رزگارییە. ئەگەر سۆڤێتەکان تێك نەشکێن، سەر لە نوێ دێن داگیرمان دەکەن. کە گورگ دێتە حەوشەتو هەموو مالاّتت دەخنکێنێ، نابێ تەنیا تا دەرگا راوی بنێی. دەبێ تا ناو کونەکەی لە دووی نەبیتەوەو لە ناوی ببەی! وا نەبێ، گورگەکە دووبارە دێتەوە. لە بارەی رووسیایش هەمان شتە. جەنگی ئێمە لە ناو خاکی رووسیا، هێشتا هەر جەنگی بەرگرییە!

(ترایان) گوتی:

-بۆ ئێستا، حەز دەکەم (پەیامنێر لە کەنارەکانی (دی یێستەر) بنووسم.

داوای یەك مانگ روخسەتی لە سەرهەنگ کرد. سەرهەنگ رازی بوو، بە مەرجێ لە (بوخاریست) بمێنێتەوەو نەچێتەوە (ئیزفۆر)، وەکوو داوای کردبوو.

سەرهەنگ لە (ماتیزی) پرسی بە تەمایە چ شتێ لە کتێبەکەی بنووسێ. (ماتیزی)، وەکوو کاری هەموو شەوێکی لە رۆژنامەدا، باسی چەند سەد رووداوێکی جیاوازی لە (بێسارابی) هێنابوو. رووداوەکان، رووداوی جیاوازی کاتی جەنگ بوون. نە رووداوی پاڵەوانێتی بوونو نە باسی قارەمانێتی ژەنەراڵەکان بوون. نە کردەوەی سیاسی بوون. تەنیا کارەساتی دڵتەزێنی سادەو مرۆڤایەتی کاتی داگیرکرانو رزگارکران بوون. نەهامەتی شێنی (بێسارابی) بوون.

سەرهەنگ یاری بە قەڵەمەکەی دەکردو بە رەبەڵی گوێی رادێرا بوو. کتێبەکەی (ماتیزی) لە رادەبەدەر (مەدەنی) بوو. نەدەکرا، نە لە سایەی سەرکردایەتی گەورە، نە لە سایەی وەزارەتی راگەیاندن، بڵاو بکرێتەوە. کتێبی خۆی بوو، کتێبێکی تایبەتی بوو.

رۆژی پاشی، (ماتیزی) دەستی بە نووسین کرد. بە درێژایی رۆژ، لە (بەشی ناوخۆ) دەینووسی. ئێوارانیش، کاغەزەکانی دەبردە دەزگای بڵاوکردنەوە. کە نووسینی کتێبی (پەیامنێر لە کەنارەکانی دنی یێستەر)ی تەواو کرد، کتێبەکە تەواو بوو و یەکسەر کەوتە

کتێبخانەکان. ڕۆژی چوارەم یەك دانەی نەما. هەمووی فرۆشرا. چـاپی دووەم لـە ماوەی حەفتەیەك وای لێهات دەست نەدەکەوت. خێرا چاپی سێیەمو چوارەمو پێنجەم، یەك لـە دوای یـەك بـڵاو کرانـەوە. هـەموو عالـەم (پەیامنێر لـە کەنارەکانی دنی پێستەر)یان دەخوێندەوە. بە مـاوەی چەند حەفتەیەك، (ماتیزی) هەستی کرد ناوبانگی دەرکـردووە. وێنـەی لــە هــەموو جامخانــەکانو کتێبەکــەی لــە هــەموو ماڵێــك هــەبوو. کتێبەکەی،کتێبی ڕزگاری (بێسارابی) بوو. وەزارەتی پەروەردەی میللی بەشێکی (پەیامنێر لـە کـەنارەکانی دنـی پێسـتەر)ی خسـتە نـاو کتێبـی پرۆگرامی خوێندن.

(ترایان) ئێستا، کە سەرکەوتنی بە ڕاسـت گـەڕا، بڕیـاری دا بچـێتەوە (ئیزڤۆر) بۆ ئەوەی کەسو کاری لـە خۆشیی سـەرکەوتنەکانی بەشـدار بکا.

پایز بوو. بەهاری ئەو ساڵـە (ترایان) پاسەوانی مۆری ژێرزەمینی دووەمی سەرکردایەتی گەورە بوو. ئێسـتا ببـوو بـە نووسـەرێکی نـاودار. ئەمـە هەمووی لە ماوەی چەند مانگێك!! لـە ماوەی یەك هاوین ڕووی دا.

(ترایان) سەعات هەشتی بەیانی، لـە (بەشی ناوخۆ) دەرچوو بـۆ ئـەوەی ڕوخســەتێك لــە ســەرهەنگ (ســتانکۆڤ) وەربگــرێ. لــە ڕێگــای سەرۆکایەتی، لـە دوو هاوڕێی ڕۆژنامەکـەی ڕاسـت هـات: (مـیرون)و (بادیا). ئـەم دووانـە کۆمۆنیسـت بـوون. (ترایـان) دۆسـتانە سـڵاوی

لێکردن. برادەرەکانی بە تووڕەیی روویان لێوەرگێڕا. (ترایان) چووە لایانەوە.

پرسی:

– ئایا من قەت خراپەم بۆ ئێوە بووە؟ بۆچی سەلامم لێوەرناگرنەوە؟ بۆچی رووتان دەکەنە ئەولا؟

(بادیا) گوتی:

–ئێمە سلاّو لە خاینان ناکەین. تۆ کابرایەکی خاینی. (پەیامنێر لە کەنارەکانی دنی یێستەر) کۆمەڵە درۆیەکی بێ چووڕووانەیە!! سەرلەبەری هەڵەو ناتەواوییە! هەموو لاپەڕەکانی ئەم کتێبە پڕ کراون لە درۆ!

(بادیا)و (میرون) دەستنووسی کتێبەکەیان خوێندبووەوە. لە بارەی هەموو شتێکەوە گفت‌وگۆیان لەگەڵ (ترایان) کردبوو. چاوەڕوانی گلەوگازاندەیان لێ نەدەکرا.

(بادیا) گوتی:

–کتێبەکەت بە چاوپێکەوتنێك لەگەڵ زینندانیانی سۆڤێتی دەست پێدەکا. تۆ باسی نقوومبوونی لۆتکەیەکی سۆڤێتی، لە نزیك (کۆنستانزا)، دەکەی‌و دەڵێی دوای نقوومبوونی لۆتکەکە لاشەی دەریاوانە رووسەکان، ماوەی دوزادە سەعات، لەسەر شەپۆڵەکانی دەریای رەش، دەگەڕا. شتی وا کەهالە. لاشەی نقوومبووان دەکەوێتە بن ئاو. لاشەکان یەکسەر بە بن ئاو دەکەون‌و تا چەند رۆژ بەسەر ئاو ناکەونەوە. کەچی تۆ نووسیوتە لاشەی خنکاوەکان لەسەر ئاو دەگەڕا.

ئەمە درۆیەکی بە سۆرە سۆرە!. سەراپای کتێبەکە، هەر هێندەی ئەم باسە راستی تێدایە.

دوو برادەرەکە پشتیان لە (ترایان) کردو رۆیشتن. بێ ئەوەی تەماشای بکەن و بێ ئەوەی خواحافیزی لێ بکەن، رۆیشتن. بە بێزاری، بە سووکایەتی، جێیانهێشت. (ماتیزی)، بە ورِو گێژی، لە چەقی جادە مایەوە. راستە، کتێبەکەی بەم باسە دەستی پێدەکرد. چی زیندانییە رووسەکان بۆیان باس کردبوو، ئەو، ئەوەی نووسیبوو. دەریاوانەکان پێیانگوت لاشەی خنکاوەکان لەسەر ئاو دەگەرِا. ئەویش پێی باوەرِ کردن، هەرچی پێیان گوت، نووسی. راستە ئەوەی بخنکێ دەکەوێتە بن ئاو. ئەمە راستە!! (بادیا)و (میرون) راست دەکەن. هەڵەکەی پینە ناکرێ. (ترایان)، وەکوو رۆژنامەنووس، هەتا هەتایە بەدناو دەبێ. ئاری! بەدناو!! پێنج چاپی (پەیامنێر...) فرۆشراوە. تازە راست ناکرێتەوە.

(ترایان) لە دڵی خۆیدا گوتی:

-لەگەڵ ئەمەیشدا، دیلەکان بە راستیان بوو کە باسی ئەم دیمەنە جگەربرِەیان بۆ کردم.

دیارە درۆیان لەگەڵ کردووە. تیزیان پێکردووە. ئەمە ئاشکرایە. لەگەڵ ئەمەیشدا، (ترایان) باوەرِی نەدەکرد فریودرابێ. کە دیلەکان قسەیان دەکرد، تماشای دورِ چاویان دەکرد. ئەو، هەستی دەکرد درۆ ناکەن. لەگەڵ ئەمەیشدا، دیارە درۆیان کردووە.

دوای چەند خولەکێك، (ترایان) چوار چوار لە پایەکانی سەرکردایەتی گەورە سەرکەوت. نائومێدو هەناسە سارد بوو.

بۆ روخسەت وەرگرتن، لەچووە لای (ستانکۆڤ). چووە نووزگەی هێزی دەریایی. داوای دۆسیەی نقوومبوونی لۆتکەی سۆڤێتی کرد. دەیزانی هیچ شتێ نییە لێیبکۆڵێتەوە. دەیزانی مرۆڤی خنکاو دەکەوێتە بن ئاو. ئەمە یاسایەکی سروشتییە. یاسایەکی گردەبڕە. هیچ شتێ نییە بۆ لێکۆڵینەوە. تازە بەدناو بووە. هەرگیز ناتوانێ چیدی راپۆرت بنووسێ. هەرگیز!!

دۆسییەکە، قسەی سۆڤێتە رزگارکراوەکانو تاقمی کەشتی رزگاریی رۆمانی تێدا بوو. (ماتیزی)، بە نائومێدی لاپەڕەکانی هەڵدایەوە. قسەی فەرماندەی رۆمانیی کەشتی رزگاری لەبەردەم بوو. بە دەست نووسرابوو. یەکەم رستەی ئەمە بوو: (لاشەی هەموو دەریاوانەکانی سۆڤێت، بەوای کەمەربەندی رزگارییان، ، لە سەر شەپۆلەکان دەگەڕا.)

(ماتیزی) دۆسییەکەی پێوەدا. وەك دوعا بکا، دەستەکانی لە سەر سنگی تێکپەڕاند. فرمێسکی شادی لە چاو هات. لە دڵی خۆیدا گوتی: (دیلەکان درۆیان نەکردووە. هیچ کەس ناتوانێ، درۆی وا گەورە لەگەڵ یەکێکی تر بکا. مردووەکان بە راستی لەسەر ئاو دەگەڕان. مردووەکان کەمەربەندی رزگارییان بەستبوو...)

پیشەی (ترایان ماتیزی) رزگار بوو. لە بیری چوو داوای روخسەت بکا. بە راکە راك ملی بە جادەوە نا. مەیلی گۆرانی گوتنی هەستا. لە یەکەم پێچی رێگادا، دواسەفیری رۆمانی بۆ مۆسکۆ بینی. (ترایان) زۆر بە کەیف بوو، بە پێکەنینەوە، سەلامی لێکرد. سەفیر راوەستا. شانی (ترایان)ی گرت. پیرۆزبایی سەرکەوتنەکەی لێکرد.

سەفیر گوتی:

-تۆ بەهرەیەکی گەورەت هەیە. زۆر بە وردی کتێبەکەتم خوێندەوە. بەردەوام لەگەڵ چالاکییەکانت دام. تۆ تەمەنت بیستو یەك ساڵە. تۆ لە سەرەتای کارەکەتو لەسەرەتای ژیانتدای. کارەساتە کارەکەتو ژیانت تێك بشکێنی!! من بام لە جێگای تۆ، یەکسەر (پەیامنێر لە کەنارەکانی دنی پێستەر)م لە دوکانی کتێبفرۆشەکان وەردەگرتەوە.

(ماتیزی) گوتی:

-تۆ، یەکەم جار پێم دەڵێی کتێبەمت پێ خۆش بووەو پیرۆزبایم لێ دەکەی، کەچی پاشدان، ئامۆژگاریم دەکەی لە دوکانی کتێبفرۆشەکان وەری بگرمەوە؟ ئەمە یانی چی؟ من تێناگەم!.

- رام لە کتێبەکەتە، بۆیە ئامۆژگاریت دەکەم کۆی بکەیتەوە. من رووسیا دەناسم. ماوەیەکی زۆر لە (کرێملین) سەفیر بووم. سۆڤێت هێزێکی زەبەللاحە! سۆڤێت شەڕ دەبەنەوە. سامانێکی لە بن نەهاتوویان هەیە، بۆیە لە جەنگ دەبەنەوە . لە ئێستاوە، تا چەند ساڵی دیکە،

رۆمانیاو ئەورروپاو دوایی، تەواوی دونیا دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی سۆڤێتی. تۆ بە کتێبەکەت، خۆت فەرمانی تاوانبارکرانی خۆت مۆر کردووە. تۆ کە لە دژی سۆڤێتت نووسیوە، ئایندەی خۆت لەناو بردووە. بەیانی تۆ دەبی بە پیاوێکی شوونبزر، بە پیاوێکی تاوانبار.

(ماتیزی) گوتی:

- چی لە کتێبەکەمدا نووسیومە، هەمووی راستە. خۆم هەموو شتێکم ساغ کردۆتەوە.

- نووسین لە دژی سۆڤێت وەکوو خۆکوشتن وایە. من خەمی تۆمەو ئامۆژگاریت دەکەم ئەم کتێبە بکێشیتەوە. خراپە کردن بەرامبەر سۆڤێت ، هەڵەیەکە پڕ نابێتەوە.. ئەمە لەوجرییە، (ژیانی خۆت)ی لەسەر دادەنێی! تێگەیشتی؟! ژیانی خۆت...!!

(ترایان) پرسی:

-یانی ئامۆژگاریم دەکەی راستی نەنووسم؟

سەفیر گوتی:

-ئەگەر راستیش بێ، من بم نایونووسم. بیر لەوە بکەوە کە تازە پێمگوتی. پیاوێکی دونیادیتەی وەکوو من قسەت بۆ دەکا.

سەفیر رۆیشت. (ترایان) بیری لە ئامۆژگارییەکەی کردەوە. رەق راوەستاو بیری کردەوە. ئاخۆ دەشێ رووسیا لە جەنگ بباتەوە؟ خۆزگەی بە شتی وا نەدەخواست، بەڵام شتەکە لەوالەیە بێتە دی. ئەگەر رووسیا بباتەوە، (ترایان ماتیزی)، لەبەر ئەوەی ئەم کتێبەی نووسیوە، دەکەوێتە زیندان، دەکوژرێ! خۆی ئەمەی دەزانی. دڵنیا بوو

رووسەکان دەیکوژن. لەگەڵ ئەمەیشدا، سوور بوو کتێبەکە نەکێشێتەوە. هەرچی نووسیبووی -ڕەنگە خراپی نووسیبێ- بەڵام هەمووی ڕاستیی بوو.

لە دڵی خۆیدا گوتی: (شاردنەوەی ڕاستی بۆ نەجاتدانی ژیان، کارێکی کرێتە. ئەگەر داپۆشینی ڕاستی، بە بەرگێکی ساختە، لای دیپلۆماتی پێر پەسند بێ، بە لای گەنجو بە لای شاعیرانەوە، کارێکی قێزەوەنە. گەنجو شاعیرو قەشە دەبێ ڕاستی بڵێن. نابێ بیر لەوە بکەنەوە ئاخۆ ئەم ڕاستییە سوودیان پێدەگەیەنێ؟، یان بەرەو مەرگیان دەبا؟ مرۆڤ کە گەنج، یان قەشە، یان شاعیر، بێ، سازش لەسەر ڕاستی ناکا! (ترایان) بڕیاری دا سەودا لەسەر ڕاستگۆیی خۆی نەکاو نەخشە بۆ بانەڕۆژ دانەنێ. ئەمە بۆ سەفیر باشە. پیاوی سیاسەت ئازادە ساختە بکا، بەڵام ئەو شاعیرە!

(ترایان) چووە دوکانی کتێبفرۆشێك. کتێبفرۆشەکە دۆستی خۆی بوو. کابرا بە ساردی سەیری (ترایان)ی کرد.

کتێبفرۆشەکە پێیگوت:

-من هیچ دوژمنداریم لەگەڵ تۆ نییە. بەڵام زۆر نارەحەتم. تۆ بە کتێبەکەت (پەیامنێر لە کەنارەکانی دنی یێستەر) زۆرت خراپە لەگەڵ جوولەکەی هاودینیی من کردووە. ئێمەی جوولەکە دەزانین، ئەو شتانەی تۆ لە کتێبەکەتدا باست کردووە، بە ڕاستی ڕوویان داوە. هەمووی ڕاستە! بەڵام بە باس کردنی ئەو شتانە کەشێکی دژی هەموومانت دروست کردووە.

(ترایان) گوتی:

-بەلاّم من نیازی شتی وام نەبووە. خۆت دەزانی زۆربەی برادەرەکانی من جوولەکەن.

-دەزانم تۆ نیازت نەبووە خراپە لەگەڵ جوولەکان بکەی! من لەوە دڵنیام. من تۆ دەناسم. تۆ نەتویستووە زەبر لە جوولەکەکان بدەی. لەگەڵ ئەمەیشدا، کتێبەکەت زەبر لە هاودینەکانی من دەدا.

(ماتیزی) پرسی:

-باشە چ بکەم؟ ئایا دەکرێ ئەو شتانە نەنووسم کە بە چاوی خۆم دیومە؟ ئەگەر تۆ لە جێگای من بای، چت دەکرد؟

- ئەگەر من لە جێگای تۆ بام، بەو تەمەنەی هەمە، راستیم نەدەنووسی. تەنانەت ئەگەر شتەکە راستیش بوایە!! بیرم لە ئەنجامەکەی دەکردەوە. بەلاّم ئەگەر لە تەمەنی تۆبام، دڵنیام هەمان هەڵەی تۆم دەکرد. بێ ئەوەی بیر لە ئەنجامی کارەکە بکەمەوە، دەمکرد... گەنج لێك نادەنەوە. من دەزانم. بۆیە لێت توورە نیم. بەلاّم نارەحەتم. چونکە تۆ خراپەت لەگەڵ کردووین. خراپەیەکی گەورە!!

(ترایان) دەستی لەسەر شانی کتێبفرۆشەکە دانا. ئەمە برادەرێك بوو چاکەی ئەمی دەویست. (ترایان) پرسی:

-چۆن دەتوانم تۆڵەی بکەمەوە؟

کتێبفرۆشەکە گوتی:

-تۆ بەهرەت هەیەو هەموو ژیانت لە پێشە بۆ ئەوەی تۆڵەی بکەیتەوە. ئەمە سووچی تۆ نییە. سووچی تەمەنە...

(ترایان)، بە غەمبارییی، لە دوکانی کتێبفرۆشییەکە رۆیشت. گەڕایەوە (بەشی ناوخۆ). بەڵام ئەوەندە بەزگ و غەمبار بوو بە تەنیا هەڵینەکرد. چووە سەرکردایەتی.

سەرهەنگ (ستانکۆف)، کە دیتی (ترایان) هات، گوتی

-تازە بە تەمابووم لە دووت بنێرم. دانیشە! پێویستم بە پەیامنێرێکی باشە، پەیامنێرێکی زۆر باش! سبەی بەیانی دەچیتە (کریمی). هێزەکانی رۆمانیا لەوێ دەستیان بە زنجیرە کردەوەیەکی گرنگ کردووە. زنجیرەیەك راپۆرتم لە بارەی (کریمی)ەوە بۆ دەنووسی. تۆ لەگەڵ سەربازانی شکارچی بووی. ئەوان ئێستا لە (کریمی)ن.

(ترایان) تەماشای فەروەی بێرییەی خۆی کرد کە لەسەر زرانی خۆی دانابوو.

سەرهەنگ گوتی:

سبەی سەعات حەفت لێرە دەبی، ئامادە دەبی بڕۆی!

(ترایان) قیت بووەوە. بیری کردەوە، چی وەڵام بداتەوە. دوای ئەوەی زۆر بیری کردەوە. زانی تەنیا یەك وەڵام هەیە.

گوتی:

-بە چاوان!! سبەی بەیانی دەچمە (کریمی).

## (١٩)

(ماتیزی) کەلو پەلی خۆی بۆ چوونە (کریمێ) ئامادە کرد: مەکینەی تراش، سابوون، مەعجوونی دگان، فلچەی ددان، چەند پاکەت جگەرە، کفتك، دوو کراس. کەلو پەلی کەمتری دانا لەو کاتەی چووە (بێسارابی). دوای ئەوەی هەموو شتەکانی لەناو کولەپشتەکەی نا، لە (بەشی ناوخۆ) دەرچوو، چووە (ئاتێنێ پالاس). ئەمە گەورەترین کافەی (بوخاریست) بوو. ئەستێرەو پیاوە گەورەکانی دەرەوە، کە رێیان دەکەوتە رۆمانیا، دەچوونە ئەوێ. ئەو ئێوارەیە، (ترایان) بۆ یەکەم جار، بە بێ ئیش چووە ئەوێ. بۆیە چووە ئەوێ چونکی زۆر روناك بوو، رۆژنامەنووسان (ترایان)یان داوەت کرد بۆ سەر مێزی خۆیان.

رۆژنامەنووسێك گوتی:

- (تیتۆس) لەگەڵ سەفیری ئەمریکا چۆتە (واشنتۆن).

هاورێکانی (ترایان) بە گەرمو گوڕی گفتوگۆیان لەسەر ئەم رووداوە نوێیە کرد. پێش چەند حەفتەیەك، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

جەنگی لە دژی رۆمانیا راگەیاند. سەفیری ئەمریکا بە قەتارێکی تایبەتی لە (بوخاریست) رۆیشت. (تیتۆس)یش لەگەڵ دپلۆماتە یانکییەکان، لە قەتارەکەدا بوو. پۆلیسی سنوور پەشۆکا بوون. بەلاّم ئیشی (تیتۆس) هەمووی یاسایی بوو. ئەو، هاوڵاتییەکی ئەمریکیو کارمەندێکی سەفارەت بوو. هەموو بەڵگەو کاغەزەکانی دروست بوون. تەنیا ئەو گازاندەیەی لێدەکرا بۆچی، بێ ئەوەی ناچار بووبێ، وەکوو ئەفسەرێك بە جلی سەربازیی رۆمانی جەنگاوە. ئەمە نیشانەی دڵسۆزیەتی. دەسەڵاتداران روخسەتیان دا بڕوا.

رۆژنامەنووسەکان گوتیان:

- (تیتۆس) کەمۆترین سیخورِ بوو. شۆفارێکی راستەقینە بوو. بڕەسانێکی گەورە بوو! (ترایان)، ئایا قەت داوای لێ نەکردی سیخوری بۆ ولاّتە یەکگرتووەکان بکەی؟ تۆ نزیکترین برادەری بووی!

(ترایان) تا بناگوێی سوور هەڵگەڕا.

گوتی:

-راستی، با!! کاتێ لە (یاسی)، چاوم پێکەوتو شەو لە وارخانەی ئەو خەوتم، بە ئاشکرا داوای لێکردم. بەلاّم ئەوسا، تێنەگەیشتم چی دەوێ . ئەوە تازە تێدەگەم!

(ترایان) باسی ئەو تاقمە تراشەی گێڕایەوە کە تەنیا بە سەربازانی ئەمریکایی دەدەن. هێشتا قسەکەی (تیتۆس)ی لە گوێدا دەزرنگایەوە (تۆ لێم ناپرسی ئەم تاقمە تراشەم چۆن دەست کەوت؟)

(ترایان) گوتی:

-خەوم دەهات‌و هیچم نەپرسی. ئێستا تێدەگەم دەیەویست چ بڵێ دەیەویست داوام لێ بکا لە بەرەی شەڕەوە، زانیاری بۆ دەزگای سیخوڕی ئەو رەوانە بکەم. هەر چا بوو، تێنەگەیشتم!!

رۆژنامەنووسێك پرسی:

-خەفەتی پێ دەخۆی؟!

(ترایان) بە تووڕەیی گوتی:

-خەفەت بە چ بخۆم؟! خەفەت بخۆم کە تێنەگەیشتووم داوای لێکردووم ببم بە خاین؟ ئەگەر بمزانیایە بۆچی تاقمە تراشەکەی دەداتێ، یەك زللەم لە بناگوێی دەدا! ئێمەی رۆمانی، لەم جەنگەدا هەڵوێستمان روون‌و ئاشکرایە: ئێمە لە دژی داگیرکردنی سۆڤێتی دەجەنگین. ئێمە لە پێناوی رزگاری دەجەنگین. ئەوەی بێ با هاوپەیمانی رووسەکان، خیانەت لە وڵاتی خۆی دەکا! لە کڵێسەی خۆی دەکاو چاو لە ئازادی دەپۆشێ. ئەوەی لای رووسەکان بێ هاوپەیمانێکی دوژمنە. من خاین نیم. بە لای منەوە، هیچ هاوکارییەك

لەگەڵ داگیرکەرانی وڵاتەکەم، واتە لەگەڵ ڕووسەکان نییە. لەگەڵ هاوپیلانانی رووسەکان، واتە یانکییەکانیش نییە.

(ترایان) تەماشای سەعاتی کرد. دەبێ بڕوا. بەیانی رۆژی پاشی، دەچێتە (کریمێ). خواحافیزی لە برادەرەکانی کرد. رۆژنامەنووسێك، تازە لە (بێسارابی) هاتبووەوە، لە جێگای ئەو، لە پشت مێز دانیشت.

گوتی:

-هەموو جوولەکەکان بۆ کەنارەکانی (بەگ)و بۆ (ئوکرانیا) ئەڤەرۆز کراون.

(ترایان) بە وردی گوێی قولاغ کرد. قسەکانی دختۆری (کیشینف)ی بیر کەوتەوە کە بە نائومێدی لێیپرسی: (تۆ پێت وایە چ لە ئێمەی جوولەکە دەکەن؟). (ترایان) ئەوسا، وەڵامی دایەوە: (ئێوە هیچتان بەسەرنایە؟ لە رۆمانیا، هیچ شت لە دژی جوولەکەکان نەکراوە. لە (بێسارابی)یش هیچ ناکەن.)

(ماتیزی) پرسی:

-حوکوومەتی رۆمانی جوولەکەی سورگوم کردوون؟ مارشال (ئەنتۆنێسکۆ)) بەڵێنی دابوو کە حوکوومەتەکەی رێزی مرۆڤ دەگرێ، پەیڕەوی سیاسەتی رەگەزپەرستی ئەڵمانیا ناکا... ئایا سیاسەتی حوکوومەتی رۆمانی، خەتی خۆی گۆڕیوە؟ ئایا حوکوومەتی رۆمانی فەرمانی سورگومی دەرکردووە؟!

ئەو رۆژنامەنووسەی لە (بێسارابی) هاتبووەوە، گوتی:

-حوکوومەتی رۆمانی هەرگیز فەرمانی سورگوم کردنی نەداوەو نادا. تا کۆتایی جەنگ، حوکووماتێکی سەربازی، (بێسارابی) بەرێوە دەبا. حوکوومەتە سەربازییەکەیە فەرمانی سورگوم کردنی دەرکردووە، نەك حوکوومەتی رۆمانی. حوکوومەتی (بێسارابی) خودموختارو سەربەخۆیە.

(ماتیزی، ملی رێی (بەشی ناوخۆی) گرت. بیری لە (سیلڤیا)، لە دختۆری (کیشینف) دەکردەوە. ئەوانە ئێستا سورگوم کراون بۆ رووسیا. (ترایان)، کە ئەو رۆژە، لای کتێفرۆشە جووەکە، ئەوەندە سوور بوو لەسەر راستی، بیری کردەوە پێویستە ئێستا وتارێك لە بارەی سورگومکرانی جوولەکەکانی (بێسارابی) بۆ کەنارەکانی (بەگ)، بنووسێ. بەڵام نەیدەتوانی. سانسۆر هەبوو. نەیدەتوانی دەربارەی جوولەکەکانی (بێسارابی) بنووسێ کە حوکوومەتی سەربازی سورگومی کردبوون. هەرچەندە شتەکە راستیش بوو. (ترایان)، کاتێ لە پلەکانی (بەشی ناوخۆ)، سەردەکەوت، لە دڵی خۆیدا، گوتی: (ئەگەر رووسەکان لە جەنگدا سەر بکەون، هیچ پەیامنێرێکی رووسی، یان ئەمەریکی باسی ئەو رۆمانیانە ناکا کە لە (بێسارابی)، بە دەستی پارتیزانە رووسەکان کوژراون!. منیش ناتوانم قسە لە بارەی ئەو جوولەکانە بکەم کە بۆ کەنارەکانی (بەگ) سورگوم کراون. من لە بەرەی شەڕی لای خۆم، راستی ئاشکرا دەکەم. پەیامنێرانی دوژمنیش

نیوەکەی تری راستیی ئاشکرا دەکەن. بەم چەشنە، لە ئەنجامدا: راستیی، هەموو راستی دەردەکەوێ! ئەرکی من ئەوە نییە، زۆر بە وردی هەموو شتێ باس بکەم. بەڵکو ئەرکی من ئەوەیە بەو پەڕی راستی، باسی ئەو کارەساتانە بکەم کە دوژمن لەسەر خاکی ئێمە کردوویەتی. پەیامنێری دوژمنیش باسی خراپەکانی ئێمە لە سەر خاکی ئەوان، دەکا. بۆچوونەکانمان، هەرچەندە ناکۆکیش بن، دوو نیوەی یەك راستی پێك دێنن. هیچ پەیامنێرێك ناتوانێ لە نیوەی راستی زیاتر بنووسێ. بەلاّم ئەم نیوەیە، دەبێ بە راستگۆیی‌و بێ کەم‌وکورتی بنووسرێ. چونکە پەیامنێر بە بێدەنگی دەیگوازێتەوە.

ئەو رۆژنامەنووسەی لە (بێسارابی) هاتبووەوە، گوتی:

-حوکوومەتی رۆمانی هەرگیز فەرمانی سورِگوم کردنی نەداوەو نادا. تا کۆتایی جەنگ، حوکووماتێکی سەربازی، (بێسارابی) بەرێوە دەبا. حوکوومەتە سەربازییەکەیە فەرمانی سورِگوم کردنی دەرکردووە، نەك حوکوومەتی رۆمانی. حوکوومەتی (بێسارابی) خودموختارو سەربەخۆیە.

(ماتیزی، ملی رێی (بەشی ناوخۆی) گرت. بیری لە (سیلڤیا)، لە دختۆری (کیشینف) دەکردەوە. ئەوانە ئێستا سورِگوم کراون بۆ رووسیا. (ترایان)، کە ئەو رۆژە، لای کتێفرۆشە جووەکە، ئەوەندە سوور بوو لەسەر راستی، بیری کردەوە پێویستە ئێستا وتارێك لە بارەی سورِگومکرانی جوولەکەکانی (بێسارابی) بۆ کەنارەکانی (بەگ)، بنووسێ. بەلام نەیدەتوانی. سانسۆر هەبوو. نەیدەتوانی دەربارەی جوولەکەکانی (بێسارابی) بنووسێ کە حوکوومەتی سەربازی سورِگومی کردبوون. هەرچەندە شتەکە راستیش بوو. (ترایان)، کاتێ لە پلەکانی (بەشی ناوخۆ)، سەردەکەوت، لە دڵی خۆیدا، گوتی: (ئەگەر رووسەکان لە جەنگدا سەر بکەون، هیچ پەپامنێرێکی رووسی، یان ئەمەریکی باسی ئەو رۆمانیانە ناکا کە لە (بێسارابی)، بە دەستی پارتیزانە رووسەکان کوژراون!. منیش ناتوانم قسە لە بارەی ئەو جوولەکانە بکەم کە بۆ کەنارەکانی (بەگ) سورِگوم کراون. من لە بەرەی شەڕی لای خۆم، راستی ئاشکرا دەکەم. پەیامنێرانی دوژمنیش

نیوەکەی تری راستیی ئاشکرا دەکەن. بەم چەشنە، لە ئەنجامدا، راستیی، هەموو راستی دەردەکەوێ! ئەرکی من ئەوە نییە، زۆر بە وردی هەموو شتێ باس بکەم. بەڵکو ئەرکی من ئەوەیە بەو پەڕی راستی، باسی ئەو کارەساتانە بکەم کە دوژمن لەسەر خاکی ئێمە کردوویەتی. پەیامنێری دوژمنیش باسی خراپەکانی ئێمە لە سەر خاکی ئەوان، دەکا. بۆچوونەکانمان، هەرچەندە ناکۆکیش بن، دوو نیوەی یەك راستی پێك دێنن. هیچ پەیامنێرێك ناتوانێ لە نیوەی راستی زیاتر بنووسێ. بەڵام ئەم نیوەیە، دەبێ بە راستگۆیی‌و بێ کەم‌وکورتی بنووسرێ. چونکە پەیامنێر بە بێدەنگی دەیگوازێتەوە.

## (٢٠)

لە ژیاندا، هەندێ رووداوی بێ نرخ هەن، نایەڵن مرۆڤ بەشداری رووداوی لە ئاسا بەدەر بکا.

بۆ نموونە (ترایان ماتیزی) بە درێژایی هەموو دەوری منداڵی خۆیو بە درێژایی هەموو دەوری هەرزەکاری خۆی، زۆر بە مەراقەوە تەماشای کەناری (دنی یێستەر) رووسیی دەکرد. لە رۆمانیاوە تەماشای دەکرد. هەموو گیانی ئارەزوو بوو بۆ ئەوەی بزانێ لەکەنارەکەی دی، لە یەکێتی کۆمارە سۆشیالیستەکانی سۆڤێت، چ باسە!! بەڵام شتی وا ئەستەم بوو. ئەوەی لە کەناری (دنی یێستەر)ی رووسیی رادەبرد، کەسنەزانو شراوەو ئاڵۆز بوو.

ئەو بەیانییەی تشرینی یەکەم، (ماتیزی)، بە ترومبێلێکی سەربازی، لە (دنی یێستەر) پەڕییەوە. ئێستا، دەیتوانی شتەکانی جەبەر ببینێ. بەڵام، تەنانەت سەرنجێکیشی، لە شووشەی تەمگرتووی ترومبێلەکەوە، لێ نەدا. بە نیوەخەوتوویی، بە چاو نوقاوی، خۆی لەسەر کورسی دواوە

گرمۆڵــه كردبــوو. چــارەنووس وا هــات كــه بــه جلــی ســەربازی شكارچییان، بە نیشانەی (ر.ب)، دوای شەوێك سەفەر، دوای شــەوێك تاو ژانی لاسەرە، دەرفەتی پەڕینەوەی بوو بۆ جەبەر، بۆ خاكی داخراو. وردە وردە تووشــی پەتــەك هــات. لاجانگــەكانی گــەرم داهــاتن، نەیدەتوانی چاوی بكاتەوە. پێلووەكانی دەئێشان.

هێمانێ گەیشتە كەناری رووسی، ترومبێلەكە وەستا.

یەكێ لە هاوڕێكانی گوتی:

-دابەزە! ئەگەر بۆ یەك خولەكیش بێ، بۆ ئــەوەی بلێــی پێــت ناوەتــە سەر خاكی رووسیا.

(ترایان) گوتی:

-نا.

زیاتر خۆی لەسەر كورسی دواوە گرمۆڵە كرد. چەند قومــە قاوەیــەكی ساردی لە چارەكێك خواردەوە. ئەوە رووســیای بینــی. ئــیتر فتراقــی داكەوت.

(ترایان)، دوای رۆژێكــی تــر ســەفەر، دوای شــەوێكی دیكــه لــە نــاو ترومبێل، دوای سێیەمین رۆژ بڕینی دەشتی بە كاكی خۆڵەمێشــی بێ شۆو بێ سنوور گەیشتە (لیكۆلایف). دەشتی (ئۆكرانیــا)و بەشــێكی زۆری دەشــتی (نۆگای)یــان بڕیبــوو. ئێســتا، بــەرەو باشــوور شــۆڕ دەبوونەوە. هێمان هەر لــە دەشــتی (نوگــای) بــوون. هەمیشــه هــەمان

چاوەنداز. زەوییـەکی دووزو بـێ پیڤـان، کـە پـابز وەکـو گەنگـەرین هەڵیدەلووشی. ڕێگایەکی خۆڵ خۆڵەمێشی وەکوو زەوییەکانی ئەم لاو ئەو لای ڕێگا. لـە ڕێگاو لـە بەیناو بەینی مەیلـەو ڕێکـدا، چـەند تاقمـە کەسێك دەهاتن عارەبانەی پێچکەداریان لـە دوو خۆ ڕادەکێشا، هـەموو جۆرە کەلو پەلێکیان لێ بار کردبوون. ئەمانە پەنابەری رووسی بـوون، هــەزاران کیلۆمــەتریان بڕیبــوو. عارەبانــەی دەســتیان، بــە هــەموو سەروسامانی خۆیانەوە. لـە دوو خۆ ڕادەکێشـا: ژن، پیـاو، پـیر، کـاڵ، هەموو وەك ئەو دەشتە ، وەك ئەو ئاسمانە، بە ڕەنگی خاك. رووسەکان، جلکیان بە خۆڵ بوو، دەمو چاویان بە خۆڵ بوو. چاویان بڕیبووە خـۆڵ لـە خۆڵ خۆڵاوی تر بوون. شارو دەگاکان، ڕەنگی مشـکییان گرتبـوو. گشت چۆلو هۆل بوون. دانیشتوانەکانی رووسیای داگیرکـراو هـەموو کەوتبوونە ڕێ. بە تاقمی پێنج شەش کەسی، بە ڕێگای خـۆڵی خۆیانـدا دەڕۆیشتن. (ترایان)، کاتێ چـاوی دەکـردەوە، وایـدەزانی بـێ وچـان، هەمان تاقمە پەناهەندە، هەمان عارەبانە، هـەمان چـارە، هـەمان جـلو بەرگ، هەمان پێڵاوی لاستیك لەسەر هەمان ڕێگاو لـە هـەمان جێگـا دەبینێ.

بە درێژایی ئەو چوار ڕۆژەی کە سـەفەرەکە لـە (دنـی پێسـتەر)ەوە تـا (جانکۆی) (یەکەم شاری (کریمێ) درێژەی کێشا، لـە پشت شووشەی ، چـاوی تـەنیا یـەك دیمـەنو هەمیشـە هـەمان دیمـەنی دەدی. دەتگـوت تەرجیعبەندێکی بەردەوامو ناکامو نەپساوەیە.

سەرۆکایەتی یەکەکانی لەشکری رۆمانی، کە دەبوو هێرش بکەن بۆ داگیرکردنی (کریمێ) ، لە قوتابخانەیەك ئێوریبوون.(ماتیزی) خۆی بە فەرماندەکە ناساند. سەرهەنگێکی شکارچی بوو.

سەرهەنگ گوتی:

-هەبزانە هێرش دەستی پێکرد. کردەوەیەکی گەورەیە. لێرە، لە دەشت دەست پێدەکاو لە چیا بەردەوام دەبێ‌و لە کەنارەکانی دەریای رەش کۆتایی دێ. کردەوەیەکی سەربازییە، گرنگییەکی مێژوویی هەیە. شادین کە پەیامنێرێکی بەناوبانگیان بۆ رەوانە کردووین. تا بە مێژوو بڵێ ئەم کردەوەیە چۆن بوو.

سەرهەنگ دەستی (ماتیزی) گوشی. سەردەستەیەك بردییە داڵەکەی خۆی. (ماتیزی) دەبووایە تا دەست پێکردنی هێرشە گەورەکە، لە فەرماندەیی بژی. ژوورەکەی، پۆلێکی گەورەی خوێندن بوو، چەند پەنجەرەیەکی گەورەو چارپایەکی سەفەری تێدا بوو و هیچی تر نا. (ماتیزی) کوڵەپشتەکەی لە سەر عەردی تەختەداری ژوورەوە دانا. بە هەموو جلەوە، لەسەر چارپاکە راکشا. ئێستا لاچەرەکانی، لە کاتی سەفەر، گەرمتربوون. لە سەر چوارپاکەی، لە پەنجەرەوە، تەماشای دەرەوەی کرد.

ئاسمان خۆڵەمێشییەکی شینباو بوو. دەشتیش هەروەتۆ، چیپ خۆڵەمێشی، شینباو بوو. هەر بەم تەرحەی چوار رۆژ بوو دەیدی.

تاقمە پەناهەندە، لە دوورەوە، لەسەر ڕێگای خۆڵ بە بەپێ بەبنی مەیلەو ڕێك، بە عارەبانەی داری خۆیان، دەهاتن. (ترایان) دەیناسین. ئیتر چیدی تەماشای ڕێگاکەی نەکرد.

کابرایەك بە جلی خاکیو ریشی سپیو بە دەمو چاوی ئێسکن، لە حەوشەی قوتابخانە، بەبەر پەنجەرەکەیدا تێپەڕی. هەگبەیەکی بە پشتی دادابوو. کە دەڕۆیشت، چاوی بڕیبووە زەوی . ڕۆژی پاشیش، پیرەمێردەکە دیسان هەگبە لە پشتو دیسان چاو لە زەوی، بەوێدا ڕەت بوو.

سەردەستەی لۆجستی گوتی:

-ئەمە بەرێوەبەری قوتابخانەیە! فەرماندە روخسەتی داوە لە قوتابخانە بژی. بە ڕەسمی، کاری وا ڕێ نەدراوە. بەڵام فەرماندە دڵێکی باشی هەیە!

(ترایان) ئەسپرینێکی خوارد. چای خواردەوە. چاوەڕێی ڕۆژی هێرشی دەکرد.

(ترایان) پرسی:

-ئەوە، هەموو ڕۆژێ، بە هەگبەکەی، چ دەبا؟

سەردەستە وەڵامی دایەوە:

-کرتۆپە! رووسەکان تەنیا ئەمەیان دەست دەکەوێ. بەلام تەنانەت کرتۆپەیش دەگمەنو گرانە. ژیان سەختە. وەکوو ژیانی (سەلەڤێك)ی زیڤار سەختە.

(سلەڤێك) بە زمانی رووسی یانی (مرۆڤ.) سەربازە رۆمانییەکە نەیگوت: (رووسەکان)، بەڵکو گوتی (سلەڤێك)، یانی مرۆڤ.

بەردەوام بوو:

-لەگەڵ ئەوەییشدا، بەڕێوەبەری قوتابیخانە بەختی هەیە... ناو بە ناو، رتاخی دەست دەکەوێ، خەڵکی تر دەستی ناکەوێ. فەرماندە دەستووری داوە، هەر خواردنێکی زیادە هەبوو، بیدەنێ!

لەو کاتەدا، بەرێوەبەر، سەر لە نوێ، بە بەر پەنجەرەدا تێپەڕی. دەهاتەوە. لە رۆژی پێشوو، پیرترو غەموونتر دیار بوو.

-ئەمرۆیش بە هەگبەوە هاتووە. (سلەڤێك)ی بەدبەخت، ئەمڕۆ کرتۆپەی دەست نەکەوتووە. زەحمەتە هەموو رۆژێ رتاخ دەست بکەوێ.

(ترایان) لەسەر چوارپاکەی هەستایەوە. لە سەر چوارپاکەیەوە، بەریوەبەری بینی لە ماڵەوە نزیك دەکەوتەوە، هەگبەی خۆڵەمێشیی بەتاڵی، لە ناو دەستی ئێسکنی گرتبوو.

(ترایان) گوتی:

-جیرەی منی بدەرێ!. من نەخۆشم، خواردنم بۆ ناخورێ. جیرەی ئەم ئێوارەشمی بدەرێ...

(ترایان) هەر ئەوەندەی لە دەست دەهات. بەڵام ئەمە شتێکی زۆر کەم بوو. تا بڵێی کەم بوو. ئەو تەنیا هەقی یەك جیرەی هەبوو. دەیتوانی تەنیا ئەوەندەی بداتێ. بەڵام سێ کەس لە ژووری بەرێوەبەر بوون. ئەو، لە ماوەی بەیناو بەنی مەیلەو بە قەد یەکەوە، لە دووری دوورەوە، تاقمی چواری‌و شەشی تا دە نەفەری، دەدی. بە بێ پسانەوە دەهاتن‌و تێدەپەڕین. هەموو بە یەك رەنگ، رەنگی خۆڵەمێشی. هەموو تەنیا بە یەك ئارەزوو، ئارەزووی خواردنی شتێك.

(ماتیزی) داخی دەخوارد کە پەنجەرەکانی ژوورەکەی ئەوەندە گەورەن! پەردەیان نییە؟!

* * *

رۆژی پاشی، چووە دەرەوە بۆ حەوشە. حەوشەی قوتابیخانە تانۆکی نەبوو. دونیا بەستبووی. ئەسپێکی چایی بچووکی بە قەد فینۆیەك لە بەر دەرگای مدبەق وەستا بوو. (ماتیزی) چاوی رۆشن بووەوە. هەستی کرد ئەمە (تەنیا)یە. ئەو ئەسپە چاییە بچووکەی لە (ئیزڤۆر)، لە حەوشەی ماڵی باوکی، بەرەڵڵا بوو.

(ترایان) هاواری کرد:

-(تەنیا)!! بۆچی تووڕەی؟ (تەنیا)کەم!!

(ماتیزی) چووە لای ئەسپەکە. بە نەرمی دەستی بە بڕناخەکانی داهێنا. وای دەزانی دەست بە (تەنیا)ی حەوشەی ماڵە باوانی دادێنیَ. ئەسپەکە هیچ جوولەی نەکرد. قەت هیچ جوولەی نەکردا! لەڕو لاچار بوو. سەربازێك چووە لای (ماتیزی).

سەربازەکە گوتی:

-ئەمە یەکێکە لە ئەسپە دەگمەنەکان بۆمان ماوەتەوە.

ئەویش، بە خۆشەویستی، ئەسپە بچووك‌و غەمناك‌و بێ جوولەکەی لاواندەوە.

یەکەکانی لەشکری شکارچی بە ئەسپی بچووکی چیایی خۆیان هاتبوونە رووسیا، فەردە تەقەمەنی‌و چەکی نیمچە قورسیان لێ بار کردبوون. هەر یەکەیەکی سەربازی چەند ئەسپێکی وای هەبوو، بە باری چەکەوە، لە دوای ستوونەکەیانەوە دەڕۆیشتن.

سەربازەکە گوتی:

-کە دەشتەکانی (ئۆکراین)و (نۆگی) مان دەبڕی، هەموو ئەسپە چیاییەکانمان تۆپین. هەموو!

پەڕەی بڕناخەکانی ئەسپی بچووکی بێ جوولەی لاواندەوە.

سەربازەکە بەردەوام بوو:

-ئەمەیش تا چەند رۆژێکی تر لێرە دەتۆپێ! دەبینی لە سێ رۆژی دی زیاتر، ناژی. هەموو ئەسپەکانمان بەم دەردە چوون. رۆژێ، دەبینین ئیتر هیچ ناخۆن‌و هیچ ناخۆنەوەو لەبەر چاومان دەتوێنەوە.

شکارچییەکان ئەسپەکانی خۆیان خۆش دەوێ. بەڵام ئەو سەربازەی لەبەردەم (ترایان) بوو، لەکاتی بڕینی ئەو دەشتەدا، زۆر ئەسپی دیبوو وەکوو ئەوەی ئێستا تۆپیبوون. ئەسپەکەی، هاوڕێی شەڕو هەورازەکانی، بە ئازارێکی زۆر دەلاواندەوە. دەیزانی ولاغەکە دەتۆپێ.

-سەرکردایەتی گەورەی گشتی لیژنەیەکی بەیتاریان ناردووە ، بەڵام هیچ لیژنەیەك نەیتوانیوە ئەسپە بچووکە بەدبەختەکانمان نەجات بدا. کەس نەیتوانیوە! ئەسپەکانمان لە ڕێگای بەردەڵان‌و سەختی بەرزاییەکان ڕاهاتوون. لە خاکی بڵندو باڵا ڕاهاتوون. ئەسپە وردیلەکانمان بەرگەی ڕێگاکانی ئێرە ناگرن. بەرگەی تۆ ناگرن! هێمانی دەیانبەینە ڕێگای نزم‌و پیس، دەست بە خورانی خۆیان دەکەن. ڕەبەڵی دەبن! ئینجا تایان دێتیێ‌و سەرەنجام واز لە خواردن‌و خواردنەوە دێنن. وشك‌و بێ حدوور دەبن‌و دەتۆپن. پێستەیان، پێستەی ئەسپە وردیلەکانمان، بەرگەی ڕێگای دەشت ناگرن. ئەمانە ڕێگای ئەوان نین. ئەمەیش، چەند ڕۆژێکیتکە، دەتۆپێ!

شکاری چیایی لە لاواندنەوەی پەڕەکانی بڕناخ‌و بژیی ئەسپەکە بەردەوام بوو. (ترایان) کلۆ شەکرێکی لە بەرکی دەرهێناو دایە ئەسپە وردیلەکە کە تەنیا بەرگەی ڕێگای تایبەتی شکارچییانی دەگرت. ئەسپە

وردیلەکـە، بـە حەسـرەتەوە، تەماشـای گڵمتـە شـەکرەکەی کـرد. شەکرەکەی نەویست. غەمێکی کوشندەی لە چاودا بوو.

سەربازی شکارچی گوتی:

-مەسەلەکە تەنیا پێستەیە!

(ترایان)، هێمان کلۆ شەکرەکەی راگرتبوو. هەستی بە هەناسەی داغی ئەسپەکەی دەکرد لەسەر دەستی.

سەربازەکە گوتی:

-ناخوا. هیچ چارەی نییە. تا نەگاتەوە بەرزاییەکان، دەم لە هیچ نادا.

(ماتیزی) گوتی:

-(تەنیا)ەکەم! تاقەت بدە بەر خۆت!

ئـەو کلۆشـەکرەی ئەسـپەکە رەتـی کـردەوە، خسـتییەوە گیرفـانیو دووبارەی کردەوە:

-(تەنیا)ەکەم! تاقەت بدە بەر خۆت!

ئەسپەکە بە خەفەتەوە چاوی بڕیبووە بۆشایی. چـۆن کلۆشـەکرەکەی رەت کـردەوە، هـەر بـەم جـۆرەیش، ئامۆژگارییەکـەی رەت کـردەوە. ئەسپەکە لەسەر چیا سەرکەشەکان ژیا بـوو، ئەوەنـدەی ئـازار هـەبوو، نەیدەتوانی، نـە هـیچ قسـەیەك وەربگـرێو نـە هـیچ کلـۆ شـەکرێك. دەیەویست دووبارە بچێتەوە چـیا بـەرزەکان. رێگـای دەشـتو نزمـایی رەت دەکردەوە.

(ماتیزی)، لە ئەسپە وردیلە نەخۆشەکە دوور کەوتەوە. رووی کردە لای چادرگەی لەشکر. دوور نەبوو. چادرگەکە چەند سەد مەترێك لە قوتابیخانەکە دوور بوو. ستوونە سەربازێك لەناو چادرەکان هاتە دەرەوە. ئەفسەرێك لە پێشیانەوە دەرۆیشت، تیلمە قوماشێکی حەمایل کردبوو. ئیمام تابوور بوو. دوو سەربازی لە دوو دەرۆیشت دارەبازەیەکیان هەلگرتبوو. ئەو سەربازەی باسی مەرگی ئەسپە چیاییەکانی دەکرد، سەری بردە بنگوێی (ماتیزی)و گوتی:

-ناشتنی مردوویەکی ترا!

مردوویەك لە سەر دارەبازەی نەخۆشخانە درێژ کرابوو. بەتانییەکی بۆریان لێپێچا بوو. سەربازەکەگوتی:

-لێرە، لەو دەشتە، دار دەست ناکەوێ.

بە شێوەی ئامادە وەستاو سەلامی بۆ کۆرەوی جەنازەکە کرد. بە دەم سەیر کردنی دارودەستەکەوە، قسەی بۆ (ترایان) دەکرد:

-ئەم (سلەڤێك)انە زۆر بەدبەختن. تەنانەت تەختەیەکیان پێ پەیدا نابێ تابووتێك دروست بکەن. دەبێ مردووەکانمان بێ تابووت بنێژین.

(ماتیزی) وای بە باش زانی بە شێوەی سەربازیی، سلاو بۆ مردووەکە نەکا. بەڵکو بە شێوەیەکی گەرمو گورتر لە سڵاوی سەربازی، رێز بۆ هاورێ مردووەکەی بنوێنێ کە دەیانبرد بینێژن. بێریەی فەروەی لەسەر کردەوەو لەبەردەم دەستەی ناشتن، داهاتەوە. کاتێ سەرهەنگ، چەند

هەنگاوێك ما بگاتە لای، (ترایان) قاچەکانی مردووەکەی بینی بە رووتی لە ژێر بەتانییەی بۆر هاتبوونە دەرێ. بە سەرسامی تەماشای کرد.

ئەو سەربازەی لە دەستەراستی (ترایان) بوو، گوتی:

-ئەم پیاوە یەکێ بوو لە دەورییەکانی شەو.

بە ئامادەیی، سەلام قوت، وەستابوو.

سەربازەکە بەردەوام بوو:

-مینێکی لە ژیر پێ تەقیوەتەوە. بە تەواوی هەلا هەلا بووە. مینەکە رێك لە ژێر پێی تەقیوەتەوە. باشم دەناسی!

(ماتیزی) پرسی:

-دیارە سەربازە مردووەکانمان بە بێ پێڵاو دەنێژن؟!

تەماشای پای خروای سەربازەکەی کرد کە ئەو شەوە، لە کاتی نۆرە گرتنی خۆیدا، پێی لە مین نابوو.

سەربازەکە گوتی:

-لە سەرەتای جەنگدا، ئێمەیش وەکوو ئەلمانەکان مردووەکانمان بە هەموو جلو بەرگەوە، دەناشت. ئەلمانەکان تەنانەت بە چەکەوە ئەفسەرەکانی خۆیان دەنێژن. بە چاوی خۆم دیومە، ئەفسەرەکانیان بە وەرووەرو فیشەکەوە، بە خاك دەسپێرن. بەڵام ئێمە ئێستا لە سەروبەندی

زستاندایین. کەس نازانێ هێرش بۆ سەر (کریمی) چەند دەوام دەکا. فەرمانمان بۆ هاتووە، بێ جلو بەرگو بێ پێلاو، سەربازەکانمان بشارینەوە. بە رووتی بیاننێژین.

(ترایان ماتیزی) دڵی گوشرا. سەربازەکە گوتی:

بۆ مردوو چ گرنگە، ئەگەر بە پێلاوو جلی سەربازییەوە بنێژری؟ یان بە رووتی؟ مردوو هەست بە هیچ ناکا. پێلاوو جلی سەربازی سوودی بۆ سەربازی زیندوو زیاتر هەیە، تا مردوو. خەریکە دونیا سارد دادێو ئێمە پێویستمان بە جلی سەربازییە. وا نییە، جەنابی پەیامنێر؟

(ماتیزی)، بە تووڕەیی، رووی بۆ لای هاوڕێکەی وەرسووڕاند. ویستی هاواری لەسەر بکا: شتی وا راست نییە؟ بەڵام دانی بە خۆیدا گرت. دووبارە تەماشای کۆڕەوی ناشتنی مردووەکەی کردو چی تری نەگوت: نیشانەی خاچی کێشا. دوعای بۆ رۆحی سەربازەکە کرد کە بە مین پارچە پارچە ببوو، بە پێ خاوسیو بێ جلو بەرگ دەیانناشت. ئینجا بێرییەی فەروەی لەسەر نایەوە. ویستی بڕوا. برادەرەکەی کەوتە شوێنییەوە. گوتی:

-کە هێرش بۆ سەر (کریمی) تەواو بوو و گەیشتینەوە کەنار، مادۆنمان دەدەنێ؟ ئایا تۆیش بیستووتە مادۆنمان دەدەنێ؟ یان نا؟ ئایا دەزانی هێرش بۆ سەر (کریمی) کەنگی تەواو دەبێ؟

(ماتیزی) گوتی:

-هەڵبەت مادۆن دەدەن. هەڵبەت!!

هەوڵی دا خۆی لە چنگ سەربازەکە دەرباز بکا کە تەنانەت کاتێ کۆڕەوی جەنازەکە بە لایەندا تێدەپەڕی، هەر دەیەویست پرسیار لە بارەی مادۆنەوە بکا. بەڵام سەربازەکە نەیدەویست بڕوا. هێشتا قسەی مابوو بیکا.

گوتی:

-با منداڵەکانی خۆمت نیشان بدەم. .. سێ منداڵم هەن. سێ کوڕ.

سەربازەکە وێنەیەکی لە ناو جانتای گیرفانی چاکەتی دەرهێنا: ژنێك بە جلی هەرێمی کارپاتی، لەگەڵ سێ منداڵا وێنەکە ئەوەندە کۆن و دارزابوو دەتگوت ماوەیەکی زۆر لە ناو ئاو ماوەتەوە.

سەربازی شکارچی گوتی:

-ئێمە چوار هەزار کیلۆمەترمان بە پێ بڕیوە. وێنەکە لەبەر ئارەقە نەختێ لە گیرفانم تێکچووە. کە پیاو چوار هەزار کیلۆمەتر بە پێ ببڕێ، ئەوەندە ئارەقە دەردەدا تەنانەت کەمەربەندو خەریتەی تفەنگیش دەڕزێ. بەڵام وێنەکەی من هێشتا روون و زولالە. تەنیا ئەوەندە هەیە روون نییە؟ ژن و منداڵەکانم باش دیار بن؟

(ماتیزی)، وێنەکەی بە دەستەوە بوو کە لە گیرفانی سەربازەکە دارزابوو. ئەو سەربازەی بە پێ خواسی، هەموو رووسیای تەی کردبوو. وێنەکە لە چەند پەڵەیەك بەولاوە هیچی دیار نەبوو. لەگەڵ ئەوەیشدا گوتی:

-زۆر باش دیارە. جوانە! سێ کوڕەکە لە خۆت دەکەن.

سەربازەکە گوتی:

-کە جەنگی (کریمێ) کۆتایی هات، دەچمەوە، دەیـانبینم. دوو سـاڵە نەچوومەتەوە ماڵێ. ئەمڕۆیش نامەیەکم بۆ نووسیون کە بەم زووانـە بـە مادۆن دێمەوە.

سەربازەکە زۆر بوغرا بـوو. بـە میهرەبـانی سـەیری وێنـەی سـڕاوەی منداڵەکانی دەکرد. ئینجا وێنەکەی ماچ کردو لـە گیرفانی نایەوە. شادو گوشـاد بـوو. (ترایـان) دەسـتی بـۆ درێـژ کـردو رای کـرد بـۆ لای قوتابیخانەکە. دەیەویست تەنیا بێ . بەڵام لـە سـەر کۆسـپەی دەرگـا، بەڕێوەبەری بینی، بە هەگبەوە دەهاتە دەرێ. (ماتیزی) سڵاوی لێکرد.

بەڕێوەبەر گوتی:

-سوپاستان دەکەم بۆ ئەو خواردنەی گوتبووتان بمدەنێ.

(ترایان) گوتی:

- تکایە کڵاوت بکەوە سەر!

بەڕێوەبەر، کڵاو بە دەست، لەبەردەم (ترایان) وەستابوو. کـە کـڵاوە بۆرەکەی کردەوە سەر، بێدەنگ بوو. (ترایان) ویستی شتێ بڵێ:

-ئەم جەنگە کارەساتبارە بەم زووانە کۆتایی دێ. نەختێ زاتت هەبێ. هەبزانە جەنگ تەواو بوو.

بەڕێوەبەر، بە مەسەلـەی کۆتایی هاتنی جەنگ، رووی گەشایەوە. بەڵام کۆتایی هـاتنی جـەنگ بـۆ وی ، مانـای بـەزینی لەشـکری رۆمانیـاو داگیرکرانی رۆمانیاو دیلبوونی (ترایان) بوو. ئەمە بووکۆتـایی نموونـەیی جەنگ بۆ مامۆستا. کەچی بۆ (ماتیزی)، کۆتـایی هـاتنی جـەنگ، یـانی شکستی رووسەکان. کۆتایی هاتنی جەنگ، بێ شـك مانـای کۆیلایـەتی

یەکێ لەو دوو مرۆیە بوو کە بەرامبەر یەك بوون. لە کۆتایی جەنگدا، ناشێ هەردووکیان ئازاد بن. یەکێ لەم دوو مرۆیە هەر دەبێ ببێ بە کۆیلە. (ماتیزی) دەیەویست، بەیانی، سەرکەوتوو بێ، مامۆستایش دەیەویست سەرکەوتوو بێ. بەلاّم چۆن دەکرێ دوو سەرکەوتوو هەبن؟

(ماتیزی) گوتی:

-ئێوارەیەك بە دوورو درێژتر قسەت لەگەلّ دەکەم.

دەستی مامۆستای گوشیو رای کرد بۆ ژووری خۆی. دەیزانی دەبێ لەو رۆژەوە خۆی لە دواندنی بەرێوەبەر بە دوور بگرێ. وشەی (سەرکەوتن) تاکە وشەیەك بوو هەردووکیان لەسەر زمانیان بوو. بەلاّم وشەکە تەنیا بۆ یەکێکیان مانای (سەرکەوتن)ی دەگەیاند. (ماتیزی)، کە قسەی لەگەلّ رووسەکان دەکرد، نەدەبا ئەم وشەیەی بەسەر زمان دابێ. ئەگەر ئەوان نەتوانن باسی کۆتایی جەنگ بکەن،، ئەی ئەو کەسانەی لە جەنگدان، باسی چ دەکەن؟؟

نەیاندەتوانی باسی هیچ بکەن. لە دەرەوەی جەنگو لە کۆتایی، هیچ شتێ گرنگ نییە. بەلاّم لە کۆتایی جەنگدا، (ماتیزی) نەیدەتوانی، لە دوو سەد ملیۆن رووس، قسە لەگەلّ هیچ یەکێکیان بکا. خۆی لێ بە دوور دەگرتن. خۆی لە هەموو رووسەکان بە دوور دەگرت.

(ماتیزی) خۆی فرێ دایە سەر چوارپا. لەسەر پشت راکشا. کارەساتی جەنگ رۆحی ئازار دەدا وەك چۆن رێگای نزمی دەشتەکان ئەو

ئەسپانەی ئازار دەدا کە لە خاکی بەرز راهاتبوون. ڕێگاکانی جەنگ نزمن، ڕێگای بەرزایی نین. ڕێگای پیسن. (ماتیزی) بە هەستێکی گەورەی تەنیایی، خەوی لێکەوت. بە هۆی جەنگەوە، یەك رووس نەبوو، (ماتیزی) بتوانێ قسەی لە تەك بکا. ئیتر هەستی بە تەنیایی دەکرد، تەنیایی تەواو!!

* * *

کاتێ کە چاوی کردەوە، پەنجەرەکان تاریك بوون. دەرگای ژوورەکەی لەسەر پشت بوو. ڕاڕەوەکە رووناك بوو. یاریدەر لە تەك چوارپاکەی وەستابوو، شانی (ماتیزی) دەجوولاندەوە.

-ئەمشەو، هێرش دەست پێدەکا. سەرهەنگ منی رەوانە کردووە خەبەرت بدەمێ. داوات لێدەکا لە کاتی هێرشدا، لە تەك ئەو بیت تا بتوانێ کردەوەکەتان بۆ روون بکاتەوە. خۆت ئامادە کە!

(ماتیزی) هەستا. لەبەر روناکی کزی چرادا، کوڵەپشتی خۆی پێچایەوە: جگەرە، شەمچە، مەعجوونی دان، فلچەی ددان، دەفتەری یادداشتو قەڵەمداری زیادەکی. بە ماوەی چەند خولەکێك، ئامادە بوو بۆ رۆیشتن. چاوەڕێی فەرمانی دەکرد. سەردەستەی میرە داوای لێکرد بچێتە ناو هۆلی خوێندنەوە. هەموو ئەفسەرانی سەرۆکایەتی لەوێ خڕ ببوونەوە. تەماشای نەخشەکانیان دەکرد. ئەفسەرەکان کڵاوخوودەی جەنگیان لەسەر بوو، کەمەربەندیان لە پشت بوو. پاڵتۆیان پۆشی بوو.

قاوەی گەرمیان بە سەر پێوە دەخواردەوە. فەرماندە بە (ماتیزی) گوت لە تەك ئەو بمێنێتەوە. تەماشای سەعاتی کرد. ئینجا فەرمانی بزووتنی دا.

نیوەشەو بوو. لە دەرەوە، باران دەباری. دوو سەعات بوو تۆپخانە بە توندی دەیکوتا. لە تاریکیدا، دەنگی ستوونەکان بە رێکی، دەهات بە رێگای تەنیشت قوتابیخانەدا، دەڕۆیشتن.

هێرشی گەورە دەستی پێکرد. لە تاریکیدا، ستوونەکان بەرەو باشوور دەڕۆیشتن. هەموو بەرەو باشوور دەچوون. (ماتیزی) پشتەملی پاڵتۆکەی هەڵدایەوە. شەرمی پێ بوو هەست بکا (تا) لاجانگەکانی دەسووتێنێ. شەرمی پێ بوو بکۆخێ. سەرەتای باپەڕی، شتێکی نەختێ سەختە. شتێکە لە کاتی رووداوی دەرەکی وەکوو ئەم هێرشە بەربلاوە بۆ گرتنی (کریمێ)، ناشێ بە هەند هەڵبگیرێ. بەڵام سەرەڕای دەست پێکردنی ئەم هێرشە گەورەیە، نەیدەتوانی رێ لە کۆکەی خۆی بگرێ.

# (٢١)

هەر لــە ســەرەتای هێرشــەکەوە، یــانی لــە ســەرەتای جمینــەوە بــەرەو باشوور، بە تاریکیو لەبەر باران، (ماتیزی) پەی بە شــتێك بــرد: زەوی، ڕێگا، هەموو درەختێكو هەموو پارچە زەوییــەك، هاوپــەیمانی لەشــکری رووس بوون.

ئەو هاوڕێتییەی هیچ جــۆرە خیانــەتێکی تێــدا نــەبوو: هــاوڕێتی نێــوان زەویو ئەو کەسانە بــوو کــە بــەرگری لێ دەکــەن. (مــاتیزی) هەســتی دەکرد شکارچییە رۆمانییەکان دەبێ نەك تەنیا لەگەڵ لەشــکری ســوور بجەنگن، بەڵکو دەبێ لەگەڵ هەموو بێشە، هەموو بستە رێگایەك، هەموو مەتر چوارگۆشــەیەکی خــاکی ســۆڤێت، بجــەنگنو بیانبــەزێنن. هەرچــی لەسەر رووی خاکی رووسیا بوو، لە ژێر خاکی رووســیا بــوو، هــەموو ببوون بە جەنگاوەرو لە بەرژەوەندی لەشکری رۆمــانی دژی لەشــکری سەربازی رووسی بوون.

سەرهەنگ نەخشەی شەڕی بۆ(ترایان) روون کردەوە. لابالێکی لەشکری رۆمانی بە لاری، بەرەو رۆژهەلات دەچیّ، لابالێکی تری بە خواری، بەرەو رۆژئاوا دەڕوا. باڵەکەی خۆیشیان یەکەو راست بەرەو باشوور مل دەنیّ. (ماتیزی) هەوڵی دەدا گویّ بگریّ. ئەمە یەکەم جار بوو، وەکوو پەیامنێر، لەگەڵ هێزی جەنگاوەر، لە ناو جەرگەی مەیدانی شەڕ بیّ. بەڵام (تا)ی لیّ بوو و (تا) هەموو شتێك تێكوپێك دەدا. هەر هەموو!! ورەوڕی لە گوێی دەهات. نەیدەتوانی زەینی کۆ بکاتەوە سەر یەك، یادەوەری خۆی بەکار بێنیّ، یان سەرنج لە رووداوی دەوروبەری خۆی بدا. چەند جارێك بە پاش کەوت. گەیشتە ئەو سەربازەی کە وێنەی دارِزاوی پێبوو و ناوی (تودۆر) بوو. سەر بە دەستەی فەرماندەیی بوو. شادو گەشاد بوو کە بەم زووانە دەگەنە چیا.

(تودۆر) گوتی:

-ئەو ئەسپانەی ماومانن ئەگەر تا دەگەینە چیا نەتۆپن، ئیتر نەجاتیان دەبیّ. ئێستا لە ناوچەیەکی بەرزداین. هەست بە هەوا دەکەی؟ هەناسەیەك هەڵکێشە. هەوا تا دیّ، وردە وردە پاکتر دەبیّ. ئەمە نیشانەی ئەوەیە ئێمە بەرەو بەرزیی دەڕۆین. نیشانەی ئەوەیە لە بەرزاییەکان نزیك دەکەوینەوە. (ماتیزی) زانی ئەو ئەسپە وردیلە نەساخەی لە حەوشەی فەرماندەیی کلۆ شەکرەکەی رەت کردەوە، لە دوای ستوونەکەوە دیّ.

سەرهەنگ جارێکی دیکە لە دوو (ماتیزی) نارد. هەر جارەی (ماتیزی) دوادەکەوت، سەرهەنگ لە دووی دەنارد. دەیەویست (ماتیزی) لە تەکییەوە بێ. ستوونەکە لە هێلێکی بەرگری نزیك دەکەوتەوە کە قایمکارییەکی مکوومیی ژێرزەمینی هەبوو. دەبوایە بە هێرش قایمکارییەکە تێکبشکێنن‌و بگرن. ستوونەکانی شکارچی وەستان. خۆیان بۆ هێرشێکی بەرەیی ئامادە کرد.

بەرەبەری رۆژهەڵات، بوو بە دۆزەخێکی ئاگر.

سەرهەنگ گوتی:

-لێرە، دەبێ بە شەڕو ئۆغرمێکی گران. ئەمە یەکێ لە هێلە هەرە گرنگەکانی بەرگری دوژمنە.

تەڕو شێ تا سەر مۆخی ئێسقان دەچووە خوارێ. تاریك بوو. تا تاریك بوو، کەس هەقی نەبوو جگەرە بکێشێ. (ماتیزی) چاوەڕێی ئەنگووتنی بەیانی دەکرد.

سپێدەدەم، سەربازەکان چیایان لەبەردەم خۆیان لێ دەرکەوت. (ترایان) چیاکانی رێك بەو جۆرە دەدی کە لە حەوشەی ماڵی خۆیانەوە، لە (ئیزفۆر)، دەیاندی: لە گومەزی شینیان دەکرد..

رۆیشتن بەردەوام بوو، بەڵام هێدیتر.. سەربازەکان تفەنگیان بە دەستەوە بوو، ئامادەبوون بۆ هێرش.

سەرهەنگ گوتی:

-رووسەکانی شەوێ دی، هەموو شوێنی قایەکاریی خۆیان جێ هێشتووە. هەڵبەت خۆیان تەیار دەکەن بۆ ئەوەی لە چیا بەرگری بکەن. ئەو دەوریانەی بۆ وەرگرتنی ئاگاداریی چووبوون، سپێدەدەم گەڕانەوەو زانیمان رووسەکان شوێنی قایەکلریی خۆیان جێ هێشتووە.

ئێستا، شکارچییەکان دووبارە چوونە پێش. نیوەڕۆ، (ماتیزی))، جێگای قایەکارییەکانی بینی. دالآنەکان چۆل بوون. بە پەلە پەلی کشابوونەوە. رووسەکان، چەکو تەقەمەنیو کەلو پەلی سەربازییان جێ هێشتبوو. ستوونی رۆمانی، سەر لە نوێ، چوونە پێش. تەواوی پێشنیوەڕۆ چوونە پێش. جاروبار دەنگی تەقە دەهات، ئیتر دەوەستان، ئینجا دووبارە، بە وریایی، دەچوونە پێش. پێشەنگان لە پێشەوە دەڕۆیشتن.

ئێوارەی دووەم داهات. شەویان لە ناو لێڕ بەسەر برد. بە هێدی دەچوونە پێش. بە هێواشی بەرەو باشوور، دەڕۆیشتن.

سبەینەی رۆژی پاشی، ئاووهەوا خۆش بوو. بارانی لێکردبووەوە. گەلای داران زەرد بوو، (با)ی باشوور گەرم بوو. (تودۆر) لەوێ، لە دەستەی فەرماندەیی بوو. (ماتیزی) دەیزانی هێشتا سی کیلۆمەتر ماوە بۆ دەریا.

سەرهەنگ گوتی:

-هەبزانە روو بەرووی بەرگری بووینەوە. بە دڵنیاییەوە، لە بەرزاییەکانەوە هێرش دەست پێدەکا.

هەر لەو کاتەدا، ریژنەیەکی گوللەی مەترەلۆز، لـە دواوە ، لـە نـاو جەرگەی لیڕی بەرزەوە بەسەر ستوونەکەدا هات.

(ماتیزی) خۆی بە عاردی داداو راکشا. لە هەموو جیگایـەك، گوللـە گیزەی دەهاتو درەختی لق‌و گەلای زەردی دەشکاند. ئەمـە یەکـەمین جار بوو، (ترایان) خۆی لە ژیر گوللەباراندا دەدی. شتیکی سەیر بـوو، لەوە زیاتر نەدەترسا کە لەناو ترومبیلیك بـیۆ ترومبیلەکـە لـە سـەر زەوی بخزی. هەمان شت بوو، رەنگە کەمتریش بی. گوللە لـە هـەموو لایەکەوە گیزەی دەهات. بەلام ئەمـەی بـە لاوە ئاسـایی بـوو، بـە قـەد باران‌و بە قەد تەزرە ئاسایی بوو. پیشەنگەکان دەستیان بـە تەقـە کـرد. تەنانەت ئەفسەرەکانیش تەقەیان دەکرد. سەرهەنگ مەترەلۆزیکی پیبوو.

ئەم شەڕە ماوەیـەکی زۆر دریـژەی کیشـا. رەنگـە سـەعاتیك دەبـوو. (ماتیزی) پیی وابوو شەڕ شتیکە نووسینەوەی زەحمەتە. مرۆ ناتوانی هـیچ شتی نائاسایی باس بکا. لە راستیدا، شەڕ شتیکی تا بلیی سواوو ئاساییە. هەندی کەس خۆیان لەسەر زگ دەخشینن‌و خۆیان لە پەنا کەوران، لە پەنا درەختان، لە پەنا قۆمەتـە خـۆل دەنـین. دەگـەڕین بـزانن تەقـە لـە کویندەر دی. ئینجا ئەوانیش بـە دەوری خۆیانـەوە، تەقـە دەکـەن. کـە تەقەی دوژمن کەم دەبیتـەوە، یـان دەبـڕی، سـەربازەکان هەلدەسـتن‌و بەرەو پیش دەچن. بە وریایی‌و بە پاریز، دەچنە پیش. وەك ئەوەی بەسەر جیگایەکی خلیسکدا برۆن، وریای هەموو جوولانەوەیەکی خۆیان دەبن.

گوڵـلە شتیکی غەریب نییە. مرۆ زوو لێی رادێ. ئەوەی تریش، هەمیشە هەمان شتە.

ئەفسەرێك گوتی:

-ئێمە بردمانەوە.

لەشکر دەچووە پێش. (ماتیزی) هەستی وا بوو کـە رووبارێـك دەبیـا. پێوابوو دەبێ (تا)یەکی گرانـی لـێ بـێ. ئەگـەرنا، ورەوری لــە گـوێی نەدەهات. رەتی کردەوە بچـێتە سـەر ئـەو گوپیتکـەی دوژمـن لــەوێوە تەقەی دەکرد.

سەرهەنگ گوتی:

-هێمـانێ بگەینـە دەریـا، وا دەکـەم لــە نەخۆشــخانە بتخـەوێنن. بـە داخەوەم کە نەخۆشیت. بەڵام ئێمە شانازی دەکەین کـە تـۆ لـەگـەڵمان هاتووی.

لە ساخورێکی ناو دۆڵ چەند ترۆمبێلێکیان بینی جێ هێشترابوون. سێ لۆریو چەند عارەبالـەی ئەسـپ!. ئـەو رووسـانەی لــەوێ بـەرگرییان کردبوو، کەلو پەلو ترومبێلـەکانیان جـێ هێشـتبوو و بـە قوونـە شــەڕ پاشەکشەیان کردبوو.

پاریدەر گوتی:

هەموو شتێکیان جێ هێشتووەو کشاونەتەوە بۆ بەرزاییەکان.

به راستیش، سۆڤێتییەکان هەموو شتێکیان جێ هێشتبوو: فراخانە، خۆراك!!. نەیانتوانیبوو لە کاتی کشانەوەدا بیانبەنە بەرزاییە رکو رازو ماهییەکان.

دەستکەوتەکانیان هەڵسەنگاند. لەشکری دوژمن لەشکرێکی رێكو پێك نەبوو. پارتیزان بوون. تەنانەت هەندێکیان کوڵەپشتەکانیان پڕ بە ئازووقەو تووتنو پەڕاوی، جێ هێشتبوو. هەندێ کوڵەپشت پێناسەی شەڕکەرەکانیان تێدابوو. هەندێکی تر پەلکەنانیان لێ بە جێمابوو، تازە قەپیان لێدا بوو. شوێنی تازەی ددانیان لە سەر نانی وشك مابوو.

(ماتیزی، لێرە، شتێکی بۆ دەرکەوت لە (تا)کەی دەردناکتر بوو: کراسو چاکەتو قەرەبیناو مەنجەڵۆ گوللەکان هی هەرێمی رۆمانیا بوون. پارتیزانانی (بێسارابی)کە (پەیامنێر لەسەر کەنارەکانی دنیێستەر)ی لە دژ نووسیبوون. لە (کریمێ)، لە بەرگری بەردەوام بوون. ئەمانە هاوڵاتی رۆمانی بوون. بەڵام ناویان بیانی بوو. (ماتیزی) ناوەکانی لە دفتەرەکەی تۆمار کرد. دەیانو دەیانو دەیان کەس بوون. ناوەکانی لەلا نائاشنا نەبوون. (ماتیزی) داوای کرد روخسەتی بدەن پیناسەو وێنەو مۆرەکان لەگەڵ خۆی ببا. ئەمانە پارتیزانانی (بێسارابی) بوون.

گوللەو چەكو تەقەمەنییەکانی لەشکری رۆمانی، بە پارەی سەربازەکان کڕابوون کە بەری رەنجی دایبابیان بوو. بۆ کڕینی ئەو شتانە فیداکارییان دەکرد، تەنانەت هەندێ جار خۆیان لە کەرتکە نانێك بێ بەش دەکرد. ئەمانەیان بۆ بەرگری کردن لە خاكو ماڵو

خانەوادەکانیان دەکرێ. بۆ بەرگری لە کلێسەکانیان. بۆ بەرگری لە ئازادی خۆیان دەیانکرێن. ئەو چەکانەیان بۆ ئەمە دەکرێ. ئێستایش، سەربازانی رۆمانی، بە دەستی هاوولاتیانی خۆیان، بەو چەکانەی بە بەری رەنجی خۆیان کڕابوون، دەهاتنە کوشتن. ئەوان، ئەگەر بە دەستی رووسەکانو بە تفەنگی رووسی بهاتبانەکوشتن، خەفەت نەبوو، ئاسایی بوو. بەڵام کە رۆمانەکان، لەسەر خاکی خۆیان، بە چەکی خۆیان، دەکوژران، (ماتیزی) هەستی دەکرد لە توورەیان، خوێنی دەوەستێ. پێستەی بە سەر سووقانەکانیدا گرژ دەبێتەوە.

(تودۆر) گوتی:

– نەختێ قاوە نافەرمووی؟ (فنجانە قاوەیەکی پڕی بۆ درێژ کرد.) رامسپاردووە ئەسپە وردیلەکەی وەك ئەسپی خۆتت بۆ بێنن. ئێستا دەتوانی کلۆ شەکری بدەیتێ. ئێستا دەیخوا، چونکە گەیشتووینەتە سەر بەرزاییەکان. چەند خولەکێکی دیکە، هاوڕێیەك بە سواری ئەسپەکە دێ. ناوت نابوو چی؟ (تەنیا)؟ دێتە ئێرە. نەختێ سەبر بگرە. (تەنیا) دێ...

(ماتیزی) فنجانی قاوەی بە دەستەوە بوو. تەماشای رەوە ئەسپی وردیلەی چیایی دەکرد، بە قەد (تەنیا) بوونو چەکی نیمچە قورسیان لێ بارکرابوو. بۆ لای دەستەی فەرماندەیان دەبردن. بە متمانەوە بە بزنەرێی چیایدا دەڕۆیشتن. شکارچییەکانو ئەسپە وردیلە چیاییەکان، بە ئاسانی بە بزنەرێی بەردەڵاندا دەڕۆیشتن. (ماتیزی)، لە گیرفانیدا، بە دوای ئەو

کلۆ شەکرەدا گەڕا کە (تەنیا) لە دەشت ڕەتی کردەوە. داییێ. (تـەنیا) بە تامەزرۆیی خواردی.

(تودۆر) گوتی:

ئەمشەو، دەگەینە دەریا. لەوانەیە لە هەنووکـەوە تـا هەفتەیـەکی تـر، مادۆنمان بدەنێ.

(تودۆر) شادمان بوو کە شەڕی (کریمێ)، کۆتایی دێو مادۆن دەدەن. شـادمان بـوو بگەڕێتـەوە مـاڵێو ژنو منداڵـەکانی ببینـێ، چـیاکانی (کارپات) ببینێ.

بەڵام لەو کاتەدا، تەقە دەستی پێکردەوە. یەکەم جار، تەقـەی قـەرەبینا بوو، ئینجا مەترەلۆز دەستی بە شێلکە کرد. (ماتیزی) خـۆی لـە پـەنا لۆری نا. تەماشـای ئـەو باریکـە ڕێیـەی کـرد کـە سـەربازو و ئەسـپە وردیلەکانی پێدا هەوراز دەچوو. سەربازەکان لەسەر ڕێگا ڕاکشابوونو تەقەیان دەکـرد. ئەسـپەکان بـە پێـوە بـوون. کـاتێ (مـاتیزی) سـەیری دەکردن، چوار ئەسپی وردیلە هێشتا، بە پێوە بـوون. ئینجـا ئەسـپەکان بانگەرۆز بوونەوە. بـە سـەر سـەربازەکاندا گلۆربوونـەوە کـە تەقـەیان دەکرد. گوللەی مەترەلۆز چوار ئەسپە وردیلەکەی بڕییەوە. (مـاتیزی) بێ حەمدی خۆی، کلۆ شەکرەکەی لە گیرفانی ورد کـرد. ئـەو کلـۆ شەکرەی دەیەویست بیدا بە (تەنیا). (تەنیا) لـە بـەر چـاوی، لـە سـەر زەوی، گەوزی دەدا، لە چەقی ڕێگای چیا کوژرابوو، ئەو ڕێگایەی کە زۆر هەستی تێدا بە ئەمان دەکرد. (تەنیا)یش بە گوللـەی ڕۆمانییـەکان،

گوللەی مەترەلۆزێکی رۆمانی، بە دەستی پارتیزانەکان، کە شاری (هالتزی)یان سووتاندبوو، کوژرا.

ئاگری مەترەلۆزەکان هێدی بووەوە.

(ماتیزی) هاواری کرد:

-(تودۆر! (تودۆر)، لە کوێی؟

(تودۆر)، لە سەر گیای وشکی ساخورەکە، چەند مەترێك لەولای لۆرییەکە، لەسەرپشت کەوتبوو. دەمی پڕ خوێن بوو. دەینالاند، فنجانە قاوەی ساردی خۆی لە دەست بوو. قاوەکە رژابووە سەر گیا. سەربازێك (تودۆر)ی راکێشایە پەنایەك. وایدەزانی (تودۆر) تەنیا برینداربووە. بەلام (تودۆر) مردبوو. رێك وەکوو (تەنیا)، بە هەمان مەترەلۆز کوژرابوو. گوللە هێشتا هەر گیزەی دەهات.

(ماتیزی) بە سکەخشێ چووە لای (تودۆر). (تۆدۆر)، گوللەی بە هەنیەو بە زارو بە دەمو چاو کەوتبوو. سەری کون ببوو. دەموچاوی لە پارچە گۆشتێکی خوێناوی زیاتر نەمابوو، سووقانی سپی، هیچ گۆشتی پێوە نەمابوو.

کە شەڕ تەواو بوو (دۆڵ درا، تەقەی بڕا)، مردووەکانیان لە دەم رێگا بە خاك سپارد. بە پەلە، بە جلوبەرگو بە پیلاوەوە، ئەسپەردەی خاکیان کردن.

ئەسپەکانیان نەناشت. ئەسپەکانیان بە تۆپیوی، لە دەم ڕێگا، لەسەر گیای وشك، جێ هێشت.

ئینجا کەوتنەوە ڕێ. بە هەمان نزم، بە هەمان بازدا کەوتنەوە ڕێ. جێگای چوار سەربازو (تودۆر) لە ستوونەکە بەتاڵ بوو. ئێستا، لە کۆتاییدا، (تەنیا)و سێ ئەسپی تر دیار نەبوون، لە چیا، لە دەم ڕێگا، مابوونەوە.

سەرهەنگ گوتی:

–سوپای سوور، لە ڕێگای دەریاوە، لە (کریمێ) بەرەو قەوقاز ڕۆیشتوون. تەنیا پارتیزانەکان ماون.

هەتاو بوو. سەرهەنگ تەماشای (ماتیزی) کردو بە ترسەوە لێیپرسی:

– (ماتیزی)، چت لێ هاتووە؟ تەماشای چاوم بکە. چاوت بە تەواوی بکەوە.

(ماتیزی) وەستا. تەماشای سەرهەنگی کرد. ئەوەندەی توانی چاوی زەق کردەوە.

سەرهەنگو (ماتیزی) لە پێشەوەی ستوونەکە دەڕۆیشتن. کە ئەوان وەستان، هەموو ستوونەکە سەنگرایەوە.

سەربازەکان هاواریان کرد:

– دەریا دیارە. جەنابی سەرهەنگ، دەریا دیارە!

راستە، لە خوارەوە، لە بەرامبەر خۆیانەوە دەریایان دەدی. دەریا وەك ئاسمان روون بوو، دوور بوو. بەڵام دەیاندی. ئەمە خاڵی کۆتایی بوو. سەرهەنگ سەیری دەریای کرد. ئینجا دووبارە تەماشای چاوەکانی (ماتیزی) کرد.

سەرهەنگ گوتی:

-زەردتکت گرتووە. وەکوو لیمۆ زەرد بووی. سپێنەی چاوەکانت زەرد بووین. تەواو زەرد بووین. هێمانی بگەینە کەنار، لە نەخۆشخانە دەتخەوێنین.

هێشتا نۆزدە کیلۆمەتر مابوو بۆ دەریا. (ماتیزی)، ئەم ماوەیەی لە ناو تەم بڕی.

شازدە رۆژ بوو (بوخاریست)ی جێ هێشتبوو. هێرش بۆ سەر(کریمێ) تەواو بوو ، لە دەریا کۆتایی نەهات، لە ناو تەم بە پایان گەیشت.

(ترایان ماتیزی)یان بە فڕۆکەیەکی سەربازی بردەوە وڵات. هەموو سەفەری گەڕانەوەی بە یەك هەست کۆتایی دەهات: رزگاریی لیمۆ. بە درێژایی ماوەی فڕینیان بەرەو نەخۆشخانەی سەربازیی (بوخاریست)، لیمۆیان دەرخوارد دا. تەنیا لیمۆو هیچی تر. هەمیشە هەر لیمۆ، لیمۆ!!

## (٢٢)

(ترایان ماتیزی)، لەو ماوەیەی لە نەخۆشخانەی سەربازی بوو، کتێبێکی تری نووسی.

سێ حەفتەی بەس بوو بۆ وەی کتێبەکەی لە بارەی (کریمی)وە بنووسێ. باسی مامۆستای (جانکۆری)و (تودۆر)و ئەسپە وردیلە چیاییەکانی بکا کە لە دەشت دەمردنو ئارەزوویان دەکرد بۆ ئەوەی لە چیا بژین. باسی پارتیزانەکانو کەناری (کریمی)ی بکا کە بە قەد کەناری (ئازور)و (یەلتا) هەتاوە. ئەمەی هەموو لە پشت تەمەوە دیبوو، ئەمەی هەموو کاتێ دیبوو کە لەبەر (تا) داوەشابوو. ئەوەی نووسیبووی، روون نەبوو.

بلاوکەر، کە هاتە نەخۆشخانەی سەربازی دەستنووسەکەی لێ وەربگرێ، گوتی:

-ئەم بەرهەمە بۆ کتێبخانە سەرکەوتوو نابێ. جەنگی (کریمی) لە ناو تەمەوە سەیرکراوە. شاعیرانە وەسف کراوە، تەنیا بە شێوەی هونەری. زۆری شیعر تێدایەو هیچ شتی واقیعی تێدا نییە.

(ترایان) گوتی:

-کاتێ مرۆڤ زەردتکی بیّو (تا)ی لیّ بیّ، هەموو شتیّ لە پشت تەمەوە دەبینیّ. دەلێی لەسەر هەورەوە تەماشا دەکا. راستە من جەنگی (کریمی)م بە چاوی نیوەنوقاوەوە دیوە بەلاّم ئەو کاتە ئاوها بووم. بە زەحمەت چاوم تا نیوە دەبووەوە.

کتێبەکە لە چاپخانە بوو. لەو رۆژانە بلاّو دەبووەوە. (ترایان) داوای لە دختۆر کرد بۆ ماوەی یەك مانگ مۆلەتی نەخۆشیی بداتیّ. دەیەویست مۆڵەتەکەی لە (ئیزفۆر) بباتە سەر.

دختۆری سەرهەنگ گوتی:

-جەنابی (ماتیزی)، شتی وا کەهالە! من ناتوانم یەك رۆژ مۆڵەتت پیّ بدەم. یاسا توندو تیژە!. حالەتی مۆڵەتدانی نەخۆشیی بە سەربازان، بە تەواوی تەسك کراوەتەوە. جگە لەمەیش، لە دەرەوەی ئەو حالەتانەی سەرۆکایەتی دیاری کردوون. هیچ ناکریّ!

(ترایان) گوتی:

-من بە تەواوی داوەشاوم! کێشم دە کیلۆ کەم بۆتەوە.

- مۆڵەت دەدرێتە ئەو سەربازانەی لە بەرەی شەڕ دێنەوە، ئەوانەی سەریان بریندار بووە، ئەوانەی شەهتن، ئەوانەی ورگیان عەمەلیات کراوە، ئەوانەی سیپەلکیان بە سەختی بریندار بووە. بۆ زەرتك، من

ناتوانم ئەو مۆڵەتەت پێ بدەم. ئەوەك سزام دەدەنو دەمگرن!. من دەسەڵاتی شتی وام نییە.

(ماتیزی)، بێ ئەوەی مۆڵەتەکەی وەربگرێ، لە نەخۆشخانەی سەربازی دەرچوو. خۆی بە سەرکردایەتی ناساند. بە غەموونیو بە هێواشی لە پلەکان سەرکەوت. ببوو بە پیاویکی تر.

سەرهەنگ (ستانکۆڤ) هیچ نەچووە نەخۆشخانەو کەسیشی نەنارد سەری لی بدا. ئەگەر (ترایان) لە شەڕگە بریندار بوایە، لەوانەیە یەکێ لە سەرکردایەتی بچووبایە سەردانی!

ئەوەی لە شەڕگەدا، تووشی زەرتك، تاسوورە، سکچوون ببێ، تەنانەت ئەگەر پێیش بمرێ، پاڵەوان نییە. دەبێ گوللەیەکی بە سەر، بە ورگ، بە سیپەلك بکەوێ بۆ ئەوەی ببێ بە پاڵەوان. بۆیە، هەرگیز مادۆنی نەخۆشی نادەنە ئەوانەی لە شەڕگەدا تووشی نەخۆشییەکی وا دەبن کە دەشێ تووشی هەر کەسێکی دی ببێ. رەنگە لەبەر ئەمە بێ، (ترایان) کاتێ لە پلەکانەی سەرکردایەتی سەردەکەوت، هەستی بە زەلیلی دەکرد. بەوە سەخڵەت بوو کە بچێتە بەردەم سەرهەنگ (ستانکۆڤ)و پێی بڵێ لە (کریمێ) تووشی زەرتك هاتووە. زەرتك نەخۆشییەکی سەربازی نییە. نەخۆشییەك نییە مرۆڤ لە سەنگەری پێشەوەی شەڕ تووشی ببێ. پێویستە لە سەنگەری شەڕدا، بە گوللە دابێژرێ . پیاو ئەگەر تووشی زەرتك ببێ، مافی هیچی نییە..

لەگەڵ ئەمەیشدا، (ترایان) داوای کرد چاوی بە سەرهەنگ (ستانکۆڤ) بکەویّ. دەبیّ بە هەر نرخیّ بیّ چاوی پیّبکەویّ و پیّی بلّیّ لە نەخۆشخانە دەرچووەو دووبارە ئامادەیە ئەرکی خۆی جیّ بە جیّ بکا.

دەرگەوانی سەرهەنگ گوتی:

-سەرهەنگ (ستانکۆڤ) لە بەشی راگەیاندن نەماوە.

ئەم سەربازە (ترایان)ی نەدەناسی. جاران هەموو سەربازەکان (ماتیزی)یان دەناسی. هەموو شت گۆڕابوو. ئیّستا، کەشیّکی چڕی سەربازیی بەشی بانگەشەی داگرتبوو. (ماتیزی)، ناوی فەرماندەی نویّی وەرگرت.

دەرگەوانەکە نیشانەی (ر.ب)ی لە بەرۆکی چاکەتی (ماتیزی) بینی، پرسی:

-تۆ بە ریّگای زنجیرەی پلەو پایەوە نەبیّ، ناتوانی بگەیتە سەرهەنگ. یەکەم جار خۆت بە ئەفسەر بناسیّنە، ئینجا برۆ لای کاپتن و پاشان لای فەرماندەو بەم جۆرە پیّدا برۆ. بیّگومان، ئەگەر شتیّکی گرنگت هەبیّ پیّیانبلّیّ.

(ماتیزی) گوتی:

-من لە نەخۆشخانە دەرچوویم.

سەربازەکە بە لاقردی گوتی:

-دەتەویٚ قسە لەگەڵ سەرهەنگ بکەی بۆ ئەوەی پێبڵێی لە نەخۆشخانە دەرچووی؟ بۆ دەرچوون لە نەخۆشخانە، بڕۆ لای یاریدەر، نەك سەرهەنگ.

(ماتیزی) بە گوێی کرد. یاریدەر ناوی لە دەفتەرێك نووسی. ئاگاداری کردەوە کە نیشانەی (ر.ب)ی زۆر لە خوارەوە داوە. (ماتیزی)، لەسەرەتای جەنگەوە، نیشانەکەی لەو جێگەیە دابوو. کەس پێینەگوتبوو زۆر لە خوارەوە دراوە. کەچی ئیستا، ئاگاداریان کردەوە نیشانەکە لە جێگای دیاریکراوی خۆی نەدراوە.

یاریدەر لەگەڵ (ترایان) چووە لای ئەفسەری فەرماندەی دەستە. کەشی مەدەنی سەردەمی سەرهەنگ (ستانکۆڤ) نەمابوو. لە سەردەمی (ستانکۆڤ)دا، بەشی راگەیاندن لە دەستەی نووسینی رۆژنامەی دەکرد. ئێستا لە سەربازخانەی شکارچیی (برازۆڤ) دەکا. هەمان کەشی نەیاریی نەخۆشخانەی سەربازیی بوو دژی مەدەنییان. سەرباز رقیان لە مەدەنییان دەبێتەوەو حەز دەکەن سووکایەتییان پیێ بکەنو ململانەیان لەگەڵ بکەن. (ترایان) تێگەیی مەبەستی سەرەکی ئەفسەرانی بانگەشە، ئەوەیە سووکایەتی پیێ بکەن. وەکوو لە (برازۆڤ) سووکایەتیان پێکرد کاتیٚ سەرتیپەکە چاویلکەکەی فڕێدایە ناو کۆچەڵەی چا. لێرەیش رێك هەمان کەشو هەوایە.

-کارێکت پیێ دەسپێرین. ئەوە بۆچی چەکمەکانت بۆیە نەکردووە؟

(ترایان) بێدەنگ بوو.

ئەفسەرەکە گوتی:

دەچیتە بەرەی شەڕ. سەربازی گەنج ئێشیان لە نووزگە نییە.

(ترایان) گوتی:

-من تازە لە نەخۆشخانە دەرچوویم. تا ئێستا دوو جار چوومەتە بەرەی شەڕ. سێ کتێبی جەنگیم نووسیوە.

ئەفسەرەکە گوێی بەم قسانە نەدا. حەزی لە کتێب نەدەکرد. ئەو، ئەمەی بەلاوە گرنگ بوو کە پەیامنێر چەکمەکەی بریقەدار بێ. نیشانەکەی لە جێگای تایبەتی خۆی دابێ‌و تەراشی کرد بێ. ئەفسەر، بێ ئەوەی سەرنج لە (ماتیزی)ی سەرباز بدا، پەڕەکانی دەفتەرەکەی ئاوا کرد.

ئەفسەرەکە گوتی:

-دەچیتە هێزی دەریایی. هێزی دەریایی شاهانە داوای پەیامنێرێکی جەنگیان کردووە. بەیانی، دەچیتە (کۆنستانتزا) .

(ترایان)، بە ئامادەیی لەبەر دەم مێز وەستا بوو.

ئەفسەرەکە هاواری کرد:

-ئیتر چەمەڕای چیت؟ زوو بڕۆ بۆ لای تاقمەکەت. پسوولەی ڕێگا وەربگرە. بەیانی، لە (کۆنستانتزا)، دەچیتە فەوجەکەت. ئەگەر دوا بکەوی، زیندانی دەکرێی.

(ماتیزی) گوتی:

-بەڵێ. حاڵی بووم.

* * *

سبەینەی ڕۆژی پاشی، (ترایان)، لە ئێستگەی ڕێگای ئاسنی (کۆنستانتزا)، لە قەتار دابەزی. لە ئێستگە، پەیکەری (ئۆڤید)ی بینی کە کاتی خۆی سورگومکرابوو بۆ ئەم شارە. دوای ئەوە کەشتی گەورەی جەنگی بینی. (ماتیزی)، تەنیا بە وێنە، یان بەو شێوەی کە لەگەڵ قوتابیخانە دەچوونە سەیرانی سەر کەنار، دیبووی، هێزی دەریایی دەناسی. بەڵام قەت سواری کەشتی نەبوو. کەچی ئەوەتا، لەو ڕۆژەوە، بووە بە دەریاوان. بیست‌و چوار سەعات پێشتر، کە لە نەخۆشخانە بوو، هەرگیز بە بیریدا نەدەهات بە ماوەی شەوو ڕۆژێك لە کەشتییەکی جەنگیدا، دەبێ بە دەریاوان. بەڵام لە کاتی جەنگدا، هەموو شتێ لە سەربازییدا، لەگوینە.

ئەفسەرانی هێزی دەریایی بە هاتنی (ترایان) شادمان بوون. حەزیان دەکرد کتێبێکی وەکوو (پەیامنێر لە کەنارەکانی دنی یێستەر)و (جەنگی کریمێ)و (سەردەمی دوعا)یان لە بارەوە بنووسێ. دەریاوانان روخسەتیان دا جلی مەدەنی لەبەر بکا. خۆشترین ژووری (داسیا)ی زیباڵێکیان دایە. تا ئەو کاتە هیچ پەیامنێرێك هیچی لەبارەی هێزی دەریایی نەنووسیبوو.

فەرماندی هێزی دەریایی شاهانە گوتی:

-بــه هــەر حــاڵ پاڵــەوانێتیی هێــزی دەریــایی، وەکــو پاڵــەوانێتیی فڕۆکــەوانیو وەکــوو پاڵــەوانێتی لەشــکری زەمینــی نییــە، وایــە لــە دەریــاوانیی شــاهانەدا، تــۆ شــتێك لەســەر ئێمــە دەنووســی. راســتە، پاڵەوانێتی تاکەکەسی لە هێزی دەریاییدا نییە وەك ئەوەی لــە هێزەکــانی تردا هەیە. بەڵام لێرە، پاڵەوانێتی بە کۆمەڵ هەیە. تۆ بە چــاوی خــۆت ژیانی ئێمە دەبینی. ژیانێکی کەلەجارە. هەڵبەت سەرنجت رادەکێشێ!

(ترایان)، لــە رۆژەکــانی هەوەڵیــدا، کەشــتییە جەنگییــەکانی بەســەر کردەوە. رۆمانیا، تەنیا زیباڵێکی جەنگی بچووکی لەسەر دەریــای رەش هەیە. هێزی دەریایی گرنگییەکی وای نییە. (ماتیزی) چــالاکیو دەوری هــەر یەکــە لــە کەشــتییەکانی وەرگــرت. هەنــدێ کەشــتی ئــەرکیان گوازتنەوەی سەربازیی بوو و هەندێکی تر لەگەڵ کەشتیەکانی سەربازیی دەچوونو دەیانپاراستن.. لۆتکە هــەبوون، کــتوپڕ پــەلاماری کەشــتی دوژمنیان دەداو ئینجا بە خێرایی دوور دەکەوتنەوە. کەشــتیی دانانــەوەو هەڵگرتنەوەی مینیش هەبوو. دواکێشو بەلەمی نەجات هەبوو. هەموو هێزی دەریایی ئەوەندە بوو و بەس! ئینجا ناقووڕێکیشی لێ بوو. یەك تاقە ناقوورا پێیدەگوترا (دۆفان). قوتابیخانــەی دەریــاوانی بــوو.. لــە کــاتی جەنگدا، تا ئێستا دوو ئەرکی لە ئاوی دوژمن ئەنجام دا بــوو، خــۆی بــۆ ئەرکی سێیەم ئامادە دەکرد.

فەرماندە گوتی:

-دڵت کام کەشتی گرت، سواری بە!! گرنگ نییە هەر کەشتییەك بێ!

جەنگی سەر رووی دەریا، وەکوو جەنگی سەر رووی زەوی، یەکێکە لە دڵتەزێنترین پیشەی مرۆڤایەتی. ناخۆشترینو پڕ مەترسیترین، سواوترینو گەمژەترین پیشەیە. (ترایان) تەماشای کەشتی مین دانانو مین هەڵگرتنەوەی کرد. تەماشای کەشتی گواستنەوەی کرد، نەیتوانی بڕیار بدا. سەرنجی کەوتە سەر ناقوورەکە. لەشکری رووسی هێشتا لە رۆژهەڵاتی (کریمێ) بوون. کە قەفقاز لە رێگای دەریاوە بژێوی بۆ دابین دەکردن. بڕیار بوو (دۆفان) بچێ پەلاماری ئەو کاروانەی سۆڤێت بدا کە تفاقو خواردنی بۆ رووسەکانی (کریمێ) دەهێنا. (ترایان) بڕیاری دا لەگەڵ ناقوورەکە دەربچێ.

فەرماندە گوتی:

– ژیانێکی لە رادەبەدەر دژوارە. پێم وایە تۆ زۆر بەرگە ناگری. بۆ ئەوەی لە ناو ناقوور بژی، دەبێ جەستەیەکی تۆکمەو بەهێزت هەبێ!

(ترایان) تەماشای کەشتییە جەنگییەکانی کرد. وەکوو هەموو کەشتییەکی ئاگاداری نوێنەرانی گەشت وابوون. کەشتی جەنگیی، جیاوازییان ئەوە بوو، تۆپیان هەبوو. (ترایان)، کە تەماشای کەشتییەکانی دەکرد، وەکوو هەر کەسێکی سەر کەناری دەریا، ئارەزووی چوونە جێیەکی کەسنەزانی دەکرد. حەزی دەکرد سەفەرێك بکا. بەڵام سەفەرێکی جیا لە سەفەرەکانی تر. گوتی:

من لەگەڵ ناقوورەکە دەچم. لەگەڵ ناقوورەکە، بە گەشتی دەریایی، بۆ ئابلووقەدانی (کریمێ) دەچم.

فەرماندە گوتی:

-ژیان لە ناو ناقووردا، لە ژیانی ناو سلوولی زیندان دژوارترە.

(ماتیزی) بڕیاری خۆی دا. فەرماندە بە ئامادەیی وی، فەرمانی دەرکرد:

-ناوی جەنابی (ترایان ماتیزی) لە لستی ناوی ئەو تاقمە بنووسن کە بە (دۆفان)، بە ئەرك دەردەچن.

## (٢٣)

ناقوور به نهێنیترین شێوه به ئـەرك دەردەچـێ. کـەس ڕۆژو سـاتی بـه ڕێکەوتنی نازانێ. بگره نازانێ نەفەرەکانی تاقمەکه کێن. (مـاتیزی) بـۆ کەس‌و کـاری خـۆی نووسـی لـه (ئیزفـۆر)، ئەگـەر چـەند حەفتەیـەك خەبەری ئەمیان نەبوو، نیگەران نەبن.

بەر لەوەی به ڕێ بکەون، (ترایـان)، وەکـوو دەریـاوانێکی تاقمەکـه، پێویستییەکانی جێ به جێ کرد. وەسیەتنامەی نووسی‌و دایـه فەرمانـدە. قوتی جگەرەو سەعات‌و شیعره دەستنووسـەکانی لـه نـاو زەرفێـك نـاو ناونیشـانی ئـەو کەسـانەی لەسـەر نووسـی، کـه ئەگـەر ناقوورەکـه نەگەڕایەوە، شتەکان وەربگرن.

هەشت ڕۆژ دوای نووسـینی وەسـیەتنامەکه، سـەعات دووی بـەیانی، خەبەریان دایه، به ڕێ دەکـەون. (ترایـان) بـه سـەر پشـتی ناقوورەکـه کەوت. ناقوور لـه شـێوەی جگەرەیـەکی زەبـەللاح دایـه. بـه وریـایی دەڕوا. (ترایان) لـه کونێکی خڕی وەکوو زارکی سوولاوکه، چووه نـاو ناقوورەکه. چلو چوار نەفەرەکەی تاقمەکه لەوێ بوون. فەرمانـده لـه

هەموویان بە تەمەنتر بوو. تەمەنی بیست و هەشت ساڵ بوو. ئەوانەی دی تەمەنیان لە نێوان بیست، تا بیست و چوار ساڵ بوو.

تەختەکانی نووستنی ناو ناقوور، بە درێژایی دیواری ئاسنی ناقوورەکە، چین لەسەر چین، لە سەر یەك کرابوون. وەکوو ڕەفکەی کتێبخانە تەسك بوون. کە مرۆ لەسەری رادەکشا، ئەستەم بوو بتوانێ خۆی وەربگێڕێ. نەشیدەتوانی بە کەیفی خۆی لاق لێ رابکێشێ. ڕەفکە-تەختەکان کورت بوون. نەك تەنیا تەسك بوون، بەڵکو کورتیش بوون. جێگا، لە ناو ناقوور، بە نرخترین شتە. تاقمی ئەرکداری لێ دەربچێ، ئەوانەی تر دەبێ هەمیشە لەسەر تەختە تەسك و کورتەکان درێژ بن. بۆ ئەوەی کەمترین جێگا بگرن. هەموو جلی چەرمیان لەبەرو چەکمەی لاستیکیان لە پێیە. ژێرەوە ئاوی دەریایە، تەڕە، دونیا ساردە. ئۆکسجین لە کۆگای گەورەی پۆڵایین، لەناو ماتۆڕخانە ریزکراون، چل و چوار کەسەکە هەناسەی پێدەدەن. یۆکسیجینەکە بە شێرە دابەش کراوە.

پلانی کردەوەکە سادە بوو. لەگەڵ ئەنگووتنی بەیاندا، دەبوو نووقار بچێتە ژێر ئاوو و بڕوا. تا لە بن ئاو بێ، بە هۆی دەنگەوە ڕێنمایی دەکرێ. ئەگەر بە دەزگای دەنگدانەوە، گوێیان لە دەنگی کەشتییەك بێ، دەبێ بۆ ئەولا بچن. ئینجا دەبێ یەکێ لە چوار ئەژدەری ناقوورەکە لە کەشتی دوژمن بەردەن.

شەو، ئەگەر هیچ کەشتییەکی دوژمنیان لە دەوروبەر نەبێ، ئەگەر هەیوەشەویش نەبێ، ناقوورەکە دەتوانێ بێتە سەر رووی ئاوو تا بەیانی

وەکوو هەر کەشتییەك لەسەر ئاو بسووڕێتەوە. ئەوسا دەبێ سەر لە نوێ بچێتەوە بن ئاوو لە قوولایی دەریادا، ڕێی خۆی بگرێتە بەر.

(ترایان ماتیزی) گوێی دابووە ڕوونکردنەوەکانی فەرماندە. تەماشای نەخشەیەکی دەکرد. نەخشەی دەریای ڕەش‌و کەنارەکانی بوو. ئەوان ئامانجیان، کەنارەکانی (کریمێ)و (قەفقاز) بووکە کەشتیی ڕووسییان پێدا دەهات‌و سەربازو تەقەمەنی‌و چەکیان دەگوازتەوە بۆ (کریمێ). ئەوان، ئەرکیان ئەوە بوو ئەو کەشتییانە نقووم بکەن.

فەرماندەو (ماتیزی) لە ناوەندی ناقوورەکە، لە لوقنتەی سەربازان بوون. ژوورەکە مێزێکی بچووکی سەفەری‌و چوارپایەکی سەفەری تێدا بوو، فەرماندە لەسەری دەخەوت لەگەڵ بنکەی پلیکانەیەکی ئاسن کە لەو سەری دالانەکە دەچووە دەرگای دەرەوەی ناقوورەکە. دەرگا خولاوەکە، کە وەکوو قەپاغی زارکی زێراب وابوو، بە توندی لەسەر سەریانەوە قەپات کرابوو.

شەوی یەکەم، ناقوورەکە نەهاتەوە سەر ئاو. دوژمن لە بەندەرەوە، چاوەدێری دەرچوون‌و ڕۆیشتنی کەشتییەکانی دەکرد. وا چاك بوو ناقووڕەکە لە ڕۆیشتنی خۆیدا بەردەوام بێ‌و هەردوو لا ڕەچاو بکا. بەیانی ڕۆژی پاشی، لە ڕۆیشتنی ژێر ئاو بەردەوام بوو. قاوەیەکی ساردیان خواردەوە. خواردنی قووتوویان خوارد. کاتێ ناقوور لە بن ئاو بێ، شت لێنان‌و ئاگرکردنەوە قەدەغەیە. عەنبارو پاترییان لە ژێر پێیە.

لەوانەیە یەك پڕووشك بیێ بە مایەی تەقینەوە. جگەرە خواردنیش قەدەغەیە.

(ترایان) دەیەویست بزانێ لەو قوولاییەی تێیدان، دەریا شکڵی کووە؟ فەرماندە دەریچەیەکی بەربەستی کردەوە ئاوی دەگێڕایەوە، هۆرتمەیەکی بە مینای نەشکەنی هەبوو. ئاوی ڕەشی دەورو بەر لەو چاوە شووشەیە دیار بوو. ئاوێکی ڕەشی وەك قیر. هیچ تیشکێکی خۆر نەدەگەیشتە ئێرە. ئاوەکە ڕەش‌و سارد بوو. لە ناو ناقوورەکەدا، هەناسەی نەفەرەکان دەبوو بە خوناو. ئەو هەوایەی نەفەرەکان دەیاندایەوە، لە سەر دیواری ئاسنی ناوەوەی ناقوورەکە چڕ دەبووەوەو بە شێوەی پشکاوی ورد بەردەبووەوە سەر نەفەرەکان. بۆیە هەموویان جلی چەرمیان لەبەر دەکرد. ناو ناقوور، تەڕو سارد بوو.

(ترایان)، لە ڕۆژانی هەوەڵێدا، زانیاری لە بارەی ئامێرەکان‌و لەبارەی شەڕ وەردەگرت. لەگەڵ ئەوەیشدا، ڕۆژگار بە سستی دەڕۆیشت. شەوی دووەم، یانی لەوەتی لە بەندەر دەرچووبوون، یەکەم شەو بوو لەسەر رووی ئاو دەڕۆیشتن، (ماتیزی) زانی کاتێ ناقوور وەکوو کەشتییەکانی دی لەسەر رووی ئاو دەڕوا. دەریاوانەکان هەقیان نییە بچنە سەر پشتی ناقوورەکە. لە جێگەی داخراوی خۆیان دەمێننەوە. یەك یەك، بە نۆرە دەچنە دەرەوە.

فەرماندە گوتی:

– لەکاتی مەترسیدا، دەبێ بە ماوەی سێ چرکە، بچینەوە بن ئاو. کاتمان نییە چاوەڕێ بکەین تا نەفەرەکان دێنەوە ناو ناقوور. بۆیە هەر جارەی تەنیا ڕێگای یەك نەفەر دەدەین بچێتە دەرەوە.

ئەگەر ناقوور بکەوێتە بەر هێرش، هەر هەندەی پێ دەکرێ بچێتەوە بن ئاو.

لە ڕۆژی پاشییەوە، بژێی خواردن نەما. دەریاوانان تەنیا کەمێ قاوەو بڕێ کۆنیاكو حەبی ڤیتامینیان دەخواردو هیچی تر. جاروباریش چوکلاتیان دەکرۆشت. ڕۆژگار بە سستی دەڕۆیشت. کە ناقوور لە ژێر ئاو بێ، رادیۆ وەرناگرێ. تەنیا کە بەسەر ئاو دەکەونەوە، دەتوانن پەیوەندی ڕادیۆیی بکەن، یان گوێ لە (تی. ئێس. ئێف) بگرن. کە لە بن ئاو نقووم دەبن، بە تەواوی لە دونیا دادەبڕێن. جەنگی ژێر ئاو یەکنەواو تاقەتپڕوێنو ناخۆشە. هەموو ڕۆژێ، هەموو سەعاتێ، هەمان شت دووبارە دەبێتەوە.

دوای پێنج ڕۆژ چەمەڕا، کە هەمان بەرنامەیان پەیڕەو دەکرد. جارجار، چاوەدێری دەنگی کەشتییەکیان دەکردو لە دەستیان دەدا. گوێیان لە دەنگێکی سەر ڕووی ئاو دەبوو. وەکوو چرتەی زیخ وابوو کە بە شووشە بکەوێ. ئەو چرتانەی بە دەنگی خەفە بە پشتی ئاسنی ناقوورەکە دەکەوتن، بۆمبا بوون. بەڵام دەنگیان لە دەنگی چرتەی دانە زیخ، زیخی بچووکی بە قەد دنکە قاوە، قایمتر نەبوو..

فەرماندە گوتی:

-ئەمانە بۆمبان، فڕۆکە دەیانهاوێن! ئەو بۆمبایانە لە قوولآیی ئاو دەتەقنەوە.

کەواتە هێزی ئاسمانی سوور ئاگادار بوون کە ناقوورێکی رۆمانی لە ئاوەکانی رووسیدایە. واتە ئاشکرا ببوون.. دەبوایە زیاتر پارێز بکەن. دوای نیو سەعات، دەنگی زیخباران بڕا.

فەرماندە روونی کردەوە:

-یەك تاکە بۆمبا بە کۆگا بکەوێ، ەسە. هەموو شتێ دەبڕێتەوە. بە زۆری ناقووری ژێر ئاو زەبری وای پێناکەوێ بتەقێتەوە، بەڵام ئەوەندەی زەرەر پێ دەگا کە نەتوانێ سەرکەوێتەوە بۆ سەر رووی ئاو. لەم حاڵەتەدا، هەتا هەتایە لە ژێر ئاودا دەمێنێتەوە.

(ماتیزی) پرسی:

-رێنمایی سەربازیی بۆ حاڵەتی وا چییە؟ دەریاوانانی ناقووری پێکراو و مەحکووم بە مانەوەی هەتاهەتایە لە قولآیی ئاو، چ دەکەن؟ رێنمایی ئاسایی چییە؟

ئەگەر بپێکرێین، دەبێ تا شەو چاوەڕێ بکەین. کە تاریك داهات، هەوڵ دەدەین بچینەوە سەر رووی ئاو. ئەگەر نەمانتوانی، هەوڵ دەدەین کێماسییەکە بەر تەرەف بکەین، ئەگەر سەرنەکەوتین سەرکەوینەوە سەر ئاو، خۆمان دەدەینە دەست قەزاو قەدەر. بە کپ‌و بێدەنگی، چاوەڕێی مردن دەکەین. لە ناو ناقوورەوە، ناتوانین پەیامی فریاخواستن رەوانە

بکەین، ناتوانین داوای یارمەتی بکـەین. چـاوەڕێ دەکـەین کـە هـەموو ئۆکسیجینی کۆگا تەواو بوو، بخنکێین!!

(ماتیزی) پرسی دوای مردنی تاقمەکە، ناقوورەکە چی بەسەر دێ.

-نـــاقوور، دەتـــوانێ دوای ئـــەوە، ماوەیـــەکی زۆر زۆر بـــە بـــارو جەنازەکانەوە، بەم لاو بەولادا بڕوا. ئینجا شۆڕ دەبێتەوە بۆ بنی دەریا.

سەردەستەی هەواڵگری، چووە لای فەرماندە، گوتی:

-دەنگی کەشتییان دێ. دەڵێی لۆتکەی تیژڕۆی شەڕ بـەرەو لامانـەوە دێن.

لە بن ئاودا. مرۆ زۆر لە دوورەوە گوێی لە دەنـگ دەبـێ. بـە هـۆی دەزگاکانی ناقوور، دەتـوانین، بـە گـوێرەی دەنگەکـە، بـازی ڕەوتو جۆری ئـەو کەشـتییە دیـاری بکـەین کـە بـە سـەر سـەرمان، یـان بـە دەوروبەرماندا دەڕوا.

ئەو ئاگادارییە بوو بە هۆی ترسو تۆقان. گەورەترین دوژمنـی نـاقوور لۆتکەی تیژڕۆیە. فەرماندە هوشیاریی ڕاگەیاند. هوشیاریی، بـۆ نـاقوور کە بچێتە بن ئاو، مانای لە کارخستنی هەموو مەکینەکانو خەفـەکردنی هەموو جۆرە دەنگێکە. تاکە هۆی بەرگری کردنی ناقوور، بێدەنگییـە. چلو چوار نەفەرەکە قوڕقاپیان لێکرد. کەس قولماتی نـەدەکرد. هـەموو گوێیان ڕادێرا بوو. دەنگی لۆتکەی تیژڕۆ بە گوێ نەدەبیسرا.

سەردەستەی هەواڵگری چرپاندییە گوێی فەرماندە:

-بە خێرایی لێمان نزیك دەکەوێتەوە.

فەرماندە بە دەنگێکی نزم گوتی:

-ئەگەرچی هەموو مەکینەکان وەستاون، لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە لە ڕۆیشتن بەردەوام دەبین. ئێمە، لێرە، پەنجا مەتر لە قووڵایی ژێر ئاوین. تەوژمی ژێر ئاو دەمانبا. بە خێرایی نزیکەی هەشت کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا، لا بەلا دەکشێین.

(ماتیزی) پرسی:

بە چ لایەکدا دەکشێین؟

فەرماندە گوتی:

-ئەمە نازانین. ئەمشەو کە چووینەوە سەر ئاو، دەتوانین بازەکە دیاری بکەین و بزانین تەوژم بەرەو کام لای بردووین.

لەو کاتەدا کە (ترایان) بیری دەکردەوە ناقوورەکەیان ئێستا بە خێرایی هەشت کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا، لەگەڵ تەوژمی ژێر ئاو، قووڵایی تەی دەکا، لە جاری یەکەم توندتر زیخیان بەسەردا باری. ئەمانە بۆمبا بوون.

فەرماندەگوتی:

-لۆتکەی تیژڕۆی سۆڤێت بۆمبابارانمان دەکەن.

(ماتیزی) پرسی:.

چۆن ئێمەیان دۆزیوەتەوە؟

ئەو فڕۆکانەی بەسەر سەرماندا فڕیون، ئێمەیان بینیوە. ئەگەر دەریا ساف و ئارام بێ، فڕۆکە بە ئاسانی دەتوانێ ناقووری ژێر ئاو بدۆزێتەوە. لە دەریای (رەش)دا، دەتوانێ نزیکەی تا قوولایی بیست مەتر شت بدۆزێتەوە. رەنگە ئەمڕۆ دەریا روون بووبێ. لەگەڵ ئەوەیشدا، ئێمە لە قوولایی پەنجا مەتردا بووین و فڕۆکە نەیدەتوانی بمانبینێ. لەوانەیە شەوێ دی، کە لەسەر رووی ئاو بووین، بە هۆی دەنگەوە، بە ئێمەیان زانیبێ.

فەرماندە لە قسەکەی بەردەوام بوو. بۆمباباران دیسان چەند چرکەیەك درێژەی کێشا. ئینجا دەنگ نەما. لەگەڵ ئەوەیشدا، سەربازانی هەواڵگری گوێیان لە دەنگی لۆتکەکان بوو. دوور نەکەوتبوونەوە. هێشتا لە سەر سەریان بوون.

-رووسەکان دەزانن ئێمە لە ناو ئاوەکانی ئەواندایین و بە دوامانەدا دەگەڕێن. گومانی تێدا نییە بە ئێمەیان زانیوە.

لە هەمان کاتدا، بۆمبابارن دەستی پێ کردەوە. بۆمبارانەکە وردە وردە لە ناقوورەکە نزیك دەکەوتەوە. دەتگوت یەکەو راست لە سەر سەریانەوە دادەبارەی.!

-ئایا ئەگەر هیچ دەنگمان لێوە نەیە، دەتوانن بماندۆزنەوە؟ تۆ گوتت تەنیا دەنگ دەتوانێ جێگاو قوولاییمان ئاشکرا بکا.

فەرماندە ڕەنگی لە ڕوودا نەمابوو. خۆی لە وەلامدانەوە دوور دەخستەوە. بیری لە شتێکی خەبار دەکردەوە. داهاتەوە سەر (ترایان)و بە سرتە گوتی:

-ئەگەر ڕۆن لە مەکینە چووبێ، پەڵەیەك لە سەر سەرمان دروست دەکا. ڕۆن، لە دوورەوە، لەسەر ڕووی دەریا دیارە. شوێنەکەمان ئاشکرا دەکا.

– ئایا دەشێ مەکینە ڕۆنی لێ بچێ؟

فەرماندە شانی هەڵتەکاند. جوولانەوەکەی وای دەگەیاند کە دەشێ شتی وا ڕوو بدا. بۆڕییەك کون ببێ، لوولەیەك بتەقێ و ڕۆن بچێتە سەرەوەی ناقوور.

دیسان بارانی بۆمبا دارژا. دەتگوت مست مست دنکە زیخ بە مینا دادەکەن.

فەرماندە گوتی:

-یەکەو ڕاست لەسەر سەرمانن. ڕێك لەسەر سەرمان!

لە هەمان کاتدا، بۆمبایەك ڕاستەوخۆ بە بۆدی ناقوورەکە کەوت. ڕێك بە سەر لوقنتەی سەربازان کەوت، کە ماتیزی‌و فەرماندەی لێ بوو. دەتگوت کوتك بوو پێکەوت. چل‌و چوار کەسەکە جوولەیان لە خۆیان بڕی. ڕەنگیان پەڕی. هەناسەیان ڕاگرت. فەرماندەو دەریاوانان چاویان هەڵبڕی، تەماشای سایپتەی ئاسنی خۆڵەمێشیی ناقوورەکەیان کرد کە پشکە ئاوی لێ دەهاتە خوارێ. هەموو بە ترسەوە سەیریان کرد.

تەماشای ئەو شوێنەی ساپیتەیان کرد کە کوتکەکەی پێکەوت. ساپیتە هەروەکوو جاران بوو. نەختێ تەڕو ژەنگاوی بوو. دڵۆپە ئاوی لێدەهات، دەتگوت دڵۆپە ئاو لە بنی سولاوکەوە دەچکێ.

ئینجا چاوی بیمناکیان بڕییە سەر مێزی سەفەریی فەرماندە. وێنەیەکی زیوی زۆر گەورەی پاکیزە بە دیواری ئاسنەوە هەڵواسرابوو. هەر جارەی بۆمبایەك بەردەبووەوە، هەموو چاویان دەبڕییە سەرەوە بۆ ساپیتەو ئینجا بۆ لای وێنەکە. ئینجا سەر لەنوێ بۆ ساپیتەو دووبارە بۆ سەر وێنەکە. هەر ئەوەندەو بەس! کەس لەمە غافڵ نەدەبوو.

فەرماندە، چەکمەکەی لە پێ کردەوە تەنیا چەلینی لە پێ ما. هێدی لە سەر پەنجەی پێ هەنگاوی ناو چووە ژووری تەنیشت کە ئامێرەکانی تێدابوو. دوو تەکنیکاری لە تەك بوو. لە شتێکیان دەکۆڵییەوە. بۆمباباران نیو سەعاتی تر بەردەوام بوو. کەس جوولەی نەکرد. فەرماندە، دووبارە بە تای چەلین، گەڕایەوە جێی خۆی. لۆتکەکان ڕۆیشتن. بۆمباباران وەستا. لەگەڵ ئەمەیشدا، فەرماندە تا بڵێی نیگەران بوو.

(ماتیزی) پرسی:

-لە ژووری ئامێرەکان چت پشکنی؟ هەموو مەکینەکان کوژاونەتەوە. چیت بینی؟

فەرماندە گوتی:

-ناقوور پێکراوە، بەڵام نازانم لە کام لا.

(ماتیزی) بیری کردەوە رەنگە تازە هەرگیز سەر ئاو نەکەونەوە.

-بە یەك دوو سەعاتی تر، پێدەکەوین ئاخۆ پێکرانەکە مەترسی هەیە ؟ یان نا؟و لە کوێیە؟ حاڵی حازر، ناتوانین هیچ بزانین. ئەگەر یەکێ لە مەخزەنەکانی بەنزین، یان رۆن، پێکرابێ، پەڵەیەکی گەورەمان لەسەر سەر پەیدا دەبێ. لەو حاڵەتەدا، ئەوان دەگەڕێنەوە بۆمبارانمان دەکەن، ئەم جارە، بە شێوەیەکی وردیش!!. بەڵام ئەگەر لە هەنووکەوە تا دوو سەعاتی دیکە، بۆمباران نەکراین، بەختمان دەبێ بە سەلامەتی گیان دەر بەین.

سەردەستەی هەواڵگری گوتی:

-لۆتکەکان وا دێنەوە.

بوو بە کپییەکی مەرگبار. لۆتکەکان چەند جار بە سەر ناقوورەکەدا سووڕانەوە. بەڵام هیچ بۆمبایان نەهاویشت. ئینجا دوور کەوتنەوە. سەعات چواری پاش نیوەڕۆ بوو. کەس هیچی نەخواردبوو. لێپرسراوی خۆراك، سەری دەبردە بن گوێی هەر یەکێك و لێی دەپرسی داخۆ حەز لە چ خواردنێك دەکا. هەموو، سەریان با دەداو دەیانگوت:

- سوپاس. برسیم نییە.

(ماتیزی) پرسی:

-ئایا دەبێ نەتوانین سەرکەوینەوە سەر رووی ئاو؟ تۆ رات چییە؟

فەرماندە گوتی:

-ئەمشەو، سەعات نۆ، تێیدەگەین. لە ئێستاوە تا ئەوسا، خێنژی چاوەڕوانی، هیچ ناکرێ.

(ترایان) تەماشای سەعاتەکەی کـرد. تـەنیا دە خولـەك تێپـەڕی بـوو. هێشتا پێنج سەعات مابوو. بزانن ئایـا مـەحکوومن بـە مـردن؟ یـان نـا؟ دەبوایە پێنج سەعاتی تر، بـێ جوولـەو بـێ دەنـگو بـێ ئـەوەی یـەك وشەیان لە دەم دەر بێ، چاوەڕێ بکەن، بۆ ئەوەی بزانن ئـاخۆ دەتـوانن دووبارە سەربکەونەوە بۆ بەر رووناکی رۆژ؟ یان نا؟ بێ قەیدی بوو بەر لە ئێوارە، مەکینەکان بە کار بخەن. دەبوایە پێنج سەعاتی تـر چـاوەڕێ بکەن. چاوەڕێ بکەن تا شەو دادێ.

سەردەستەی هەواڵگریی دووبارە هاواری کرد:

-لۆتکەی تیژڕۆ!!

ئـی تەرشـە، (ترایـان) زراوی چـوو. فەرمانـدە دەسـتی لـە شـانی دا. بۆمباباران دەستی پێکردەوە.

فەرماندە گوتی:

-تەنانەت ئەگەر رۆنیش لە جێیەك دەربچێ، هێشتا هەستی پێ ناکـەن. جارێ زۆر زووە.. ماوەیـەکی دەوێ تـا رۆن دەگاتـە سـەر رووی ئـاو. جارێ هێشتا زووە.

نەفەرەکانی ناو ناقوور زۆر تەنگاو ببوون!! هـەموو چـاویان بڕیبـووە سەرەوە. لەوانەیە هەر بۆمبایەك لەناویان ببا. بۆمباباران نەدەوەستا.

(ماتیزی)، لە پڕ هەستی بە فەرامۆشیی کرد. فەرامۆشییەکی کتو پڕ. وەکوو ئەوەی کاتێ مرۆڤ هەستی پێدەکا کە یاخەی، گەرووی بگوشێ‌و بیکاتەوە. ترسی رەوییەوە. ئەمە ئەو کاتە بوو کە بۆمباباران گەیشـتبووە

ئەوپەڕی خەستی. بۆمبا وەك تگرگ دەباری. لەگەڵ ئەوەیشدا، (ترایان) ترسی نەمابوو. بە هەمووگیانی، مردنی قەبووڵ بوو. تەماشای دەموچاوی فەرماندەو دەمو چاوی نەفەرەکانی کرد. بۆمبابـاران لـە هـەموو کـاتێ خەستتر بوو. لەگەڵ ئەوەیشدا، هەموویان ئارخەیان بوون. مرۆڤ نـاتوانێ ماوەیەکی زۆر لە ژێر فشاری رەبەڵیو دەمارگرژیدا بـژی. لـەو پـەڕی فشارو رەبەڵیدا، خۆی رادەستی قـەزاو قـەدەر دەکـا. مـەرگ قـەبووڵ دەکا. وەکوو ئەوە کەسەی مەحکووم بێ بە مردن، دوای ئەوەی چاوی دەبەسـتن‌و دەیبەنـە بـەردەم دەسـتەی ئیعـدام، قـەبووڵی دەکـا. لـەم چرکەساتەدا، مرۆڤ تێدەگا کە ئیتر هیچ نـاکرێ. ئـەو چرکەسـاتە مـرۆڤ دەبێ مردن قەبووڵ بکا. (ترایان) بڕیاری دا، مردن قـەبووڵ بکـا، خـۆی رادەست کرد.

بەڵام لەو ساتەی بیری مردنی قەبووڵ کرد، دەردێکی تـازەی تـری بـۆ پەیدا بوو. ئەو ئەنجامە ەهات کە قەبووڵی کردبوو. وەکوو یەکێ بوو بە مـردن مـەحکووم کرابـێ‌و ئازایانـە مردنەکـەی قـەبووڵ کردبـێ‌و بـە سەربەرزی‌و چاوبەسراوی، چاوەڕێی رێژنەی گوللـەی دەسـتەی ئیعـدام بێ‌و ئەو مردنەی قەبووڵی کردووە، نەیە...

سەردەستە گوتی:

-لۆتکەکان رۆیشتن.

کەس نەیدەزانی داخۆ دێنەوە؟ یان نا؟ کەس نەیدەزانی ئاخۆ ناقوورەکە دەتوانێ بەسەر ئاو بکەوێتەوە؟ یان نا؟

سەعات هەشتو نیو، کە بە تەواوی تاریك کەوتە عـەردی، فەرمانـدە فەرمانی دا بچنەوە سەر رووی دەریـا. ئەمـە چرکەسـاتی هـەرە بـەرزی فشارو پەشۆکان بوو. ناقوورەکە بەرز بووەوە. ئێستا لـەسەر رووی ئـاو بوو. دەرگایان کردەوە. بەڵام کەس رەحـەت نـەبوو، کـەس شـادومان نەبوو. هەموو وەکـوو یـەکێ وا بـوون حـوکمی مردنـی درابـێ، پێـنج سەعات لـەبەردەم دەستەی ئیعدام وەستا بـێو لــە هــەموو چـرکەیەکدا چـاوەڕێی دەسـتڕێژی کۆتـایی بـێو دوای پێـنج سـەعات چـاوەڕوانی، چاوبەندەکەی بکەنەوەو پێبڵێن تۆ عەفووکراوی. لەو ساتەدا، هەسـت بە هیچ ناکا. دوای پێنج سەعات رادەست بـوونو چـاوەڕوانی، ئـەوەی روو دەدا زۆر کەمـە. تەنانـەت عافواتەکـەیش ، شـتێکی زۆر کەمـە. هەموو شتێ کەمە. هەموو شت!!

جگەرەخۆر هەبوون بۆ یەکەمین جار رازی نەبوون بـۆ جگەرەکێشـان بچنە سەر پشتی ناقوور. (مـاتیزی)، جگەرەکـەی خـۆی تـەنیا تـا نیـوە کێشا، ئینجا فڕێیدایە ناو دەریا. هەستی دەکرد مردووەو دووبارە زیندوو بۆتـەوە. بـەڵام دوای (قـەبووڵکردنی) مـردنو دوای (چـاوەڕوانی)ی دوورو درێــژو ترســناك، زیندووبوونــەوە بایــەخی نــەمابوو، نــەخێر زیندووبوونەوە هیچ بایەخی نەمابوو. ئەو چاوەڕوانییەی کردبووی تاکە شتێكو دوا شتی گرنگ بوو.

کۆنیاکیان دابەش کرد. دوو قاتیان دا.

فەرماندە گوتی:

-دەبێ روو بکەینە (سێباستۆپۆل). دەبێ یان ناقوورەکە چاك بکەینەوە، یان فڕێی بدەین. زیانێکی زۆرە!

بە بێتەل داوای کرد دەسەلآت بدەن بەرەو (کریمی) بڕوا. (سێباستۆپۆل)، یەك رۆژە رێ بوو. (ماتیزی)، لە بارەی سروشتی زیانەکەوە، داوای هیچ زانیاریی نەکرد. هیچ رووداوێك، هیچ سالوخێك لە خەستیدا بارتەقای ئەو چەند ساتە نەبوو کە لە قوولایی پەنجا مەتر، لەناو ناقوورەکە بەند بوونو لە چاوەڕوانی عافوات دەژیان.

فەرماندە گوتی:

-بەختمان هەبوو. ئەوەی بە راستی پێیدەڵێن بەخت!!.

(ماتیزی) پرسی:

-ئەگەر نەمانتوانیایە سەرکەوینەوە، چمان دەکرد؟ تۆ وەکوو فەرماندە چت دەکرد؟

فەرماندە گوتی:

-هیوادارم تۆ هەرگیزاو هەرگیز جارێکی دیکە سواری ناقوور نەبی. دەتوانم پێت بڵێم ئەگەر سەرنەکەوتینایەوە، چ دەبوو. ئێمە بە هەر حاڵ قەبووڵمان نەدەکرد تا تەواوبوونی ئوکسیجینو ئازووقە بژین. مردن لە دیار یەكو دوو، یەك لە دوای یەك، شتێکی زۆر کارەساتە. مێشك ناتوانی بەرگەی بگرێ. من داوام لە نەفەرەکان دەکرد، رازی بن کۆتایی بە ئازارەکانمان بێنین. بەو شێوەی بە ئاسایی دەکرێ. ئەگەر رازی بوونایە، بە گەلە، خۆمان دەکوشت. نوورقارەکەمان نقووم دەکرد. ئەم مردنە لە مردنی بە ئاگری کز، شایستەترە.

رادیۆ رایگەیاند:

-یاریدەری هێزی دەریایی پیرۆزباییمان لێ دەکا کە بە سەلامەتی لە هێرشەکە دەرچووین‌و روخسەتمان پێدەدا بچینە بەندەری (سێباستۆپۆل)

فەرماندە گوتی:

-سەربازانی لەشکری زەمینی دەتوانن تا دواگوللە بجەنگن‌و پشتی دواگوللەیش، دەتوانن بە سونگی، بە مست، بە رنۆك، بە دگان، شەڕ بکەن. کەچی نەفەرەکانی ناقوور دەبێ دەست لەسەر دەست دابنێن‌و لەبەر دەم دوژمن بمرن. بۆیە زۆر سەختە یەکێ ببێ بە دەریاوانی ناقوور. بۆیەشە ئێمە بڕوامان بە خودێ هەیە. پاڵەوانێتی ئێمە بە مانای رادەستبوون‌و کەلەجاڕییە. پاڵەوانێتی ئێمە بە مانای بیرو باوەڕە. زۆر سەختە ببی بە پیاوی ناقوور!

جەنابی (ماتیزی)، کۆنیاکێکی تر نافەرمووی؟

(ترایان)وەڵامی دایەوە:

-نەخێر!!

## (٢٤)

ناقوورەکە چووە (سیڤاستۆپۆل).

شارەکە لەسەر شاخێکی دەمار دەماری ددانەدار دروست کراوە. کلکەی ددانەداری شاخەکە شۆڕ دەبێتەوە بۆ کەنار و دادەکشێ و لە ناو دەریا بزر دەبێ. لە راستیدا، (سیڤاستۆپۆل) شار نییە. قەڵایەکی جەنگیی زەبەللاحە!

دونیا گەرم بوو. ئەڵمانەکان بەندەرەکەیان داگیر کردبوو. لەوانە بوو چاکردنەوەی ناقوورەکە بە دانە رۆژێك (نیو رۆژ) تەواو ببێ. (ترایان) بە پیرۆزیی، پێی نایە سەر زەوی رەق. کاتێ مرۆ لە دەریاوە ، یان بڵێین لە قووڵایی دەریاوە، دێ، زەمینی ئەوەندە بەلاوە ئازیزە، دەڵێی پێ لەسەر خاکی پیرۆز دادەنێ.

(ماتیزی)، بە تەنیایی رووی کردە شار. شار هەمووی خاپوور بوو. هەمان گالیسکەی داری بینی کە لە دەشتی (ئوکرانیا)و دەشتی (نوگای) بینی، هەمان پەنابەری رووسی، رەشەسمەرو جل بۆرو پێڵاو لاستیك، لە دوو خۆیان رادەکێشان.

پەنابەرەکان، کاتێ بەرەو کەناری گەرمی (کریمێ) دەچوون، بەهیوا بوون لە جەنگ دوور بکەونەوە. بەڵام جەنگ تا ئێرە راوی نابوون، داگیرکردنیش راوی نابوون. لێرە بەسەر هەمان خەلاو برسێتی داکەوتبوون. چونکە هیچ خانوو لە (سێباستۆپۆل) نەما بوو: (هەموو کاولێ ببوون). پەنابەرەکان لە دەبۆکان، یان لەناو وێرانەی قەڵاکان دەژیان.

دوای سەعاتێك، (ترایان) گەڕایەوە بەندەر. ئێستا، دەریای لە بەردەم بوو. دەریا لە زەمین پاکترە. مرۆی تۆقاو، لە برسانو لە ناگزوورییان، لەناو کەلاوەکان سەرگەردان بوون.

(ترایان) لە دڵی خۆیدا گوتی: (بەس ئەم جارە بگەمەوە (کۆنستانتزا)، جارێکی تر ناچمە هیچ جێگایەك. جارێکی تر سەفەر ناکەم. سەفەر ناکەم، نە لەسەر زەوی، نە لە دەریا، نە لە ئاسمان، نە لە ژێر دەریا. جارێکی تر سەفەر ناکەم!!)

پارێزی خواردنی سەختی ناو ناقوورو پارێزی لەویش سەختتری کاتی نەخۆشی زەرتکی سەختی، لە پەلو پۆی خستبوو. (ترایان) بیری دەکردەوە کتێبەکەی لە (ئیزفۆر)، لە بارەی ناقوورەوە، بنووسێ. چەند حەفتەیەك، بێ جوولە، لە شانشینی ماڵەکەیان دابنیشێ. وەکوو سەردەمی پێشوو، کە (نیکۆلا) ناوی نابوو (بەهەشتی). زۆر خۆش بوو چیتر نەبزوێ! هەمیشە خەونی بەوەوە دەدی: چیتر نەجوولێ. کە هیچ جوولە نەکا. بەم دواییانە، دووچەندان سەفەری یەکنەوای دەکرد.

کاتێ بیری لــه شانشــینی (ئیزڤــۆر) دەکــردەوە. دەوریــەکی ئــەڵمانی، ڕێگای گرتبوو، هاواری لەسەر کرد:

-بوەستە!

(ترایان) وەستا.

دەورییە ئەڵمانییەکە گوتی:

-نیو سەعات ســەبر بکــە. هــاتو چــۆ قەدەغەیــە. دەبــۆی بەرامبــەر دەتەقێننەوە.

هەندێ دەبــۆ، لای دەستەڕاســت، لــە ســەر تەپەیــەك بــوون. تەپەکــە هەمووی ببوو بە قەڵایەکی جەنگیی زەبەللاح. پــاش چــەند خولــەکێکی تــر، بــە تــۆپی قــورس تۆپبارانیــان دەکــردن، تۆپیــان لەســەر شــاخێك دامەزراندبوو. ئەو ڕووسانەی دەبۆ چۆلکراوەکەیان کردبــووە پــەناگا، لەوێ گوازرابوونەوە. تۆپخانەی ئەڵمانی خۆی ئامادە دەکرد هــەموو بینــا ئاسینەکانی تەپەکە بتەقێنێتەوەو هەموو دەبۆکانی تەخت بکا.

سەرۆکی دەورییەی ئەڵمانی گوتی:

-دوو خولەکی دیکەو ئاگرباران دەست پێدەکا.

سەربازەکان تەماشای سەعاتیان دەکرد. لە ئێســتاوە تــا دە خولــەکی تر، هیچ شتێ لەســەر تەپۆلکەکــە نــامێنێ. نــە دەبۆیــەك، نــە قەڵایــەك. هەمووی تەخت دەبێ!

دینامێتیان لە شاخی سەنگەربەند دانابووەوە. ئەو تفاق و تەقەمەنییانەی تێدابوو کە لە رووسەکان گیرا بوو. دەبوایە تۆپخانە ئەم هەموو تفاقانە بتەقێنێتەوە.

لەو ساتەدا، ئەو دەورییەی کە چەند مەترێك لەلاوە، رێگای گرتبوو، ئالآیەکی سپی بڵند کردو شەکاندییەوە. سوارماتۆڕ، لە جادەدا، کەوتنە جوولە. کەس نەیدەزانی چ قەوماوە. بەڵام دەبێ شتێکی ناخۆش رووی دا بێ. شتێ کە لە بەرنامەدا نەبوو. دەنگی فیکفیکەیەك هات. ئینجا بۆمبارانێکی زۆرچڕ دەستی پێکرد. تەقینەوە، یەك لە دوای یەك، دەهات. کەرتکە شاخ و دیواری سەراپا ئاسنین، تا دەیان مەتر دەفڕینە هەوا. پارچە کۆنکریتی شیشەبەندی زەبەللاح دەفڕینە هەواو بەردەبوونەوە ناو دەریا. دەتگوت بوومەلەرزەیە. دوای چارەکە سەعاتێك، تەقە بڕا. ئێستا، شاخی سەنگەربەند بە دارو پەردوو داپۆشرا بوو. گەوارە تۆزو دووکەڵێکی گەورە، هەورێکی رەش، بەرز دەبووەوە تەشقی ئاسمان. هات و چۆ دەستی پێکردەوە. سێ سوارماتۆڕی ئەڵمانی، لە نزیك (ترایان) راوەستان.

لە دوا خولەکدا، چرکەساتێك بەر لە دەست پێکردنی بۆمباباران، رووسێك لەبەردەم دەبۆیەك دەرکەوت. سوارماتۆڕەکان باسیان کرد کە خەڵکە مەدەنییەکە چل و هەشت سەعات پێشتر ئەوێیان چۆڵ کردووەو چوونەتە سەر تەپەیەکی تر. پشکێنەر داندرابوون. ئیتر کەس نەمابوو. سەرباری هەندێ، یەك خولەك بەر لەوەی شاخەکە بتەقێتەوە،

پیرەمێردێکی رووسی ریشن و جلشڕ لەبەردەم یەکێ لە دەبۆکان دەرکەوت. خۆی لە ناو قەلاکان شاردبووەوە. حەشارگەکەی جێ هێشت، پشتی بە دیواری دەبۆکە داو بە کەماڵی راحەت، جگەرەیەکی داگیرساند. دەوریە ئەلمانەکان دیتیان. بە دووربین تەماشایان کردو بە بڵندگۆ هاواریان بۆ کرد بچێتە لایانەوە، چونکە بەم زووانە شاخەکە دەتەقێتەوە. کابرای رووس گوێی دابووە هاواری ئەلمانەکانو بە بێ هوودە تەماشای ئاماژەکانی دەکردن کە داوایان لێدەکرد تەپەکە جێ بێلێ. بەلام لە جێی خۆی نەجوولایەوە. پشتی بە دیواری چیمەنتۆی شیشەبەند دا بوو، جگەرەی دەکێشا. بە ئارخەیانی جگەرەی دەکێشا.. نەیدەویست تەپەکە جێ بێلێ. دەیەویست لەگەڵ تەپەکە بتەقێتەوە.

تازە کار لەکار ترازا بوو، تۆپباران دوا نەدەخرا. تۆپەکان دەستیان بە شێلکە کرد. بە چرکەیەك، کابرای رووس بە جگەرەوە، لەبەردەم دەبۆکە بزربوو. لەگەڵ کۆنکریتی شیشەبەندو کەرتکە شاخی گەورە، دەیان مەتر فڕییە هەوا. ئەلمانەکان تێنەگەیشتن ئەم رووسە بۆچی نەیویست خۆی نەجات بدا. ئەلمانەکان، ئەوەی لە دەستیان هات کردیان...

سەربازێك گوتی:

-ئەمە دەبێ شێت بێ! دەبێ وەکو هەموو رووسەکان شێت بێ!!

خرپیان شێتن.

(ترایان) بیری کردەوە ئەو پیرەمێردە رووسە کە لەبەردەم دەبۆکە دەرکەوت، بە ئارامی، جگەرە بە لێو، چاوەڕوانی تەقینەوەی دەکردو نەیدەویست خۆی نەجات بدا، دەبێ ئەمە یەکێ بووبێ لە پەنابەرەکان. تەنیا پەنابەر لە دەبۆکانی سەر تەپەکە دەژیان. بێ گومان ئەمە هەزاران کیلۆمەتری تەی کردووە. عارەبانەی داری لە دوای خۆی راکێشاوەو لە دوای پەناگایەك گەڕاوە. لە کرتۆپە گەڕاوە. سەدەها جار پەناگای گۆڕیوە تا گەیشتۆتە ئێرە، گەیشتۆتە کەناری دەریا، گەیشتۆتە ئەم دەبۆیە. کاتێ فەرمانیان پێکردووە، تەنانەت ئەم دەبۆیەش جێ بێلێ، تاقەتی شتی وای نەماوە. ئیتر نەیویستووە بڕوا. وای بە باش زانیوە، بۆ خۆی بمرێ، لەگەڵ شاخەکەو تەپەکە بتەقێتەوە، نەك جارێکی تر بکەوێتەوە رێ. ئەگەر بچووبایە جێگایەکی دیکە، لەوێش دەریان دەکرد. لە هەموو جێیەك دەریان دەکرد. شەکەت بوو. نەیدەویست چیتکە جێگای خۆی بگۆڕێ. وای پێ باش بوو، لەگەڵ شاخو دەبۆکە، لەگەڵ تەپەکە، هەپڕوون بە هەپڕوون ببێ.

* * *

(ماتیزی) گەڕایەوە بەندەر. بە تەواوی لە هەڵوێستی کابرای رووس گەیشتبوو کە نەیدەویست، کە نەیدەتوانی، چیدی سەفەر بکا. لەو کابرا رووسە گەیشتبوو کە کردییە لاملیی ئیتر نەڕوا، ئیتر هیچ سەفەر نەکا، کە پێی باش بوو بتەقێتەوە، نەك دیسان بکەوێتەوە رێو راوی بنێن...

(ماتیزی) لە دڵی خۆیدا گوتی: (منیش، هەندێ جار، بە من بێ، بمرم، نەك فەرمانم پێ بکەن بڕۆم!! مردن لە فەرمانی ڕۆیشتن خۆشترە. مرۆ، هەندێ جار، ئەوەندە شەکەت دەبێ، حەز دەکا بمرێ، نەك لە جێی خۆی هەڵبقەنێ.)

سەردەستەیەك لەسەر پشتی ناقوور هاواری کرد:

--جەنابی (ماتیزی)، فەرمانی ڕۆیشتن دراوە. (دوفین) چاك کراوەتەوە.

سەردەستە، بە دەست ئاماژەی بۆ لای (ماتیزی) کرد.

فەرمانمان پێ کراوە سوار بین. سەعاتێکی تر بە ڕێ دەکەوین.

(ماتیزی) چووە سەرپشتی ناقوور. لە دڵی خۆیدا گوتی: (ئەمە دوا سەفەری منە. دوا سەفەری من!!)

## (٢٥

ئەو کتێبەی (ترایان) باسی ژیانی ناقوورەکەی تێداکردبوو، زستان، دەرچوو. کتێبەکە ٣٠٠ لاپەڕە بوو، بەرگی شین وەکو دەریا وابوو. یەکەو دانەی کتێبەکەی پێشکێش هەر یەکە لە تاقمەکەی ناقوورەکە کرد.

ئێستا، لە (کۆنستانتزا)، لە نووزگەی دەریاسالاری سەرۆکی هێزی دەریایی جەنگیی، بوو. دانەیەکی کتێبەکەی بۆ دەریاسالار هێنابوو و پێشکێشی بۆ لەسەر نووسیبوو. دەریاوانان، هەوەسیان بە کتێبەکەی دەهات، کە بڕیار بوو بە زمانی هونگاریو بە ئەلمانیش بڵاو بکرێتەوە. (ماتیزی) شادو گوشاد بوو بە سەرکەوتنە ئەدەبییەکانی. تا ئێستا چوار کتێبی جەنگیی بڵاوکردبووەوە..

لە دڵی خۆیدای گوتی: (ئێستا رۆمانێك دەنووسم، باسی جەنگی تێدا ناکەم. رۆمانەکەم پێشکێش هێزی دەریایی رۆمانی دەکەم کە دەرفەتی نووسینی کتێبەکەی بۆ رەخساندم.)

دەریاسالار گوتی:

– لــە بــارەی دەرفەتــەوە. مــن، نامەیــەکم لــە (گــی. ئــۆ. گــی– سەرۆکایەتی باڵای جەنگی)، بەشی ڕاگەیاندن، وەرگرتووە. (دەریاسالار لە سەرۆکایەتی باڵا تووڕە بــوو، دەنگــی کــەرخ بــوو.) فــەرمانت پــێ دەکــەن یەکســـەر خــۆت بــە (بوخاریســـت) بناســێنیو لــەوێوە بچــیتە (ئۆدیسە). لەوێ، ڕۆژنامەیەك بۆ سەربازانی بەرەکانی شــەڕ دەربکــەی. من یەکسەر وەڵامم دایەوە کە بوونی تۆ لێــرە شــتێکی پێویســتەو تکــام لێکردن یەکێکی تر ڕەوانە بکەن ڕۆژنامە جەنگییەکە، لەبــەرەی شــەڕ، دەربکا. پێم وایە ئەمە بۆ خۆت باشە؟ کە زالیمان دەیانەوێ تۆ لە هێزی دەریایی بسێنن، زۆر پێ تووڕە بووین. تۆ لێرە دەمێنیتەوە.

دەریاسالار زەنگی لێدا تا بەریدی بۆ بێنن. (ماتیزی) کە دوو نامەکەی دەخوێندەوە، دڵی بە تونــدی لێیــدەدا.: نامــەی ســەرۆکایەتیو وەڵامــی دەریاسالار.

دەریاسالار گوتی:

–دڵنیام سەرۆکایەتی باڵا داواکەم قەبووڵ دەکا. تەنیا تۆ لە گیانو لــە ژیانی دەریاوانان گەیشتووی! تۆ دەبێ لێرە بمێنیتەوە، لەگەڵ خۆمان!!

(ماتبزی) گوتی:

– ئەدی ئەگەر سەرۆکایەتی باڵا ڕەتی کردەوە؟

ترسا دیسان ناچار بکرێ بچێتەوە ڕووسیا.

(ماتیزی) گوتی:

-دەریاسالار، تکا دەکەم لوتفێکم لەگەڵ بکە. دە رۆژ مادۆنم پێ بدە. دەمەوێ بچمە (بوخاریست)و چی پێویست بێ بیکەم. بۆ ئەوەی جارێکی دی رەوانەی رووسیا نەکرێم.

دەریاسالار رەزامەندی لەسەر مادۆنەکەی دا.

هەمان شەو، (ماتیزی) دیسان لە شەقامی (گریگۆرسکۆی نیگارکێش)، لە (بەشی ناوخۆ)ی قوتابییان بوو. تازە گەیشتبوو، بەرێوەبەر پەیامێکی نایە دەست.

بەشی دەریاوانیی (کۆنستانتزا) تکاتان لێدەکا، هێمانی گەیشتنە (بوخاریست)، تەلەفۆن بۆ نووزگەی دەریاسالار بکەن.

(ماتیزی) بیری کردەوە رووداوێکی ترسناك قەوماوە. بە هەڵەیشدا نەچووبوو. یاریدەری سەربازگەی دەریاسالار بە تەلەفۆن خەبەری دایە کە سەرۆکایەتی باڵا داوای دەریاسالاری رەت کردۆتەوەو داوای کردووە (ترایان) دەمو دەست بگاتە (بوخاریست) بۆ ئەوەی سەر لە نوێ بچێتە (ئۆدێسا).

یاریدەر گوتی:

-دەریاسالار داوایەکی تری پێشکێش کردووە. دەریاسالار، خۆی، تا سێ رۆژی تر دێتە سەرکردایەتی باڵا بۆ ئەوەی رەزامەندیی مانەوەی تۆ لە هێزی دەریایی، وەربگرێ. داوای لێکردووم هەموو ئەمەت پێ رابگەیەنم بۆ ئەوەی تۆیش، لە لای خۆتەوە، بتوانی ئەوەی پێویستە

بیکەی. لەو ماوەیەدا بە خـەیاڵی راحـەت لـە (بوخاریسـت) بمێنـەوەو مادۆنی دە رۆژیت بەسەر ببە.

(ماتیزی) دەسکی تەلەفۆنی دانایەوە. ددانی بە جـیڕەوە بـرد، وەکـوو کابرای رووسی (سێباستۆپۆل)، ئەو رۆژەی فەرمانی پێدرا داڵدەکەی لـە دەبۆکە جێ بێلێ، درانی بە جێڕەوە برد.

سبەینەی رۆژی پاشی، (ماتیزی)، بە بەرگی مەدەنی، دەرچوو بۆ شار. ئامادە بوو بۆ شەڕ .

لە دڵی خۆیدا گوتی: (لە ماوەی ئەم جەنگەدا، زۆر شت فێـر بـووم. تێگەیشتم بۆی هەیە شەڕ بە شێوەی تەن بە تەن، یان بە فێـڵو تەڵەکـەو ئاین و ئۆین، بە سەرکەوتن بگا. من ناتوانم شەڕی تـەن بـە تـەن لەگـەڵ سەرۆکایەتی باڵا بکەم. من پیاوێکی تەنیام. هەوڵ دەدەم زیرەکیی بەکار بێنم. بە هیچ نرخێ نامەوێ بگەڕێمەوە رووسیا، بە هیچ نرخێ!!

ئەو بەیانییە، (ترایان) توانی بە خزمەت چەند وەزیرو چەند ژەنـەراڵێك بگا. بەیانیش بە خزمەت چەند کەسێکی تر دەگا. ئەمـە هـیچ زەحمـەتی تێدا نییە بۆ وی . ئێستا، بۆتە نووسەرێکی بەنێوبانگ. هـەموو پێشـوازی دەکەن و هەرێی پێ دەدەن!

رۆژی سێیەم، بە خزمەت کەسانی تازە گەیشت. لـە مـاوەی چـوار رۆژدا، هەموو واسیتەکانی بەکار هێنا.

شەوێکیان، کە بە شلۆ شەکەتی گەڕایەوە (بەشی ناوخۆ)، بەڕێوەبەر بانگی کرد بچێتە نووزگەکەی. (ترایان)، نامەیەکی راسپاردەی بۆ هاتبوو.

*(بە شانازی دەزانم پێت رابگەیەنم کە تۆ بە بەسکرتێری رۆشنبیری سەفارەتی رۆمانی لە (زاگریب) دامەزراوی. داوات لێکراوە سەر لە بە بەڕێوەبەرێتی خزمەتگوزاری وەزارەتی کاروباری دەرەوە بدەی.)*

(ترایان) جارێکی تر نامەکەی بە دەنگی بەرز خوێندەوە. نەیتوانی لە هێزی دەریایی بمێنێتەوە. بەڵام توانی جارێکی تر نەگەڕێتەوە رووسیا. ئەمە سەرکەوتنێك بوو، پێ شادو گوشاد بوو. چوار ساڵ بوو سەرباز بوو، ئێستا، دووبارە دەبێتەوە مەدەنی!

بەڕێوەبەر پرسی:

-کەینێ دەڕۆی؟

وورووژا بوو. بەڕێوەبەر هەموو ئازارەکانو هەموو سەرکەوتنەکانی (ماتیزی) دیبوو.

پرسی:

-چۆن سەرکەوتی، بڕۆی؟

(ترایان) گوتی:

-ئەو هەموو رێگایەم بەکار هێنا کە مرۆ بۆ سەرکەوتن بە کاری دێنێ. بە داخەوەم کە (هەموو)م بە کارهێنا. بەڵان ناچار بووم . من نامەوێ جارێکی دیکە بچمەوە رووسیا. بەیانی، خۆم بۆ سەفەر ئامادە دەکەم.

بەر لەوەی بچمە سەر کارەکەم، سەرێك لە (ئیزفۆر) دەدەم. ئەوە چوار ساڵە دەمەوێ، ئەگەر بۆ حەفتەیەکیش بێ، بچمەوە (ئیزفۆر). بەلاّم تا ئێستا سەرکەوتوو نەبوویم. هەر جارەی دەمەوێ بچمەوە، ئاستەنگێکم دێتە پێش: یان لە لەشکر، یان لە تاقی کردنەوەی کۆلێج، یان لە رۆژنامە، یان لە جەنگ. هەموو جارێ شتێك دەبێ. چوار ساڵە چاوەرێی ئەو مادۆنە دەکەم، ئاخیری هەر وەری دەگرم.

رۆژی پاشی، (ماتیزی) خۆی بە وەزارەت ناساند. پەساپۆرتێکی دپلۆماسیو چەند نامەیەکی متمانەو چەند بلیتی رێگای ئاسنو تکیتی فارگۆنی خەوتنی قەتاری وەرگرت. بۆیان دانا دووزبەی بڕوا.

(ترایان) گوتی:

-حەز دەکەم درەنگتر بڕۆم. هەندێ کارم لە رۆمانیا ماوە دەبێ جێ بە جێیان بکەم. دەمەوێ یەکەم جار خانەوادەکەم ببینم کە چوار ساڵە نەمدیون. زۆر حەز دەکەم بەر لە سەفەرەکەم بیانبینم.

وەزیر گوتی:

-شتی وا ئەستەمە! کە گەیشتیتە ئەوێ، دەتوانی داوای مۆڵەت بکەی. لە ئێستاوە، بەڵێنت پێ دەدەم، مۆڵەتت بدەمێ. بەلاّم دەبێ یەکەم جا بچیتە سەر کارەکەت. سەفیر بە تەنێ لە سەفارەتە. دەبێ بێ بینەو بەرە، لە ماوەی سێ رۆژ بچی...

(ترایان) نەختێ بیری کردەوە. دوو مانگ (هەتاهەتایە) نییە. دەچێتە سەر کارەکەیو دوو مانگی تر دێتەوە. ئەوسا، ماوەی مۆڵەتەکەی

هەموو لە (ئیزفۆر) بەسەر دەبا: (تەنانەت لە (بوخاریست)یش ناوەستم. یەکەو راست دەچمەوە ماڵیّ).

(ترایان)، وەکوو لە سەربازیی وەڵام دەدەنەوە، گوتی:

-ئەمر دەکەن! دەچمە سەرکارەکەمو دوو مانگی تر، ئێوە مادۆنم پیّ دەدەن!.

دوای سیّ رۆژ، (ترایان ماتیزی) جارێکی دیکە سەفەری کرد. ئەم جارە، بەرەو رۆژ ئاوا چوو. تا ئەو کاتە تەنیا بەرەو رۆژهەڵات سەفەری دەکرد. بازی سەفەری گۆڕابوو. بەڵام دیسان هەر سەفەر بوو.

لە دڵی خۆیدا گوتی: (هیوادارم کاتیّ گەیشتمە (زاگریب)، ئیتر نەجوولێم. وا بزانم چەند ساڵ لەویّ دەمێنمەوە. ئێستا ئیتر لە سوپادا نیم سەرۆکەکان بە کەیفی خۆیان تۆپ تۆپانەم پیّ بکەن.) کە بیری کردەوە ئیتر سەفەر ناکا و لە جێگای خۆی دەمێنێتەوە، گرژییەوە.

لەو کاتەدا، قەتار لە سنووری رۆژئاوای رۆمانیا پەڕییەوە. هەموو روناکییەکان داپۆشرابوون. هەر هەمووی!!

# (٢٦)

ژیانی سکرتێری سەفارەت بە تـەواوی لـە ژیـانی پێشـووی (ترایـان) جودا بوو. لە ژیانی قوتابیێتی، لە ژیانی پەیامنێریی، لە ژیـانی نووسـەری بابەتی رۆژانە، لە ژیانی شاعیریی‌و لە ژیانی عەسکەری جیا بوو.

پێش هەموو شتێ، جل‌و بەرگ جیا بوو. (ترایـان) دەیەویسـت هـەموو ئەرکەکانی بە ویژدانەوە جێ بە جێ بکا. کراسە رەنگاورەنگەکانی، کـە لە سەردەمی پەیامنێریی،حەزی لێدەکردن، لە بنی جانتاکە نا. کەرەوێتی تاری‌و جلی وەرزین‌و گۆرەوی لە ناو جانتا نا. داخی دەخوارد کە ئـیتر ناتوانێ لەبەریان بکا. لێرە جلی شینی دەریـایی خیـت خیتـی سـەنگینی لەبەرو شەپقەیەکی رەشی لەسەرو جووتە پێلاوێکـی رەشـی لـە پـێ‌و کەرەوێتێکی تاری لە مل دەکرد.

نزیکەی سالێك بوو لە (زاگریب) بوو. خەریك بوو، وردە وردە لـە جلە نوێکان رادەهات. بەلام لە کاتی دەوامی سەفارەت رانەدەهات.

رێك سەعات شەشی بەیانی، (ماتیزی) بە سەر پێوە قاوەی خـواردەوەو لە رادیۆدا گوێی دایە دەنگ‌و باس. ئینجا چـووە سـەر جـادە. ترومبێـل

لەبەر دەرگا بوو. (ماتیزی) لە پشت سوکان دانیشت. ئۆمۆبیلەکە بە دڵی خۆی نەبوو. ئەو هەمیشە حەزی لە (تۆپۆلینۆ)یەك، یان (فیات)ێکی بچووك دەکرد، بەڵام سەفیر رازی نەبوو، دەیگوت:

-سەیرە مرۆ نیشانەی (د.س-دەستەی سیاسیی) لە سەر ترۆمبێلێك دابنێ لە قالکە شخارتەیەك گەورەتر نەبێ!. بە راستی سەیرە!!

(ماتیزی) بۆی داهێنا. ئێستا ترومبێلێکی گەورەی لە بنە. وەکوو ئەوەی سەفیر دەستووری دابوو بیکڕێ.

سەعات شەش و نیو، سەرکەوت بۆ سەفارەت. بینای سەفارەت لە ناوەندی شار قیت ببووەوە. (ترایان)، لێرەیش، وەکوو (بەشی ناوخۆ)ی قوتابیانی جادەی (گریگۆرێسکۆی نیگارکێش)، کلیلێکی تایبەتی خۆی هەبوو. لەگەڵ کارگێڕانی سەفارەت نەدەچووە سەر کار. سەفیرو کارگێڕانی سەفارەت پاش چەند سەعات ئینجا دەهاتن. هەر لە سەرەتاوە، (ماتیزی) داوای کلیلێکی کرد تا بتوانێ سەعات شەش و نیوی بەیانی، بچێتە سەفارەت. رادیۆی نوزگەی پێکرد، پاشان تەماشای سەعاتی کرد. پاڵتۆکەی بە جلاوێزەوە هەڵواسی. یەکێ لە زەنگی دەرگای دا. (ماتیزی) دەرگای کردەوە. خۆی کردییەوە. چونکە پێشخزمەت تا سەعات نۆ نەدەهات.

خاتوو (بۆریسلاڤا)ی سکرتێری (ترایان)، بە پەلە خۆی بە ژووورێدا کردو چووە لای رادیۆ. بێ ئەوەی ساقۆی لەبەر بکاتەوە، دانیشت. پەیامی نهێنی مارشال (تیتۆ) بوو. دوای دە خولەك، (بۆریسلاڤا) ئەو

دەنگ‌و باسەی بە فڕەنسی خوێندەوە کە گـوێی لێ گرتبـوو. (مـاتیزی)، بە ڕۆمانی، بە ئامێری چاپ، نووسییەوە. ئەمە یەکەمین ئەرکی ئەو ڕۆژە بوو.

(بۆریسلاڤا) قوتابی بوو لـە (زاگریب). دەیەویست ببـێ بـە مامۆسـتای فڕەنسی. بۆ ئێستا، گـوێی لـە بەرنامـەکانی زمـانی کرواتـی دەگـرت‌و ڕۆژنامەی دەخوێندەوە. ئینجا بۆ (ترایـان)ی وەردەگێڕایـە سـەر زمـانی فڕەنسی. ئەویش ڕاستەوخۆ، بە ڕۆمانی دایدەڕشت‌و بـە ئـامێری چـاپ دەینووسییەوە. کاری (ماتیزی) ئەوە بوو، هەموو ڕۆژنامە کرواتییـەکان، هەموو بڵاوکراوە ڕەسمییەکانی دکتۆر (ئانتی پاڤلیچ)، هەموو بڵاوکـراوە نهێنییەکانی(تیتۆ)، هـەموو ڕۆژنامـەکانی (دراگـا میکـایلۆڤیچ)، هـەموو ڕۆژنامـەکانی سـرب‌و کرواتـە ئاوارەکـان، بخوێنێتـەوەو گـوێ لـە بەرنامەکانیان بگرێ. هەموو ڕۆژێ، خۆی، دوو دانە بڵاوکـراوەی لـەو ڕۆژنامەو لەو بەرنامانەو لەو بڵاوکراوانەو لەو ڕاگەیاندن‌و بانگەشـانە، بە ئامێری چاپ تایپ دەکرد. یەکێ لـەم دوو دانەیـە بـۆ حوکوومـەت بوو، ئەوەی تر بۆ سـەفیر بـوو. هـەموو حەفتەیـەك ڕاپـۆرتێکی گشـتی دەنووسی. بەردەوام، ئێوارە لـە سەفارەتێك، یان لـە کونسولخانەیەك، یان لـە مـاڵی یـەکێ لـە لێپرسـراوانی کرواتـی داوەت بـوو. شـەو، کـە دەگەڕایەوە ماڵێ، شیعری دەنووسی.

کتێبەکـەی کـە بـە نـاوی (یەکـەمین ڕۆمـان) بـوو، لـە چاپخانـەی کتێبخانەکانی (بوخاریست) دەرکەوت. ئەمە ڕۆمانێکی ٥٠٠ لاپـەڕەیی

بوو. تەواو لیریکی بوو. کتێبێکی تریشی لە بارەی هێزی دەریایی، بە ناوی (خاچێکی دارین لەسەر دەریای رەش) لە ژێر چاپ بوو. لەو کاتەدا، کاری لەسەر کۆمەڵە چیرۆکێك دەکرد بە ناوی (ئەسپدزان). (ماتیزی) زۆری دەنووسی. زۆر بە پەلە دەینووسی. دەتگوت دەترسێ قەڵەمدانەکەی لە چنگ راپسکێنن.

(بۆریسلاڤا) رۆیشت. (ماتیزی) لەبەردەم ئامێری چاپی مایەوە. لە تایپ کردنی دەنگ‌و باسی ئەڵمانی بەردەوام بوو کە (هێدویگا) بە فرەنسی بۆی دەگوت.

سەعات یازدەو نیو، (هێدویگا)یش بڵاوکراوەی تایپکراوی بە دەست، بە دەوری خۆیەوە رۆیشت. (ماتیزی)، بڵاوکراوەی تایپکراوی دەنگ‌و باسی بە دەستەوە بوو، (ماتیزی) چووە نووزگەی کیباری سەفیر. سەفیر هەموو جارێ خولقی دەکرد قاوەیەکی لەگەڵ بخواتەوە. ئەوسا دەنگ‌وباسەکانیان هەڵدەسەنگاند.

(ماتیزی)، کە گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی، دەستی بە نووسینی نامەیەك کرد بۆ باوکی. ئەو نامانەی بۆ (ئیزڤۆر)ی رەوانە دەکردن هەرگیز بە ئامێری چاپی نەدەنووسین. بە دەست دەینووسین. تەنیا دەنگ‌وباسی خۆشی هەبوو پێیان بڵێ. باسی ژیانی خۆی کرد لێرە، باسی سەرکەوتنە ئەدەبییەکانی، باسی هەموو رووداوە وردەکانی ژیانی خۆی کرد. لە کاتی نووسیندا، دەستی بە پێکەنین کرد. کەس‌و کاری خۆی لە سەرکەوتنە گەورەکانی، بەشدار دەکا.

(نووزگەکەم لە سەفارەت ناو عەردی خراپ ببوو. قالیێەکی کۆنی کالبووەوەم هەبوو. هەموو کورسییەکان خراپ ببوون. داوام لە سەفیر کرد چەردەیەك پارەم بۆ تەرخان بکا تا فەرشێکی نوێ بکرم، ناوعەردی ژوورەکەمو کورسییەکان چاك بکەمەوەو دیوارەکان بۆیە بکەمەوە. سەفیر رەتی کردەوە. گوتی: (ئێستا، کاتی جوانکاری نییە، ولاتەکەمان لە حالەتی جەنگدایە. سەبر بگرە تا ئاشتی دێ.) بۆ (بوخاریست)م نووسی، وەزیریش پارەی بۆ تەرخان نەکردم، بەلام، رەنگە بە هەلە بێ، داواکەم کەوتە بەر چاوی مارشال (ئانتۆنێسکۆ). کە نووسینەکەی خوێندەوە، قاقا پێکەنیو لە گۆشەیەکی داواکەم نووسی: (ئەم کورە هەرچی داوا دەکا، بیدەنێ!) لە ناو کەوانەیش (نەك تەنیا ئەوەی پێویستی پێ هەیە.) وەکوو دەبینن، سەرکەوتنیکی گەورەم بۆ بووە. بەلگەیش ئەوەیە: قالییەکی لە هی وەزیر جوانترو کورسی نوێم لە نووزگەکەم هەیە. هیوادارم تا چەند مانگی تر مادۆن وەربگرمو سەرێکتان لێ بدەم. تا ئێستا کەهال بوو، نەچمە سەر کار. کەس نەبوو جێگام بگرێتەوە. زۆرمان ئیش هەیە.)

(ماتیزی) نامەکەی بە رێگای بەریدی دبلۆماسی رەوانە کرد کە هەمان شەو بە رێ کەوت.

* * *

چەند حەفتەیەك رابردو ئینجا چەند حەفتەیەکی تر. هەر پۆستەیەك دەچوو، (ماتیزی) نامەیەکی بۆ (ئیزڤۆر) دەنووسی. بەلام هەرگیز وەلامی

بۆ نەدەهاتەوە. رۆژێ، یەکێ لە نامەکانی گەڕایەوە (زاگریب) بەریدی رۆمانی لەسەر زەرفەکەی نووسیبوو: (ئەوەی نامەکەی بۆ رەوانە کراوە لە (ئیزڤۆر) گۆزراوەتەوە. ناونیشانی نوێی دیار نییە.)

(ترایان)، نامە بە دەست، چووە نووزگەی سەفیر.

لە سەفیری پرسی:

-بۆچی باوکم لە (ئیزڤۆر) گوازراوەتەوە؟ هیچ سەرم لێ دەرناچێ.

سەفیر نەخشەیەکی رۆمانیای پان کردەوە. داوای لە (ماتیزی) کرد پێی نیشان بدا (ئیزڤۆر) کەوتۆتە کوێ.

سەفیر گوتی:

- رووسەکان ئێستا لە باکووری (مۆلداڤیا)ن. نابینی هێڵی بەرەی شەڕ رێك بە (ئیزڤۆر)دا دەڕوا؟ لە دەوروبەری (ئیزڤۆر) شەڕە!. تەنانەت لە ناو (ئیزڤۆر). خۆیشی دەجەنگن. ئاساییە خەڵکی مەدەنی گوازرابنەوە.

(ماتیزی)، باوك و دایکی و خوشکەکانی و (نیکۆلا)ی برای هێنایە بەرچاوی، بە بارو بنەوە، بە بەتانییەوە، بە دۆشەکەوە، بە فراخەوە، لە ناو عارەبانە، وێڵان و بیبانین. هێنانییە بەر چاوی، وەکوو رووسەکان چۆن لە رێگای خۆڵی دەشتی (ئۆکرانیا) گەوشەك و سەرگەردان بوون، ئەوانیش ئاوها، ئاوارەی رێ و بانان بوونەو بە دوای پەناگایەکدا دەگەڕێن، تێدا سڕ بن، بە دوای شتێکدا دەگەڕین، بیخۆن.

(ماتیزی)گوتی:

-دەبێ هەر ئێستا ناونیشانیان بدۆزمەوە. جەناب، تکات لێ دەکەم یارمەتیم بدە. نابێ لێبگەڕێم لە سەر ڕێگایان بکەون. دەبێ پەناگایەکیان بۆ پەیدا بکەم.

سەفیر برووسکەیەکی بۆ (بوخاریست) نارد. بە (ترایان)ی گوت بە ماوەی چەند ڕۆژێك پێدەکەون قەشە (ماتیزی)، لە کوێیە؟ کە بە ماڵو عەیاڵەوە، بە کەلو پەلی کەمییەوە، لە ماڵی خۆیو لە گوندی خۆی ڕاگوێزراوەو بێ سەر لە ڕێو بانان دەسووڕێتەوە؟

(ماتیزی) تەماشای بەریدی سەر مێزەکەی کرد: داوەتێك لە سەفارەتی فنلاندییەوە، پێشنیاری وەرگێڕانی کتێبەکەی لە بارەی ناقوورەوە بۆ زمانی چیکی. داوەتێك بۆ نواندنێکی شانۆیی. نامەکانی وێوە پاڵ دا. بێ ئەوەی ترومبێلە گەورەکەی ببا، بە تەنێ چووە ناو شار. نیگەران بوو. زۆر نیگەران بوو!! تا بڵێی نیگەران بوو!! پەشیمان بوو بۆچی لەبارەی ڕووداوەکانی ڕۆمانیا وردتر نەبوو. دەبوایە بزانێ هێلی بەرەی شەڕ بە (ئیزڤۆر)دا دەڕوا. تەنیا کەیفی بە کردەوەکانی (تیتۆ)و چالاکییەکانی (ئوستاشی)و (سێتنیسی)یەکان دەهات. (ئیزڤۆر)ی لە بیر کردبوو. لەمەی نەدەبوری. گەڕایەوە سەفارەت و ویستی تەلەفۆن بۆ ڕۆمانیا بکا. هەموو هێلەکانی تەلەفۆن بە بۆمباباران بڕابوون.

(ترایان)، بە بێ ئۆقرەیی چاوەڕێی نامەیەکی دەکرد بزانێ کەس‌و کاری لە کوێن. ڕۆژێك چاوەڕێی کرد. دوو ڕۆژ چاوەڕێی کرد، سێ ڕۆژ چاوەڕێی کرد. ئاخیری تاقەتی چاوەڕوانی نەما.

گوتی:

-دەبێ خۆم بچمە ڕۆمانیاو لێیان بگەڕێم . جەنابی سەفیر، تکایە لوتف بفەرموون مۆڵەتێکم بدەنێ!

تەنیا وەزیری کاروباری دەرەوە، لە (بوخاریست)، مۆڵەت دەدا.

سەفیر گوتی:

-هەر ئێستا، بۆ ئەم مەبەستە، تەلەفۆن بۆ (بوخاریست) دەکەم. دوو ڕۆژی تر سەبر بگرە! ئەوسا دەڕۆی!

(ماتیزی) دەستی بە ئامادەکاریی کرد بۆ سەفەر. بە ترومبێل دەچێ. چەند پاکەتێکی پڕ شتی پێویست بۆ پەنابەرانی، لە ناو ترومبێل نا. دەیزانی ئەو کەسانەی لە ماڵی خۆیان دەرکراون‌و فڕێ دراونەتە سەر ڕێگا، پێویستییان بە چ شتێکە: بەروانکەی خوری‌و بەتانی‌و دەرمان‌و قاوەو کاکاوو پێڵاوی کڕی. دەیەویست بە ترومبێلەکەی هەموو جێگایەکیان بە دوادا بگەڕێ. ئەگەر پێویست بکا، لەم سەری وڵاتەوە تا ئەو سەری تەی دەکا. دەبێ هەر بیاندۆزێتەوە.

ڕێك دوای دوو ڕۆژ، مادۆنەکەی وەرگرت.

سەفیر گوتی:

–به من ده‌که‌ی، به ئۆتۆمۆبیل ناچی! پارتیزانه‌کانی(تیتۆ) هه‌موو خاکی (کرواتیا)یان، له (زاگریب)ه‌وه تا سنوور، داگیرکردووه. ئه‌گه‌ر به ترومبێل بچی، ده‌تگرن. وا چاکه به قه‌تار بچی، قه‌تار پاسه‌وانی هه‌یه.

–ئه‌گه‌ر ترومبێل نه‌به‌م، هه‌رگیز خانه‌واده‌که‌مم بۆ نادۆزرێته‌وه. خۆت ده‌زانی، قه‌تار ئێستا له (رۆمانیا) هات‌و چۆی رێك نییه. به بێ ترومبێل ناتوانم به دوایانه‌وه، لێره بچمه ئه‌وێ.

سه‌ڤیر شانی هه‌ڵته‌کاندو گوتی:

–راسته، به‌ڵام شێتاتییه به ترومبێل به قه‌ڵه‌مره‌وی (تیتۆ)دا بڕۆی. هه‌رگیز ناگه‌یته (بوخاریست).

(ترایان) گوتی:

– پشت به خوا ده‌به‌ستم. هیچی ترم له ده‌ست نایه.

(ماتیزی) خوا حافیزی له سه‌ڤیر کرد. به ته‌ما بوو سه‌عات سێی به‌یانی به رێ بکه‌وێ، بۆ ئه‌وه‌ی، به رۆژ، به ناوچه‌ی ترسناکدا تێپه‌ڕێ. هه‌موو که‌ل‌و په‌له‌کانی له‌ناو ترومبێل نا. تانکی به‌نزینی پڕ کرد. ترومبێلی له‌به‌ر ده‌رگا راگرت‌و چووه‌وه ژوورێ. ده‌یزانی تا سه‌عات سێ خه‌وی لێنه‌که‌وتووه و ده‌شیه‌وێ یه‌کسه‌ر به رێ بکه‌وێ‌و بڕوا. به‌ڵام سه‌فه‌ری نیوه‌شه‌و تا بڵێی ده‌ره‌ك‌و خه‌باره. هه‌موو شه‌وێ، رێگای سنوور له‌به‌ر ده‌ستی پارتیزانه‌کانه. (ماتیزی) خڕ چراکانی پێکرد. بیری کردوه‌وه که بگاته ئه‌وێ، ماڵه‌وه‌یان چه‌ند شادومان ده‌بن. مسۆگه‌ر

باوکی نامەی بۆ نووسیوە. بەڵام دەبێ خزمەتگوزاری بەریدیش وەکوو رێگای ئاسن، تێکچووبێ، بێ شك نامەکانی بابی بزربووین.

رووسەکان بەشێکی گەورەی (رۆمانیا)یان داگیرکردبوو. ئێستا، (ئیزڤۆر) وەکوو سەراپای (بێسارابی)، لە ژێر دەسەڵاتی رووسەکاندا بوو. ئەو خەڵکانەی دەگاکانی خۆیان چۆل نەکردووە، لە ژێر ترس‌و تۆقاندا دەژین!. شەو کە دەخەون کیسەنانێکی شەویی لە بن سەریان دادەنێن‌و دەخەون. هەموو شەوێ، چاوەڕێ دەکەن سورگوم بکرێن. (ماتیزی) هێنایە بەر چاوی ئێستا، لەو ساتەدا، سەربازی رووس لە (ئیزڤۆر)، لە خانووی ئەواندان.

(ماتیزی) دەستەکانی بە سەرییەوە گرت‌و رایگوشی. تەلەفۆن لێیدا. (ماتیزی) نەیوەست هەڵیبگرێ. ئەمە دەبێ داوەتێك بێ بۆ نمایشێکی شانۆیی، یان بۆ خواردنێك، یان بۆ میواندارییەك. بەڵام ئەو بیری لە جەنگ دەکردەوە.

لەشکری رووسی بەرەڵلاترین لەشکرە کە (ترایان) تا ئێستا دیویەتی. رووسەکان ئەگەر خۆراك‌و تەقەمەنی ئەمریکیی‌و رۆژئاواییان بۆ نەهاتایە، هەرگیز نەیادەتوانی بگەنە (ئیزڤۆر). ئەگەر لەشکری رووسی تەنیا شتی خۆیان بەکار بهێنایە، فنلاندییەکان، بە لەشکری بچووکی فنلاندی، دەیان شکاندن. رووسەکان تەنیا بە یارمەتی رۆژاواییەکان، بە یارمەتی ئەمریکییەکان، توانیان بچنە پێش.

تەلەفۆن هەر لێیدەدا. (ماتیزی)، بە تووڕەیی، دەسکەکەی هەڵگرت. گوێی لە دەنگی سەفیرەکەی، سەفیر ( میتیلنیو) بوو.

سەفیر گوتی:

-(رۆمانیا) رادەست بووە. شا، پەیمانی لەگەڵ رووسەکان بەستووە.

(ماتیزی) گوتی:

-شتی وا ئەستەمە! نابێ شا ببێ بە هاوپەیمانی داگیرکەرانی وڵاتەکەی! شا چۆن دەتوانێ ببێ بە هاوپەیمانی کۆمۆنیستەکان؟ شا، ئەگەر پەیمانی لەگەڵ رووسەکان بەستبێ، مانای وایە وڵاتی پێ فرۆشتوون. مانای وایە هەتا هەتایە وڵاتی داوە بە رووسەکان...

سەفیر گوتی:

-خۆت بۆ چوونە زیندان ئامادە کە! لەم شەوەوە، ئێمە هاوپەیمانی رووسەکانین. حوکومەتی شاهانەی رۆمانی جەنگی لە دژی (ئەلمانیا)و هەموو هێزەکانی تەوەر(محور) راگەیاندووە. (کرواتیا) بۆتە وڵاتێکی دوژمن بۆ ئێمە. ئێمە دەگیرێین.

(ماتیزی) دەسکی تەلەفۆنی دانایەوەو لە پێبلقە چووە خوارێ و رووی کردە سەفارەت. کە دەرۆیشت دەتگوت چاوی نووقاندووە. بەڵام هیچی لە دەست نەدەهات. وەکوو ئەو کاتە وا بوو کە لە ناو ناقوور بوو و یەك لە دوای یەك، بۆمبایان بە سەر سەر دەکەوت و هیچی لە دەست نەدەهات. رێك وەکوو ئەو کاتەی سواری ناقوور بوو وا بووا.

هیچی لە دەست نەدەهات. تەنیا ئەوە نەبێ کە دەست بە خۆیدا بەر بداتەوەو فەرمانەکانی سەفیر جێ بە جێ بکا کە پێیگوتبوو یەکسەر بەلگەنامەخانەی خزمەتگوزاریی راگەیاندنو خزمەتگوزاری رۆشنبیری بسووتێنێ. تەنیا ئەوەندی بۆ دەکرا. دۆسییەکان بسووتێنێ.

چووە نووزگەی خۆی لە سەفارەت. کاغەزەکانی ناو چەکمەزەکانی فڕێدایە ناو سۆبە. تەنیا دەستنووسو دەفتەرەکانی شیعری خۆی هێشتەوە. ئەوەندەو بەس! ئەوەی تری هەموو فڕێدایە ناو ئاگر.

دەوری نیوەشەو، (بۆریسلاڤا) هات. لە رادیۆدا، بە رادەستبوونی رۆمانیای زانیبوو. سۆراغی (ماتیزی) لە مالەوە کردبوو. بەلام (ماتیزی) لە مالەوە نەبوو. بیری کردبووەوە دەبێ لە سەفارەت بێ. دوای ماوەیەکی کەم، (هێدویگا)یش هات. ئەو دوو کچە جحێلەو (ترایان)، یەك یەك، دۆسییەکانیان دەگرتو فڕێیان دەدایە ناو ئاگر.

کاغەزو دۆسییەکان دەسووتانو مەرێزەی گەورەیان لێ هەلدەستا. دەتگوت رۆمانیایە دەسووتێ. ئینجا تەنیا (بۆریسلاڤا)و (هێدویگا) کاغەزەکانیان دەهاویشتە ناو ئاگر. (ترایان) چیتر نەیدەتوانی. تاقەتی نەبوو کاغەزەکان فڕێ بداتە ناو بلێسەی ئاگر. تەنیا چەند مانگێك، قالیو کورسیو مۆبیلیاتی نوێی نووزگەکەی بەکار هێنابوو. (ماتیزی) دەستی بە گریان کرد. دوو کچە جحێلە بیانییەکەیش بۆ (رۆمانیا) گریان. بۆ ئەو (رۆمانیا)یەی لە ژێر ترسو تۆقانی سۆڤیێت لەناو چووبوو.



(ماتیزی)، کە گەڕایەوە ماڵێ، یەکێ لە برادەرەکانی، (هوگۆ ئۆسوالدینی)، سەرۆکی میوانداریی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی (کرواتیا)ی لەبەر دەرگای ماڵەوە بینی. ژنەکەی لەگەڵدا بوو. ئەمانە نزیکترین برادەری (ترایان) بوون.

(هوگۆ ئۆسوالدینی) گوتی:

-لەمڕۆوە، (رۆمانیا) لەگەڵ (کرواتیا) لە جەنگدایە. بەڵام، هەرچەندە وڵاتەکانمان لە دژ یەك لە جەنگدان، ئێمە برادەری یەکترین.

هەرسێکیان چوونە سەرەوە بۆ وارخانەی (ترایان).

خانمی (ئۆسوالدینی) گوتی:

-هاتووین لە پێچانەوەی کەلوپەلەکانت یارمەتیت بدەین. دەبێ ئەمشەو، ئامادەیان بکەی. دوور نییە لە بەیانییەوە، دەست بە گرتنی دیپلۆماتە رۆمانییەکان بکەن. دەبێ خۆت ئامادە بکەی!

(ماتیزی) بیری لە کابرای رووسی (سێباستۆپۆل) کردەوە کە دوای ئەوەی لە دەیان و دەیان خانوو راویان نابوو و دەریان کردبوو، نەیدەویست چیدی بڕوا . وای بە چاك دەزانی، جگەرە بە لێو، لەبەردەم دەبۆکە، لەگەڵ تەقینەوەکەدا، بمرێ.

(ترایان) پرسی:

-دەمانبەنە کوێ؟

(هوگۆ) گوتی:

-کەس نازانێ. گرنگ ئەوەیە هەر ئەمشەو جانتاکانت بپێچیتەوە. کەس نازانێ لە کوێ دەگیرێن. بەڵام بە مسۆگەری هەر دەگیرێن!.

(ماتیزی) شتی گەورەی نەبوو بیانپێچێتەوە. تەماشای مێزێکی جوانی وەزینەی کرد . کاتێ ئەم مێزەیەی لە (ڤیەننا) کڕی ، بۆ باوکی نووسی حەز دەکا وێنەیەکی ئەمی لەسەر دابنێ. تەنانەت چوارچیوەیشی بۆ وێنەکە کڕی. چاوەڕێی وێنەی باوکی دەکرد. لەوانەیە باوکی وێنەکەی بۆ نارد بێ، بەڵام نامەو وێنەکە گوم بووبن. چوارچیوەکە، بە بەتاڵی لە سەر مێزی وەزینە بوو. تەنیا یەك چوارچیوەی بەتاڵی بێ وێنەی قەشەی (ئیزڤۆر)ی لەسەر بوو. تاکە شتێ (ترایان) حەزی دەکرد، کە زیندانی کرا، لەگەڵ خۆی ببا: وێنەی باوکی بوو . بەڵام هیچ وێنەی باوکی نەبوو. جا کە نەیتوانی ئەو تاکە شتە بە نرخە لەگەڵ خۆی ببا، شتەکانی دیکەی بەلاوە گرنگ نەبوون. کەیفی بە شتەکانی تر نەدەهات!.

(ترایان) گوتی:

-لە شتی زۆر پێویست زیاتر هیچ نابەم. هەموو شتێ لێرە جێ دێڵم. هەموو شت!!

ئەو چوارچیوەیەی وێنەی لە (ڤیەننا) کڕیبووی، ئەویش لە وارخانەکە جێ دێڵێ. چوارچیوەکە، بێ وێنەی باوکی، نرخی نییە، هیچ نرخی نییە.

دوگمەی رادیۆی بادا. لەو کاتەدا، شای (رۆمانیا) قسەی دۆستانەی بۆ سۆڤێتەکان دەکرد. پاشدان، (ژولیو مانیو)، خۆشەویستترین سیاسەتمەداری رۆمانی، قسەی کرد. ئەویش لە پەرژەوەندی سۆڤییەتەکان، لە پەرژەوەندی داگیرکەرانی وڵات، قسەی کرد. (ماتیزی) رادیۆی کوژاندەوە. هەستی دەکرد تەنیایە. قەت وا تەنیا نەبووە. لە هەمووکاتیّ تەنیاتر بوو. شاکەی جێی هێشتووە. وەزیرەکانو هەموو حوکوومەت جێیان هێشتووە.. بێگانە وڵاتیان داداگیرکردووە. زۆر زۆر تەنیایە!.

(هوگو ئۆسوالدینی) گوتی:

-زاتت هەبێ، ترایان، زاتت هەبێ!

میوانەکەی دەستی گەرم بوو.

(هوگو ئۆسوالدینی) گوتی:

-سۆزی، رووسەکان وڵاتی ئێمەی کرواتیش داگیر دەکەن. رووسەکان بە خێرا چەکی ئەمریکی دەگەنە ئێرە. دەچنە هەموو شوێنێ. وڵاتی ئێمەیش داگیر دەکەن. ئێمەیش دوای ئێوە سورگوم دەکرێین بۆ لای ئێوە.

## (٢٧)

چوار ساڵ بوو (ترایان) لە (زاگریب) ڕۆیشتبوو.

تەنیا یەك شتی وەکو(ترایان)ی جاران مابوو: چاویلکەکەی! هەمان چاویلکەی گەورەی چوارچێوە ڕەش بوو. بەڵام شووشەکان شکابوون‌و بە چرك چەسپ کرابوونەوە. ئێسکی دەم‌و چاوی زیاتر دەرزۆیی بوو.

(ترایان ماتیزی)، لە ئێستگەی (کرۆنبێرگ)، لە نزیك (فرانکفۆرت–سور–لو– مان) دابەزی. بلووزێکی سەربازیی لەبەر بوو پیتەکانی (پی– دەبلیو...)یان لێ سڕیبووەوە. پانتۆڵێکی زیندانیانی ئەمریکی‌و نیوچەکمەی بن کرێپی لە پێ بوو.

ئێستا،(ترایان) سمێڵی هەبوو. سمێڵێکی ڕەش، ڕەنگی دەم‌و چاوی بزرکاوتر دەنواند. لە ئێستگە پەڕییەوە. کە دەڕۆیشت، پێی لە دوو خۆی رادەکێشا. ئەمە ڕەوشتێکی تازەی بوو. ئەو ماوەیەی لە زیندان بوو، ناچار بوو پێڵاوی بێ قەیتان لە پێ بکا. ئەمە وای دەویست کە دەڕۆیشت، پێی بڵند نەکا. بەڵکو لە زەوی بخشێنێ بۆ ئەوەی ڕەت نەبا. ئیدی ئێستا، ڕاهاتووە تەنانەت بە پێڵاوی بە قەیتانیش، پێی لەسەر

زەوی رادەکێشیّ. (ترایان) کەڵەگەتر دیار بوو. چـونکی لــەڕو لاچـار ببوو. بەستەیەکی لـە بن هەنگڵ بوو. بە مەزەندە کتێب بوون. لــە کۆنــە رۆژنامەیەکە پێچابوون.

(ماتیزی) چووە ماڵێك دەوراندەوری درەختی بەرز بوو. پێشتر، زۆر بە وردی سەیری ژمارەو ناوی شەقامەکەی کرد. بۆ ئـەوەی دڵنیـا بـێ بـە هەڵەدا نەچووە..

(ترایان)، ئێستا زمانی ئەڵمانی بە رەوانی دەزانی. بە ئەڵمانی، داوای کـرد قسە لەگەڵ نوێنـەری (ڤاتیکـان) بکـا. پیرەژنێـك دەرگـای لێکـردەوە، فەرمووی لێکرد بچێتە سالۆنێك مۆبیلیـاتی کـۆن‌و جـوانی تێـدا بـوو. بێدەنگیی خەڵوەتخانە باڵی بەسەردا کێشا بوو. ئەو کورسییەی (ترایـان) لەسـەری دانیشـت، کورسـییەکی نـەرم بـوو. ئەمـە سـالۆنی شـاندی دبلۆماسی، عەرشی پـیرۆز بـوو، لــە ئـەڵمانیای داگیرکـراودا، (ترایـان) دانیشتبوو. بە تامەزرۆییەکی پەرۆشـەوە، تەماشـای قـاڵی‌و مۆبیلــەکانی دەکرد. لە زینداندا، تـەنیا یـەك رەنـگ هـەبوو: خۆڵەمێشـی! هـەموو شتێکی دەوروبـەری سـەخت‌و تـەوش‌و ناپەسـند بـوو. لـەوما زۆر بـە تامەزرۆیی چاوی دەبڕییە رەنگی قـاڵی‌و مۆبیلـەکان. بـە هـەموو گیـانی خۆیەوە هەستی بە مەخمەڵی نەرمیی کورسییەکان دەکرد. مرۆڤ کـە لــە زیندان دەردەچیّ، زۆر تینووی رەنگ‌و نەرمی‌و ناسکییە!

لۆرییەکی بچووکی ئەمریکی لەبەر پەنجەرە بوو. کاتێ لە زیندان بـوو، چەند جار، بەهۆی ڤاتیکانەوە، ئـەو جگەرانـەی وەرگرتبـوو کـە (ئیڤـا

پیرۆن) رەوانەی دەکرد. (ئار. پی – باوکی رۆحانی، ئۆکتاڤیان بارلیـا)، بەم لۆرییـە، باروبووەکـانی دەگەیانـدە زینـدان. هـەموو زیندانییـەکان ئاشنایەتییان لـەگەڵ ناوی ( ئار. پی – باوکی رۆحانی، ئۆکتاڤیان بارلیا)، هەبوو. دەیانزانی بـە لـۆری خـۆی دەچـێتە سـەردانی هـەموو زیندانـە ئەڵمانییەکان. کاتێ (ترایان)، لـە پـاژێرەوە، سـەیری دەکـرد، قەشـەیەکی گەنجی رەنگ زەرد هاتە سالۆنەکە. کە دەڕۆیشـت، دەتگـوت پێـی بـە فەرشەکە ناکەوێ.

قەشە بە دەنگی نەرمو شەرمن گوتی:

–من (ئار. پی –باوکی رۆحانی، ئۆکتاڤیان بارلیا)م.

(ماتیزی) هەستایەوە. قەشە تەماشای نیمچە چەکمەی پاڤـاڕو پـانتۆڵی سەربازییو چاکەتی عەسکەری (ماتیزی) کرد.

(ماتیزی) گوتی:

–من تازە لـە زیندان دەرچوویم.

قەشە ئاماژەی بۆ کرد دابنیشێو خۆیشی دانیشت.

ئەو پیرەژنەی دەرگای کردەوە، لـەسەر کۆسـپەی دەرگـا دەرکـەوت. دەیزانی دەبێ بـێ. هـەر جـارەی زیندانییـەکی ئـازادکراو دەهـات، بـە ئۆتۆماتیکی، چاو نانی سپی ئەمریکیو نڤیشکی دەهێنا.

(ماتیزی) گوتی:

-سوپاست دەکەم، یەکەم، بۆ ئەو جگەرەو خواردنی قووتووەی بۆت دەهێناینە بەندیخانە. بۆ منو بۆ هاورێکانم. یەکەم جار کە بەستەیەکم بە ناوی خۆمەوە وەرگرت، نیشانەی پیری پیرۆزی لەسەر بوو، گریام. دەزانی، من کەسم نەبوو لە زیندان بەستەم بۆ بنێریّ.

قەشە بە دەست ئاماژەیەکی کرد. ویستی بەو ئاماژەیە داوا لە (ماتیزی) بکا پێویست بە سوپاس ناکا. قەشە ناوو ناوی خانەوادەی هەموو زیندانیانی رۆمانی لە فەرماندەیی وەرگرتبوو و جاروبار، بەستەیەکی بۆ دەبردن. بۆ هەموو زیندانەکانی (ئەڵمانیا) کە رۆمانییان تێدا بوون. باوکە خۆی بەستەکانی دەبرد، هەمیشەیش بە لۆری بچووکی خۆی! ئێستا، (ماتیزی) ئازاد بوو. باوکی رۆحانی لێیپرسی چ دەکا؟

(ترایان) گوتی:

-لە زانکۆی (هایدلبێرگ)، لاهووت دەخوێنم. بە دەرزگوتنەوەی تایبەتی دەژیم. کتێبێکی چیرۆکی رۆمانیم نووسیوە، لە (هایدلبێرگ) بڵاوم کردۆتەوە.

(ماتیزی)، بەستەیەکی لە تەك خۆی دانا بوو. کتێبێکی بەرگ مقەووای نارنجی لیّ دەرهێنا. پێشکێشێکی لەسەر نووسرابوو. کتێبەکەی لەبەردەم قەشە دانا.

(ماتیزی) گوتی:

-بە چەند وشەیەك باسی ژیانی خۆمت بۆ دەکەم. من کوڕی قەشەیەکی ئورتۆدۆکسی دێی (ئیزڤۆر)م، لە (مۆڵداڤیا)ی باکوور. فەلسەفەو ئەدەبیاتم لە زانکۆی (بوخاریست) خوێندووە. چەند کتێبێکم بلاوکردۆتەوە. لە کاتی جەنگی دژ بە رووسیەدا، لە بەرەی شەڕ بووم. خەلاتی شاهانەی شیعرم وەرگرتووە. سکرتێری رۆشنبیری سەفارەتی رۆمانی بووم لە (زاگریب). کاتێ رووسەکان رۆمانیایان داگیرکرد، کروات و ئەلمانەکان، وەکوو دیپلۆماتێکی دوژمن، منیان گرت.. پاشان ئەمریکی هاتن. ئەوانیش بە دەوری خۆیانەوە، بە ئۆتۆماتیکی ئێمەیان زیندانی کرد. گوتم (ئۆتۆماتیکی) یانی وەکوو فەرمانبەرێکی دوژمن. پاشان لە زیندان ئازاد بوومو ئێستایش...

قەشە چاوەڕێی تەواو کردنی قسەکەی کرد:

-ئێستایش...

(ماتیزی) دووبارە راوەستا. سەرنجی بڕیە لمووزی پێلاوی پافاڕی. شەرمی دەکرد قسەی دڵی خۆی بکا. بەلام هەوڵێکی دا:

-ئێستا... کتێبێکم نووسیوە، باسی ئەو رووداوانەم کردووە کە سالانی دوای رۆیشتنم لە (زاگروب) بەسەرم هاتن. بەلام ئەمە سوودی نییە. لەم کتێبەکەدا باسی پەیوەندی مرۆیەك دەکەم لەگەڵ رۆژاوادا. ئەم کتێبە لە کتێبەکانی دیم جیایە کە تا ئێستا نووسیومن. ئەم ئەزموونە شتێکی تازەو باڵکێشە بۆ من. لەم کتێبەدا، باسی دۆخی مرۆڤ دەکەم لە کۆمەڵی رۆژوادا. کتێبەکەم ناوی (رۆمانی سەردەمی ئێستا)یە.

(مـــاتیزی) بەســـتە کاغـــەزێکی پێشـــانی قەشـــە دا، بەقەڵـــەمی دار نووسرابوون.

-۱۲۰۰ لاپەڕەم نووسیوە. گرفتی سەرەکی ئەوەیـە مـن و هاوڕێکـانم وەکوو (تاکەس)ێکی تاوانبار نەگیراین. بەڵکو بە (ئۆتۆماتیکی) گیرایـن، بە تاوانێك کە (بە کۆمەڵ) درابووە پاڵ بەشێکی هاولاتیـان کـە ئێمـەیش لـەوان بووین. هەرگیز تۆژینەوە نەکراوە ئاخۆ من وەکوو (تاکـە کـەس) تاوانم کردووە؟ یان نا؟ ئەوانەی منیـان گرتبوو،ــ حـەزیان لـە شـتی وا نەدەکرد. هەموو (فەرمانبەرانی رۆمانی) تاوانبار کرابوون.

(ماتیزی) کاغەزەکانی لە ناو بەستەکە نایەوە. گوتی:

-ناتوانم هەموو شتێکت بۆ باس بکەم. ورووژاوم، قسەم بۆ نایە!. بەڵام چی رووی دا بێ، لەم کتێبـەدا نووسـیومە. هەرچـی روویـدابێ... لــەم کتێبەدا باسم کردووە...دێمەوە سەر بابەتی سـەردانەکەم. ئـەم کتێبـەی (ساتی ئێستا)- زۆر بێ هیواییە بۆ ئەوانەی من پێیانـدەڵێم (سـاتی دوای ساتی کۆتایی)- لـەوانەیشە بۆ مرۆڤ باش بێ. ئەم کتێبە باسی کـەتوار دەکا. ئەوەندەی پەیوەنـدی بـە خۆمـەوە بـێ، ئـەم کتێبـە کۆتـایی بـەو کارەسـاتبارە یەهـەربرە دێنـێ کـە ئێسـتا تێیـدا دەژیـم. هـاتووم داوای یارمەتیت لێ دەکەم. دەبێ ئەم رۆمانە بلاو بکەمـەوە. پێویسـتە!! بـەڵام ئیتر تاقەتی کارکردنم نەماوە. ناتوانم چیتکە کار بکـەم. چـونکە برسـیم. بای سێ چوار حەفتە ئیشم ماوە!. ئەوەندەو بەس!! ئەوپەڕی سـێ چـوار حەفتە، بەڵام ئەوەندە نیزم، نـاتوانم چـیتر بـەردەوام بم. کـارێکی کـەمم

ماوە...دوو ساڵە بێ وچان کار دەکەم. لە زینـدان دەسـتم پـێ کـرد. حەیفە واز لەو کاری دووساڵەیە بێنم کە تەنیا چەند حەفتەیەك ماوە بۆ ئەوەی تەواوی بکەم!.

قەشە پرسی:

-من دەتوانم چیت بۆ بکەم؟ هیچ شەرم مەکە، پێم بڵێ! دەتـەوێ مـن چ بکەم؟

(ماتیزی) گوتی:

تکا دەکەم شتێکم بۆ خواردن بدەیتێ. زۆر نا. تەنیا بای پێویـسـت. بـۆ ئەوەی سێ چوار حەفتە بـە زینـدوویی بمێنـمو کـار بکـەم. بـە کـەمێ نۆیشك، برێ نـان، نـەختێ قـاوەو شـەکر دەتـوانم چـوار حەفتـە خـۆم رابگرمو کتێبەکە تەواو بکەم.

(ماتیزی)، لە شەرمان سوور هەڵگەڕا.

گوتی:

-بمبوورە. بەڵێنت پێدەدەم ئەوپەڕی بە ماوەی چـوار حەفتـە کتێبەکـە تەواو دەکەم. ئەوە چواردە ساڵە دەنووسم. ئاشنای کارەکەم. بەڵام ئـەم کتێبە تەواو جیایە. کتێبەکە سوودی بۆ خەڵك دەبێ. وەکوو کتێبەکانی پێشووم نییە. بەڵام ناتوانم لەسەری بـەردەوام بم چـونکە برسـیم. ئـیتر، ئازاد دەبم ..

قەشە چای بۆ (ترایان) تێکرد. فەرمووی لێکرد نان و کەرەو ریچۆڵ بخوا.

(ماتیزی) گوتی:

-ئازاری پێ دەخۆم ئەم هەموو شتەت بۆ بگێڕمەوە..

فرمێسکی لە چاو قەتیس ما. ئایا چاکە گەرم بوو؟ ئایا ئومێدی بڕا بوو؟ ئایا وڕووژا بوو بۆیە فرمێسکی لە چاو هات!؟ لەوانەیشە چاکەی قەشە بووبێ کە چاکەی بۆ تێکرد. چاکەیەکی وەکوو چاکە گەرم! هەموو ئەمانە گریان لە گۆناکانی (ماتیزی) بەرداو چاویان پڕ رۆندك کرد.

ئەو کەسانەی سەری خۆیان لە هەموو دیوارێك کوتاوە، ئەو کەسانەی پێشێل کراون، بە مانای راستەقینەو خوازەیی، وەکوو بەسەر خۆم هاتووە، ناچار کراون، خۆڵ بخۆن، مردوون، یان تەواو گێژو خەرفاو بووین. وەکوو لە کتێبی (ئەییوب)دا هاتووە: (تەنیا من نەجاتم بوو تا بێم بۆتان باس بکەم.)[2] لەبەر ئەوەیە من دەنووسم! چونکە من دوای نقووم بوونی کەشتی، لە مەنجەڵ دورچوویم!. تەنیا لەبەر ئەوەیە دەنووسم. هەروەسا بۆ ئەوەی نقوومبوونێکی دیکە ببینم.

قەشە گوتی:

-هەرچی پێت دەوێ، سبەی بەیانی، بۆت دێنمە (هایدلبێرگ).

---

[2] لە دقە فرەنسییەکەدا، ئەم رستەیە بە ئینگلیزی نووسراوە. (و.)

(ماتیزی) هەستا. گوتی:

-دێ بینی کە نائومێد نابی. کارە زەحمەتەکە، کە کاری دوو ساڵ شەوو رۆژە، تەواو بووە. لەم سێ حەفتەیەدا، تەنیا پاکنووسی دەکەمەوەو هیچی تر..

قەشە گوتی:

-سبەی بەیانی، لە (هایدلبێرگ)م.

(ماتیزی)، پێی لەسەر زەوی راکێشاو رۆیشت. شەرمی دەکرد جلی زیندانیی ئازادکراو لەبەر بکا. لە رۆخی جادە، بن دیوارو بن دیوار دەڕۆیشت و خۆی بە دیوارەکانەوە دەگرت.

ئەو شەوە تا سپێدە، خەریکی نووسینەوەی کتێبەکەی بوو. بە یانیی رۆژی پاشی، (باوکی رۆحانی ئار. پی - ئۆکتاڤیان بارلیا) تا نهۆمی سێیەمی بینای ژمارە ٦٠ی شەقامی (رۆتباخ) لە (هایدلبێرگ) سەرکەوت. قەشە بەستەیەکی گەورەی پێبوو. خۆی هێنابووی. خۆی لەڕو داڵگۆشت بوو. لە ژێر قورسایی بەستەکە، هێنکە هێنکی بوو.

(ماتیزی) گوتی:

-تۆ، بە چاکەی خۆت، کتیبی منت تەواو کرد. تۆ ئەم کتێبەت نووسیوە! چاکەی تۆ نەبوایە، قەت (رۆمانی سەردەمی ئێستا)م بۆ تەواو نەدەکرا.

قەشە بە پێوە وەستا بوو. بەستە گەورەکە لە ناوەندی ژوورەوە، لەسەر زەوی بوو. بەر لەوەی (ترایان) بتوانێ وشەیەکی وا بدۆزیتەوە سوپاسی بکا، قەشەی دبلۆماسی لە ژوورێ دەرچوو.

(ماتیزی) ماوەیەکی زۆر تەماشای نیشانەکانی (پیر پێیر)ی کرد کە لەسەر بەستەکە چاپ کرابوو. چاوەکانی نووقاند. خەریکە خەونەکەی دێتە دی. ئێستا، شتێکی هەیە بیخواو شتێکی هەیە پێ بژیو نەمرێ تا کتێبەکەی تەواو دەکا. سوپاسی خوای کرد بۆ ئەم یارمەتییە... نیشانەی خاچی کێشا. نیشانەی (پیر پییر)ی لێکردەوەو وەك شتێکی پیرۆز ماچی کرد.

# (٢٨)

(ماتیزی)، شەوو رۆژ دەینووسی. بەستەکەی قەشە کانییەکی زێڕ بوو!.

(ماتیزی)، کاتێ کاری لەسەر (رۆمانی سەردەمی ئێستا) دەکرد. بە تەواوی خۆی لە هەموو شتێکی دەورووبەری، تەنانەت لە خۆیشی، دابڕاندبوو. هەمان کاری پەپوولەی کرمی ئاوریشمی دەکردو بە هەمان گۆڕاندا دەرۆیشت کە باڵو قاچەکانی لە دەست دەدا. دەبێتەوە بە کرمو داوی ئاورێشم لە جەسەی خۆی دروست دەکاو سلوولی هێژای خۆی، زیندانیی ئاورێشمی خۆی، پێ رۆدەنێ کە تێیدا دەژاکێو دەمرێ. بە جەستەی خۆی ئارمووش چێ دەکا. بە هەموو گیانیی خۆی، دیواری ئاوریشم دروست دەکا. کە دەچووە جادە، خەڵك ئاوڕیان لێ دەدایەوەو تەماشایان دەکرد. رێداران شتێکی جیایان تێدا مەزەندە دەکردو هەستیان دەکرد لە خەڵکی تر جیایە. گەنجەکان کە دەیانبینی، لە قاقای پێدەکەنیان دەدا. بێ ئەوەی بزانن بۆچی قەشمەری پێدەکەن. بۆیە (ماتیزی) تا ئێوارە، تاریکی دەکەوتە عەردی، لە ماڵەوە دەرنەدەچوو.

دە رۆژ دوای دیداری (ئار. پی. ئۆکتاڤیا بارلیا)، هەستی کرد چاوەکانی لێڵو تەماوین. ئەو شەوە، کارەکەی راگرتو خەوت. پێی

وابوو کە خەوت، ئەو تەمەی بەری چاوی گرتووە، دەڕەوێتەوە.. بەڵام کاتێ بە خەبەر هات، ئازاری هەبوو. ئازارێکی زۆری هەبوو. بە وردی لە ئاوێنەدا، تەماشای خۆی کرد. هەندێ پەڵـەی سـووری وەك خـوێنی لەسەر چاو دەرکەوتبوو. پەڵەکان خوێن نەبوون، کۆمەڵە دەزوولـەیەکی وەکـوو پارچـە گۆشـتی زینـدەو خوێنـاوی بـوون، لەسـەر چـاوەکانی دەرکەوتبوون. لـەگەڵ ئەمەیشـدا، هـەوڵی دا کـار بکـا. بـەڵام چـاوی نەیدەدی. وای دەزانی تەونێکی داپیرۆچکەی بەسەرچاودا هاتووە.. ئەمە ئازارێکی وای پێ دا باس ناکرێ.

ڕۆرژی سێیەم، (ماتیزی) چووە لای دختۆرێك. دختۆرێکی چاو، ماڵی لە بەرامبەر ئێستگەی ڕێگای ئاسنی (هایـدڵبێرگ) بـوو. نـاوی دختـۆر (زۆکۆت) بوو.

دختۆر، دوای ئەوەی پشکنی، گوتی:

–دەبێ یەکسەر عەمەلیاتت بکەم.

تەماشــای پارچــە گۆشــتە خوێناوییــەکانی کــرد کــە بــەری چــاوی (ترایان)یان گرتبوو.

دختۆر گوتی:

– دەبێ ئەم لینجانە هەڵبگرم.

(ترایان) بیری لـە بەڵێنی خۆی کردەوە کە بە قەشەی دپلۆماسی دابوو بە سێ چوار حەفتە ڕۆمانەکـە تـەواو بکـا. ئێسـتا، ناچـار بـوو، لـەبـەر

عەمەلیات، کارەکە رابگرێ. (ترایـان) هەسـتی کـرد، لـە کارەکەیـدا، چاوەکانی خیانەتیان لەگەڵ کردووە. چاوەکانی خیانەتیان لەگەڵ کـردو رادەست بوون.

دایەگێکی قژ زێڕین کەرەستەی عەمەلیاتی ئامادە کرد.

(ترایان) گوتی:

-ناتوانیێ عەمەلیاتەکە دوا بخەی؟! بە ئاشکرا پێت بڵێم: کارێکی پەلەم بە دەستەوەیە. دەبێ تەواوی بکەم، دە رۆژی ترم پێدەوێ. بەڵکو بتـوانم بە چارەسەر، ماوەی ئەو دە رۆژە، عەمەلیاتەکە دوا بخەم؟ لەو ماوەیەدا، دەتوانم کار بکەم.

دختۆر گوتی:

- شـتی وا ئەسـتەمە!. چـاوت لـە دەسـت دەدەی. دەبـێ بـە پەلـە عەمەلیاتت بکەم. هەر ئێستا! ئایا تۆ گیرابووی؟

(ماتیزی) گوتی:

-بەڵێ. گیرابووم.

دایەگ کەرەسـتەی عەمـەلیاتی ئامـادە کـرد. (ماتیزی)یـان لـە سـەر کورسییەکی بڵند دانا. دایەگەکە پەرژەنامەیەکی چـاپکراوو قەڵـەمێکی دایە. داوای لیێ کرد مۆر بکا.

دایەگ گوتی:

-ئەم تەرحە عەمەلیاتە، بە ڕەزامەندیو بە لێپرسینەوەی نەخۆشەکە نەبێ، ناکرێ. تۆ دەبێ بە نووسین ڕەزامەندی بدەیو دان پێدا بنێی کە عەمەلیاتەکە، سەرکەوتوو بێ، یان سەرکەوتوو نەبێ، ئێمە لێپرساو نین.

(ماتیزی) مۆری کرد. دەیزانی شتەکە ترسناکە. خۆی ئامادە کرد. دختۆر بۆی روون کردەوە پەیدابوونی ئەم گۆشتە زیادە سوورەی بەری چاوی گرتووە، هۆکەی کەمبوونی ڤیتامینە. بە نەشتەرێك دەستی بە هەڵگرتنی زیادە گۆشتەکانی چاوی (ترایان) کرد.

(ماتیزی) خۆی پێ بەرزەفت نەبوو. دەستی بە هاتو هاوار کرد. بە هەموو هێزی خۆیەوە هاواری دەکرد. دەتگوت هاواری لە بنی زگییەوە دێتە دەرێ. چاوێشە یەکێکە لە بەسۆترین ئازار. ئازارەکەی لە ئازارەکانی دی جیایە. ئازارێکە خەوت لێ دەهەڕمێنێ. تا ئەو ئازارە گەورەتر بێ، چاوت روونتر دەبێو باشتر دەبینێ. ئازارەکە لە هەر جێگایەکی تری لەش بێ، دەتوانی تا رادەیەك گوێی پێنەدەی. لە حاڵەتی بوورانەوەدا، وات لێ ناکا هاوار بکەی، . تەنیا دەتخاتە ناڵین. ئەو ئازارەی فشاری بۆ چاوەکانی (ماتیزی) دێنا، چاوی روونتر دەکردەوەو هەموو بەهرەی لە رادەبەدەر زیاد دەکرد. ئازارەکە توانای هاوارکردنی زیاد دەکرد. ژێکانی دەنگی بە تواناتر بوون. هاواری توندو تیژتر بوو.

ئازارەکە تەنیا ئەو کاتە کەم دەبووەوە کە (ترایان) هەستی بە ئامێری ئاسنی ساردی سەر بیبیلەکانی نەدەکرد.

ئێستا، دایەگی قژ زێڕین چاوی تیمار کردو بەستییەوە. (ترایان)، چاوی ڕاستەی بە تەواوی بەسرابووەوە. بەڵام چاوی چەپەی کرابووەوە.

دختۆر گوتی:

-ئەگەر لە تێری خواردن نەخۆی، عەمەلیاتەکە بەکەڵ هیچ نایە. ئەگەر بە ڕادەی پێویست شت نەخۆی، تا چەند حەفتەیەکی تر نەخۆشییەکە سەر هەڵدەداتەوە. جاری دووەم، عەمەلیاتەکە زۆر زەحمەتتر دەبێ. ئەوەندە سەخت دەبێ لەگەڵ جاری یەکەم بەراورد ناکرێ. بە خواردنی ڤیتامین نەبێ، چاك نابیتەوە.

لەو کاتەدا، ئەستەم بوو ڤیتامین لە (ئەلمانیا) دەست بکەوێ.

دختۆر گوتی:

-دەبێ یارکۆکی بخۆی. دەبێ یارکۆکی زۆر بخۆی.

ئەو شەوە، (ماتیزی) دابەزی بۆ ناو دەگای (سەکەنهایم). ئەمە نزیکترین دەگا بوو، کەوتبووە نەعبەینی (هایدلبێرگ)و (مانهایم). (ماتیزی) بەستەیەکی لە بن هەنگڵ بوو. هەندێ شەکر، بڕێ کاکاو، نەختێ قاوەو کەمێ جگەرەی لەناو نابوو. هەمووی لەو بەستەیە دەرهێنابوو کە قەشەی (ڤاتیکان) پێشکێشی کردبوو. لە (سەکەنهایم))، یەك یەك، لە دەرگای ماڵی هەموو فەلاحەکانی دا. داوای دەکرد ئاخۆ هەندێ یارکۆکی بە جگەرە، بە قاوە، بە شەکر، بە کاکاو نادەن؟

ماڵەکانی هەوەڵی دەستیان بە روویەوە نا. (ترایان) هەستی بە زەلیلی کرد. ئەو کاتە، لادێیەکان کەسانی دەوڵەمەند بوون. ئاخیری، لادێییەك دەرگای لێکردەوە. بردییە حەوشە. هەندێ گێزەری بە شتەکانی ناو بەستەکە دایە.

(ترایان)، گەڕایەوە ژوورەکەی خۆی لە (هایدلبێرگ)، دەستی بە کارو بە خواردنی یارکۆکی کرد. یارکۆکییەك لە دەستی چەپو قەڵەم لە دەستی راستە، لە نووسینی (رۆمانی سەردەمی ئێستا) بەردەوام بوو. ئەو رۆمانەی کە مرۆ نکوولی خۆیو تاوانو رزگاریی (تاکە کەس)ی تێدا دەبینێ. لەم رۆمانەدا، خەڵك خۆیان لە کارەساتبارترین هەڵوێستدا دەبینن. (بە کۆمەڵ) تاوانبار دەکرێن. ئەم (بە کۆمەڵە) دەبێ بە کەفارەتی گوناهەکانیان. ئەمە ترسناکترین رەتدانەوی مەسیحیەتە. کە مرۆڤ وەکوو مرۆڤ، وەکوو (تاکە کەس) دەیکا.

کاری ڤیتامینەکانی ناو یارکۆکی، بە تێپەڕینی ماوەیەکی مەیلەو زۆر نەبێ، دەرناکەوێ. لەو کاتەدا، دوای چەند رۆژێك، کاریگەری یارکۆکی لە تلی (ماتیزی) دەرکەوت. (ترایان) ئازارێکی زۆری گرژیی هەبوو. وەکوو مار لەسەر کتێبەکەی کەپکەی دەخوارد. قەڵەمی لە ناو دەستی رادەگوشی. زگی زۆر دێشا. بەڵام ئەو نەیدەویست رادەست بێ. دەبوایە (رۆمانی سەرەمی ئێستا) تەواو بکا.

(ترایان) حەفتەی دوو جار بۆ یارکۆکی دەچووە (سەکەنهایم)، حەفتەی سێ رۆژ دەچووە لای دختۆری چاو. کاتێ دایەگ سفێفەی لە

چاوی کردەوەو پێگوت چاك بۆتەوە. (ماتیزی) دیتی ریشاڵە سوورەکان نەماون. بەڵام شەو، بە تاریکی، هیچی نەدەدی. کە دونیا تاریك دادەهات، تەنانەت دەستی خۆی نەدەدی. شەوکوێر ببوو!!

دختۆر گوتی:

-ئەمەیش هۆکەی، کەمی ڤیتامینە. تۆ ماوەی چەند زیندانی بووی؟

میهرەبانیی دختۆر کاری لە (ترایان) کرد. کابرا دختۆرێکی چاكو پیاوێکی ئازا بوو.

دختۆر گوتی:

-بە رابردنی رۆژگار، ئەگەر بتوانی تۆڵەی کەمیی ڤیتامین بکەیتەوە، شەوکوێریت نامێنێ.

(ترایان) بە سەبرو هەدار لە کارەکەی خۆی بەردەوام بوو. ئاخیری، رۆژێ، (رۆمانی سەردەمی ئێستا) تەواو بوو. بەکاربۆن، دوو دانەی لە کتێبەکەی نووسییەوە. تەواوکردنی ئەم کتێبە سەرکەوتنێکی زۆر گەورە بوو بۆ (ترایان). لە راستیدا، ئەمە یەکەمین کتێبی گەورە بوو نووسیبووی. ئێستا، کتێبەکانی پێشووی لەبەر چاو منداڵانەو ساویلکەو بێ نموود بوون. ژیانیی پێش زیندانی بوونی، بە سیستەماتیکی تاوانبارکرانی (بە کۆمەڵ)ی بە هەمان شێوە هەڵدەسەنگاند. بە رەنجو ئازار نەبێ، مرۆڤ دەستکەوتی گەورە، دەسکەوتی راستەقینەی پێ نابڕێ. (ترایان ماتیزی)یش زۆری رەنج بردبوو.

## (٢٩)

(ماتیزی) برادەرێکی ڕۆژنامەنووسی لە (ڤیەننا) هەبوو. بۆی نووسی کە تازە ڕۆمانەکەی تەواو کردووە. باسی بابەتەکەی بۆ کرد. برادەرە ڤیەننایییەکە پێشنیاری کرد (ڕۆمانی سەردەمی ئێستا) وەربگێڕێ بۆ ئەڵمانی، بەڵام ئاستەنگێکی زۆر گەورە هەبوو، دەبوو تەختی بکا. لەوان ڕۆژاندا، کەس نەیدەتوانێ هیچ دەستنووسێك لە (ئەڵمانیا) ڕەوانەی دەرەوە بکا. (ترایان) بە دوای چارەیەکدا گەڕا. بەڵام زۆر زەحمەت بوو بتوانێ ڕێگایەك بۆ ناردنی دەستنووسەکە بدۆزێتەوە. دەسەڵاتدارە داگیرکەرەکان هەموو کارێکی نایاساییان بە چەند ساڵ زیندانی، سزا دەدا. (ماتیزی) تازە لە زیندان هاتبووە دەرێ. خۆی دەپاراست. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستی بە وەرگێڕانی ئەڵمانی هەبوو. هیچ بڵاوکەرێکی ئەورووپای ڕۆژئاوا، نەیدەتوانی دەستنووسەکە بە زمانی ڕۆمانی بخوێنێتەوە.

(ترایان)، کاتێ بیری لە دۆزینەوەی ڕێگابیەك دەکردەوە بۆ ئەوەی، بێ ئەوەی ترسی گیرانی هەبێ، دەستنووسەکە ڕەوانەی نەمسا بکا، گوێی لێبوو چەند جارێك لە دەرگا درا. هەرگیز کەس نەدەهاتە لایەوە. بە

عاجباتی، بـه پەرۆشـەوە، دەرگـای کـردەوە. هاوڵاتییـەك بـوو. مـادەم هاوڵاتیەك هاتۆتە دیدەنی، دەبێ شـتێکی گـەورە قـەوما بـێ. (مـاتیزی) خـولقی کـرد دابنیشـێ. هاوڵاتییەکـە دانەنیشـت. تەماشـای دەستنووسەکەی کرد لەسەر مێز. بە وردی تەماشای کرد.

گوتی:

-ئایا دەزانی من لە (سی. ئای. سی) کار دەکەم؟!

(سی ئای سی) پۆلیسی نهێنی سوپای داگیرکەری (ئـەمریکا) بـوو لـە (ئەلمانیا).

بەردەوام بوو:

-راپۆرتێکمان لـە بـارەی تـۆوە پێگەیشـتووە. (ئیلـی)ی هاوڵاتیمـان نووسیویەتی، خۆت دەیناسی! تاوانباری کردووی کە کتێبێکت لـە دژی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نووسیوە.

(ماتیزی) گوتی:

-کتێبێکم نووسـیوە. ئـەوەتا لەسـەر مێـزە. بـەڵام کتێبەکـە لـە دژی (ئەمریکا) نییە. لە دژی هێزە داگیرکەرەکانیش نییە.

- کتێبێکت لە دژی ئەمریکا نووسیبێ، یان نا، گرنگ نییە. ئەوەی تـۆ کردووتە ئەوەنـدە گـرنگ نییـە!! گـرنگ ئەوەیـە راپۆرتێکـت لـە دژ هاتووە!. (سی. ئای. سی) ناچـارە لـە راسـتیو ناڕاسـتی ئـەو راپۆرتـە بکۆڵێتـەوە. بـۆ ئـەم لێکۆڵینـەوەیش، دەسـتگیر دەکرێـیو وەرگێڕانـی

کتێبەکەت ماوەی چەندی پێ دەوێ، تۆ ئەوەنـدە لـە بەندیخانـە دەبـی. کتێبەکە چـەند لاپەڕەیـە؟ چـوار سـەد لاپـەڕە؟ وەرگێڕانەکـە، دەوری سـاڵێك دەبـا. ئـەو ماوەیـە، تـۆ لـە بەندیخانـە دەبـی. ئەگـەر، لـە وەرگێڕانەکەدا، دەربکەوێ کتێبەکە هیچ شتی لە دژی (ئـەمریکا) تێـدا نییە، بەر دەبی. بەڵام بەپێچەوانەوە، ئەگەر شتی لە دژی (ئەمریکا) تێـدا بێ، تۆ دادگایی دەکرێی‌و بـە پێـی یاسـا حـوکم دەدرێـی. مـن هـاتووم خەبەرت بدەمێ کە تۆ ئەمڕۆ سبەی، دەستگیر دەکرێی. دەزانـی بۆچـی هاتووم خەبەرت بدەمێ؟ لەبەر ئەوەی تۆ ماوەیەکی زۆر زیندانی بـووی. حەیفـە دووبـارە زینـدانی ببـی! تـۆ خـۆت شـارەزای زیندانـەکانی ئەمریکای...

(ماتیزی) پرسی:

-باشە چ بکەم؟

برادەرەکەی سەر بە (سی. ئای. سی) گوتی:

-دەبێ هەر ئێستا خۆت شوون بزر بکەی! یەکسەر راکە!

سەر لەنوێ، رێگا لەبەر چاوی (ماتیزی) راکشا. رێگایەکی بێ پایـان! تەنانەت کاتێ لە زیندانی ئەمریکاییەکانیش بـوو، لـە سـەفەر بـێ بـەش نەبوو. تا لە بەندیخانە بوو، لەم سەر تا ئەو سـەری ئـەڵمانیای رۆژئـاوا، یەك لە دوای یەك، گوازرایەوە بیست ئۆردوگا.

(ماتیزی) گوتی:

–نازانم بچمە کوێ؟ ناتوانم بچمە هیچ شوێنێ! هیچ پێناسەم نییە! هیچ پارەم نییە! هیچ تاقەتی ڕۆیشتنم نییە! بچمە کوێ؟ دەتوانم بچمەکوێ؟!

(ماتیزی) دووبارە بیری لە کابرای رووسیی (سێباستۆپۆل) کردەوە کە سەرەڕای دوا فەرمانی چۆڵ کردن، نەیویست بڕوا. ویستی لەگەڵ تەقینەوەی دەبۆکەی بمرێ.

–خۆت بزر کە! چونکە ئەمڕۆ، یان ئەوپەڕی سبەی، پۆلیس دێ. ئەمڕۆ سبەی، جێبەکەیان لەبەر دەرگای ماڵت رادەگرنو دەتبەن.

(ماتیزی) باوەڕی نەدەکرد ئەو گیرانەی هەڕەشەی لێدەکرد، ئەوەندە نزیك بێ.

هاوولاتییە برادەرەکەی (ماتیزی)، کە ڕۆیشت، دووبارەی کردەوە

–بێ یەك چرکە دواکەوتن، خۆت بشارەوە. یەکسەر خۆت بزر کە!

(ترایان)، دەستی پێکرد کەلو پەلەکانی خۆی لە ناو کوڵەپشتی ئەمریکی نا: دوو دانە دەستنووسەکەی (ڕۆمانی سەردەمی ئێستا)و ئەوکەم شتەی لە کاتی دەرچوونی لە زیندان هەیبوو. کرێی خانوو، چی لەسەری ما بوو، دای. سوپاسیی میوانپەروەریی ئەو پیرەژنەی کرد کە ژوورەکەی بە کرێ پێدابوو. هەر ئەو رۆژە، بۆ ئێوارێ، جارێکی تر، لە (کرۆنبێرگ)، خۆی لە سالۆنی پڕ مۆبیلی کۆنو جوانی (ئار. پی. – ئۆکتاڤیان بارلیا)، دۆزییەوە.

کارەکەرەکە رێك وەکوو جاری یەکەم، چای هێنـا. (ترایـان) لەسـەر هەمان کورسی دانیشت کە پێش چەند حەفتەیەك لەسەری دانیشتبوو.

(ماتیزی) گوتی:

-یەکێ لە هاولاتییەکانم زمانی لێداوم کە کتێبێکم لە دژی (ئـەمریکا) نووسیوە. خەبەریان پێداوم کە ئەمڕۆ سـبەی دەگیرێـم. دەسـت بەسـەر دەستنووسەکەم دادەگیرێ تا سەربازی ئەمریکی کتێبەکەم وەردەگێڕن بۆ ئینگلیزی، دەبێ لە زیندان بم... من چیتر ناتوانم لە زیندان بژیم.

(ئار. پی. - بارلیا)، کەوتە بن بـارەکی غـەمان. ئەوەنـدەی خەفـەت خوارد دەتگوت هەڕەشەی گیران لە خۆی کراوە. سەری دانەواند.

(ماتیزی) گوتی:

ئەگەر ئێستا بمگرن، نزیکەی یەك ساڵ زیندانیی دەبم. ئەمە بۆ من زۆرە! من چیدی بەرگەی بەندیخانەم پێ ناگیرێ. دەبێ رابکەم. دەبـێ ناوچـەی ئەمریکی جێ بێلم. تکـات لێدەکـەم تـۆ رۆمانەکـەم بـۆ وەرگێڕەکـەم رەوانە بکە (ڤیـەننا). دڵنیـات دەکەمـەوە ئـەم کتێبـە هـیچ شـتی دژی (ئەمریکا)ی تێدا نییە. هیچ!!

(ماتیزی) دەستنووسی (رۆمانی سەردەمی ئێستا)ی لەسەرمێز، لەبەردەم قەشە دانا. دەستنووسەکە بە رەش پێچرابوو. زەرفێکیشی لـە تـەك بـوو ناونیشانی وەرگێڕەکەی تێدا بوو لە (ڤیەننا)). (ماتیزی) هەستا.

جەنابی (ئار. پی - بارلیا)، سوپاس‌و وەفاداریی قووڵی خۆم پێشکەش بە تۆو بە کلێسەی کاتۆلیك دەکەم!

رووی کردە دەرگا.

قەشە پرسی:

-دەچیتە کوێ؟ روو دەکەیتە کوێندەر؟

ئەو ڤیرارانەی پۆلیسیان بە دواوەیە، قەت ناڵێن دەچنە کوێ. بەڵام ئەو، دەیتوانی بەم قەشەیە بڵێ.

(ماتیزی) گوتی:

-دەچمە فڕەنسا! فڕەنسا. وڵاتی ناسك‌و بۆنداری (سان-لوی)! دەچمە فڕەنسا...

بە کوورە کوورِ، بە بەرگی زیندانیی ئازادکراو، پێی لە دوو خۆی راکێشاو رۆیشت. تۆقابوو.

لەو رۆژەوە بە دواوە، (ئار. ی - بارلیا) چیدی گوێی لێ نەبوو کەس باسی (ترایان ماتیزی) بکا. چیدی!! وەك ئەوەی مردبێ‌و لە خاك نێژرابێ.

## (٣٠)

رۆژێ (ماتیزی) دووباره پەیدا بوو. دەتگوت لــه زەوی هــەڵتۆقیوە. دیســان زۆر گــۆڕا بــوو. ببــوو بــه پیــاوێکی تــر. تــەنیا چــاویلکه‌کەی چاوێلکەی جاران بوو. شووشــه کۆنــەکانی چــاویلکەکەی نــەمابوون. هەمان شووشەی شکاوو به داو چەسپکراوی پێشوو نەبوون که کاتێ له (کرونبێرگ) خواحافیزی لــه (ئار. پی. – بارلیا) کرد، له چــاوی بــوو. کاتێ گوتی: ( دەچمه فڕەنسا، خاکی ناسكو بۆنداری (ســان- لــوی)، خوا حافیز).

(ماتیزی ئیتر پێڵاوی پافاڕی گۆرینی له پــێ نــەبوو. جووتــه پێڵاوێکــی رەشی له چەرمی نەرمو لەو جۆره له پێ بوو که پیاوی پۆشتەو کەشخه کاتێ دەچنه تیاترۆ، یان خانمان کاتێ جلی شەو لەبەر دەکــەن، لــه پێــی دەکەن. دەستەبەرگێکی تاری لــەبەر بــوو. دەمو چــاوی وەکــوو جــاران زەرد بوو، وەکوو ئەو کاتەی دکتۆر (زۆکۆت) چاوی عەمەلیات کردو بۆی دانا یارکۆکی بخوا. بەڵام ئێستا، وەك ئەوە دیار بوو که دەمو چاوی

بە ئاوی گەرمو سابوون شووشتبیَ. وەکوو کەسانی خۆشگوزەران کە سەرو لەشیان دەشۆنو ناچار نین دەست پێوەبگرن.

(رۆبێر)، کە برادەرێکی تازەی (ترایان) بوو لە پاریس، گوتی:

-چوار هەزار کەس لە ناو هۆلن. هەرگیز، قەت هیچ کەس چوار هەزار کەسی لە کۆنفرانس نەدیوە. ئەمە شتێکی نائاساییە! چوار هەزار کەس هاتوون گوێ لە نووسەرێك بگرن. ئەمە سەرکەوتنێکی گەورەیە!!

(ترایان)، وەکوو نیشانەی سوپاس کردن، بزەیەکی بۆ برادەرە فڕەنسییەکەی کرد: ئینجا لە پلیکانەی مەڕمەڕی هۆلی کۆنفرانس بە سەرکەوت.

ئەو حەشامەتەی لە هۆلەکە چاوەڕێیان دەکرد (ماتیزی) ببینن، کشانەوە بۆ ئەوەی ڕێی بۆ بکەنەوە بڕوا. هەموو بە پەرۆشەوە تەماشایان دەکرد، هەناسەیان ڕاگرتبوو. (ماتیزی)، کاتێ دڕی بە خەملگەی هەوادارەکانی دا، هەستی کرد پێی لە دوو خۆی ڕادەکێشێ. لە سەردەمی بەندیدا، لەم ڕەوشتە ڕاهاتبوو. کاتێ بە پێلاوی بێ قەیتان دەڕۆیشتو ناچار بوو پێی لە دوو خۆی ڕابکێشێ بۆ ئەوەی نیوەچەکمەی گەورەو سەنگینی لە دەست نەدا. سوورهەڵگەڕا. هەوڵی دا بە شێوەی ئاسایی بڕواو چیتر پێلاوە جوانەکەی لە سەر زەوی ڕانەکێشێ. لە پشت پەردە پەڕییەوە بۆ ئەو هۆلەی کە کورسی گرانبەهای تێدابوو و کەوتبووە نزیك دەپی شانۆ. دەستەیەك

رۆژنامەنووس‌و وێنەگری فڕەنسی‌و بیانی، لەوێ، چاوەڕێیان دەکرد. (رۆمانی سەردەمی ئێستا) سەرنج‌و بایەخی، نەك تەنیا ئەدەبدۆستان، بەڵکو هی فەیلەسووف‌و سیاسەتمەدارو رۆحانی‌و مافناس‌و کۆمەڵناسانیشی بۆ خۆی راکێشا بوو.

(ترایان)، لە ناوەڕاستی ژوورەکە وەستا کە مۆبیلی مەخمەڵی سووری تێدا بوو. وەڵامی رۆژنامەنووسانی دەدایەوە.

گوتی:

-ئەگەر ئەم کتێبە بڵاوبۆتەوە، تەنیا بە پشتیوانی خوا بڵاوبۆتەوە. (رۆمانی سەردەمی ئێستا)، گێڕانەوەی ئەو رووداوانەیە کە دوای داگیرکرانی وڵاتەکەم، بەسەر خۆم هاتووە. لە زیندان دەستم بە نووسینی کرد. کاتێ پۆلیسی هێزەکانی ئەمریکا لە (ئەڵمانیا)، لەسەر راپۆرتێك، کە لەسەریان نووسیبووم گوایە کتێبێکم لە دژی ئەمریکا نووسیوە، ویستیان دووبارە بمگرن، دەستنووسەکەمم بە نوێنەری (ڤاتیکان) سپاردو بە نهێنی لە سنوور ئاودیو بووم. بە پێ هاتمە (پاریس). هیچ پێناسەم نەبوو. هیچ پارەم نەبوو پێی بژیم، کاری چاپی دەستم دەکرد. کاتێ دەستنووسەکەمم پێگەیشتەوە برادەرە نەمساوییەکەم وەری گێڕابوو بۆ ئەڵمانی، پێشانی فەیلەسووفێکی گەورەی فڕەنسیم دا، سەیدا خوێندییەوەو وای هەڵسەنگاند کە بەرهەمێکی لە ئاسایی بەدەرە. دایە بڵاوکەرێك‌و راسپاردەیەکی لەگەڵ دایە کە هیچ لایەنی دەست پێوەگرتنی تێدا رەچاو نەکردبوو. ئەمڕۆ،

(رۆمانی سەردەمی ئێستا) بۆ بیست‌و چوار زمان وەرگێڕدراوەو ئەگەر دابنێین هەر دانەیەکی فرۆشراوی چوار کەس خوێندوویانەتەوە مانای وایە تا ئێستا نزیکەی دە ملیۆن کەس کتێبەکەی منیان خوێندۆتەوە...

(رۆبێر) گوتی:

-با بڕۆین!

(ماتیزی) سڵاوی لە رۆژنامەنووسەکان کرد. کە چووە سەر دەپی شانۆ، خورتی لە خۆی کرد پێی لە دوو خۆی رانەکێشێ. کاتێ (ماتیزی) دەچووە لای ئەو مێزەی میکرۆفۆنی لەسەر بوو، چوار هەزار کەس چەپڵەیان بۆ لێدەدا. (ماتیزی) چەند چرکەیەك بە پێ وەستا. ئەمە ترۆپکی سەرکەوتن بوو. بیری کردەوە، ئەگەر باوکی، یان قەشەی (ئیزۆڤۆر) لەو چرکەساتەدا ببین، چەند شادو گوشاد دەبن. بەڵام رووس لە (ئیزڤۆر)و لە (بێسارابی)و لە سەراپای رۆمانیا بوون...

(ماتیزی)، بە پێوە لە پشت مێزێك وەستابوو، میکرۆفۆن‌و پەرداخە ئاوێکی لەسەر بوو، سەری دانەواندبوو، تەماشای زەوی دەکرد. خەڵکەکە بە گەرمی چەپڵەیان لێدەدا. (ماتیزی)، تەماشا سەعاتی زێڕی مەچەکی خۆی کرد. سەعات نۆو چارەکێك بوو. لەو کاتەدا، باوکی‌و هەموو خەڵکی (رۆمانیا) خۆیان بۆ نووستن ئامادە دەکەن. ئەوان، بەرلەوەی بچنە ناو جێ،، هەگبەی نانی شەوی لەبەر دەستی خۆیان دادەنێن بۆ ئەوەی، ئەگەر شەو پۆلیس بێن دەستگیریان بکەن‌و

ئەفەرۆزیان بکەن، شتێکیان هەبێ لە رێگای گوازرانەوەدا، بیخۆن. هەر ئەم شەوە، لەوانەیە...

چەپلە تا دەهات گەرمتر و گەرمتر دەبوو.

(رۆبێر) گوتی:

– سەرت نەختێ بۆ وێنەگران بلّند کە!

(ترایان) ویستی قسەکەی جێ بە جێ بکا، بەلاّم نەیتوانی. چاوی زیاتر دانەواند. سەری چەنەگەی، کەوتبووە سەر قەرەوێتەکەی.

(ترایان) دەیزانی ئەگەر لەو ساتەدا، چاو بلّند بکا، هۆلێکی پڕ لە تەقە تەق دەبینێ. چوار هەزار کەس بە پێوە دەبینێ قەرەپستانە دەکەن. بەلاّم تاکە کەسێ کە ئەو دەیەویست لە ناو هۆلەکەدا ببینێ، کە دەیەویست خەندەیەکی بۆ بکاو پێی بلّێ: (باوکە، سەرکەوتوو بووم!)، ئەو تاکە کەسە لەوێ نەبوو.

(رۆبێر) دووبارەی کردەوە:

–چاوت کەمێ بەرز کەوە! وێنەگران چاوەڕێ دەکەن.

(ماتیزی) گوتی:

–ناتوانم.

لەو هەزاران وێنەیەی (ماتیزی) کە لە کاتی بلاّوبوونەوەی (رۆمانی سەردەمی ئێستا)وە لە رۆژنامەکان بلاّوکرابوونەوە، (ماتیزی) سەری دانەوالدبوو. لە هەموو وێنەکان سەری دانەواندبوو. ئەو، دەیزانی ئەگەر چاوی بلّند بکا، لە بێگانان زیاتر کەس لەبەرامبەر خۆی نابینێ. ئەگەر چاوی بلّند بکا، –هەرگیز ئەوانە نابینێ– کە حەز دەکا بیانبینێ.

جا ئەگەر نەتوانێ ئەوانە ببینێ کە چاوی زۆر تامەزرۆی بینینیانە، چاو بڵند کردن بە کەڵ چ دێ.!؟

* * *

(ترایان)، بە درێژایی ماوەی کۆنفراسەکە، بە شێوەی ئاسایی سەری دانەواندبوو. کاتێ کۆنفراسەکە تەواو بوو، تەوازۆی بۆ برادەرە فڕەنسییەکەی هێنایەوە:

–سۆزی، ناتوانم بێم. خۆت دەزانی، من ئیش دەکەم.

(رۆبێر) گوتی:

–کەس ناچاری نەکردووی شەوو رۆژ کار بکەی! بەیانی، پێشوازییەکی گەورەمان لە شەرافەتی تۆ رێك خستووە. خەڵك حەز دەکەن بتبینن. وەرە، ئەگەر بۆ نیو سەعاتیش بێ. وەرە ئەوێ، هەندێ قسە بکە!

(ترایان) وەڵامی دایەوە:

–شتی وا ئەستەمە! ناتوانم بێم. دەبێ کار بکەم.

ئەو شەوە، (ترایان) بە تەنێ گەڕایەوە ماڵێ. هەرگیز شەو، کاری نەدەکرد. لەبەر چاوی، نەیدەتوانی لەبەر رووناکی گلۆپی کارەبایی کار بکا. ئیستا، دەیتوانی ڤیتامین بکڕێ. هەموو جۆرە ڤیتامینێکی دەخوارد، بەڵام بە تاریکی، چاوی نەدەدی! ئیتر شەو، لەبەر گلۆپی کارەبایی، کاری نەدەکرد. چونکە نەیدەتوانی بنووسێ. بە چاو نوقاوی، بیری لەو بەشە دەکردەوە کە دەیەویست رۆژی پاشی لەبەر رووناکی رۆژ

بینووسیّ. لە (ڕۆمانی سەردەمی ئیّستا) دا، باسی چوار ساڵی ژیانی خۆی کردبوو، ئەو چوار ساڵەی بە شیّوەی (سیستەماتیکی)، وەکوو ئەندامی (جۆریّك)ی تایبەتی، نەك وەك (تاکەکەسیّك) حوکم درابوو. ئینجا هەر بە شیّوەی (سیستەماتیکی) ئازاد کرابوو. باسی کاریگەری ئەو ژیانەی لە سەر ڕۆح‌و جەستەی خۆی کردبوو. .

(ماتیزی)، بەر لەو کارەساتە، پەیامنیّر بوو. لەو دە کتیّبەی ئەو کاتە نووسیبوونی، باسی کردبوو خەڵك چییان بەسەر هاتووە، خەڵك چییان لیّ قەوماوە. بەڵام کەس ناتوانیّ لە باتی یەکیّکی تر ئازار بخوا. کەس ناتوانیّ لە جیاتی یەکیّکی دیکە تیّبگا، کەسیش ناتوانیّ لە جیّی یەکیّکی دی هەست بکا. دەبیّ لە ناو هەمان ئازاری مرۆڤ بژی بۆ ئەوەی بتوانی باسی ئازارەکە بکەی. (ترایان)، کەسایەتی کتیّبەکانی پیّشووی نەبیّ، خۆی لە هەمان هەڵویّستدا نەدیبوو.

کاتیّ (پەیامنیّر لە کەنارەکانی دنی پیّستەر)ی دەنووسی، هەڵویّستیّ وەکوو هەڵویّستی (ئیّدی تاڵ)ی هونەرمەندی جوولەکە نەبووکە کلیّسەی کردبوو بە تیاترۆ. وەکوو هەڵویّستی (سیلیڤیا) نەبوو کاتی چوو خواردن بیّنیّ ئەویش لەگەڵیا چوو و کاتیّ قۆڵ لە ناو قۆڵ لە جادە دەپەڕینەوە، چرك‌و هۆڕ دەلەرزی.. پەیامنیّر یەك گۆشەنیگای هەیە. چی دەبینیّ، ئەوە دەنووسیّ. ئەوەندەو بەس! تەنیا ئەوەی دەبینیّ. (ترایان) کاتیّ وەکوو (جۆر)ە تاکە کەسیّك گیرا، کاتیّ لە ناو ڕکەویّکی شیشە داغ تەقەلای دەداو یەکیّ بوو لە قوربانییەکانی ساتی

ئێستا، تێگەیشت گۆشەنیگای دووەمو سێیەمیش هەن. هەموو گۆشە نیگاکان، هەرچەند پێچەوانە بن، واقیعین. هەموو راستن. هەرگیز یەك گۆشەنیگای تاك نییە!!

دوای کارەساتی ترسناکی (ساتی ئێستا)، (ماتیزی) سەرلەبەری رووداوەکانی کتێبەکانی پێشووی خۆی هێناو جارێکی تر لە رۆمانێکدا لێکی دان بە ناوی (گۆشە نیگای دووەم).

(ترایان ماتیزی)، لە بیستو دوو سالێدا، کلێسەیەکی لە (کیشینف)، دیوە کراوە بە شانۆ. تیپێکی جوولەکەی رۆمانی، لەم کلێسەیەدا، دەوریان گێڕاوە. (ماتیزی)، کوڕی قەشەی (ئیزفۆر) قینی لەمە جۆشاوە. زۆر قینی جۆشاوە! لە (پەیامنێر لە کەنارەکانی دنی یێستەر)دا، لە دژی هونەرمەندی ئالوودەکاری نووسیوە. یانی تەنیا یەك گۆشە نیگای هەبووە: رکو قین لەو کەسانەی مالێ خودا رادەگێڕن. کاتێ کە جەنگ کۆتایی هاتو لە سەرانسەری ئەورووپادا، سنوورەکان وەکو دیواربەندی بلند داتەپینو کاتێ لەم ئەورووپایەدا، مرۆڤ، وەکوو لە دەشتێکی هەراو بێ، بە روونی شتی دەدی، تێگەیشت ئەو تیپە جوولەکەیەی کلێسەی (کیشینف)یان ئالوودە کردبوو، دەستەیەکی ئالوودەکار نەبوون پیشەیان ئالوودەکردن بێ. ئەمانە، تەنیا کەسانی بێچارە بوون، پەنایان بۆ رووسەکان بردبوو بۆ ئەوەی نەکەونە ناو کوورەی سووتاندنی بنیادەم کە جوولەکەکانی ئەورووپای ناوەڕاستی تێدا دەمردن. ئەوانە

کۆمۆنیستیش نەبوون. تەنیا کۆمەڵە (بێچارە)یەك بوون لە پێناوی ژیانی خۆیان دەجەنگان.

ئەم جوولەکانە، نزیکەی وەکوو هەموو جوولەکەیەك، بەشداری جەنگی دووەمی جیهانییان نەکردبوو و نەببوون بە هاوپەیمانی رووسەکان بۆ ئەوەی کۆلۆنییەکانیان، نیشتمانیان یان سەربەخۆیی نەتەوایەتی خۆیان بپارێزن، ئەوان، تەنیا لە پێناوی ژیانی خۆیان دەجەنگان، تەنیا لە پێناوی ژیانی خۆیانو بەس!!

(ماتیزی)، لە (گۆشەنیگای دووەمدا)، بەرگری لە ئالوودەکاران دەکا...

ئەو شەوە، کە هات بخەوێ، بیری لای چوار هەزار گوێگرەکەی هۆلی کۆنفرانس نەبوو، بیری هەر لای خانەوادەکەی بوو، کە ئەگەر لە ژیاندا مابن، دەبێ ئێستا لەسەر رێیان گەوشەكو سەرگەردان بن. بیری لای ئەو کلێسەیە بوو کە کرابوو بە شانۆ، بیری لەو بەشەی کتێبەکە دەکردەوە کە دەبوایە رۆژی پاشی بینووسێ. ئینجا خەوت.

سەعات پێنجی بەیانی، سەعاتی زەنگداری سەر مێزی وەزینە، کە چەرمێکی تەنکی پێدادرابوو، لێیدا. (ماتیزی) هەستا، قاوەی لێنا، شەکری هەبوو، بەڵام لە ماوەی ساڵانی بەندیدا، قاوەی بێ شەکری دەخواردەوەو لە قاوەی تاڵ راهاتبوو. ئیتر قاوەی بە شەکری پێ نەدەخورایەوە.

ئـەو نامانـەی هـەڵگرت کـە ژنـەی دەرگـەوان لـە بـن دەرگـاوە هاویشـتبوویە ژووریٚو لـە هەیوانەکـەی دانـا. نەیدەویسـت پـێش تەواوکردنی دەستنووسـی کتێبـەکانی پێشـووی، تـامی میـوەی ناسـکی شانازی بکا. وەڵامی هیچ داوەتێکی نەدەدایەوە. لە سەرێکی تریشـەوە، هەر کاتیٚ پێی دەنایە ماڵێك، خەفەتخان دەبوو. بـە بـیری دەهاتـەوە کـە ئێستا، کەس‌و کارەکەی ماڵیان نییـە. خەفـەتی بـە جامخانـەی پـێڵاوان دەخوارد، دەیزانی ئێستا کەس‌و کارەکەی لە (رۆمانیا)، پێڵاویان نییـە. چەکمەی لاستیك لە پیٚ دەکـەن وەك ئەوانـەی لـە رووسـیا دیبـووی. (ترایان)، کە قەپی لە پارچە چوکلاتێك دەدا، بیری دەکردەوە، منـداڵی مەوسوولانی لیٚ دەرچیٚ، منداڵی بیست ملیۆن هـاوڵاتی لـە چـوکلات بێبەشن.

(مالیزی) تا ساتی فراوین خـەریکی نووسـین‌و مـۆز خـواردن بوو. کـە دەینووسی، قەڵەمداری بە دەستی راستەوەو مۆزی بـە دەسـتی چـەپەوە بوو، وەکوو ئەو (ترایان)ەی کاتیٚ لە (هایدلبێرگ)، (رۆمانی سەردەمی ئێسـتا)ی دەنووسـی، قـەپاڵی لـە یـارکۆکی دەدا تـا چـاوەکانی لـە کوێربوون نەجات بدا.

(ترایان) بە پەلە دەینووسـی. هەسـتی وەکـو ئـەو کاتـە بـوو کـە لـە (زاگریب) بوو. وای هەست دەکرد یەکیٚ دەیەویٚ قەڵـەمی لـە چـنگ راپسکێنیٚ. چووبووە لای دختۆرەکـان، دەیەویسـت لـەو ترسـە، لـەو کەوەڕێیە دەربچیٚ. بەڵام هیچ دەرمانێك دادی نەدا. کـاتیٚ دەینووسـی،

قەڵەمداری لە بەینی ئەنگوستەکانی دەگوشی، بۆ ئەوەی لە دەستی رانەرفێنن. بە هۆی ئەم رەوشتەوە کە لە حانی کارکردندا، لە ترسان، قەڵەدارەکەی لە بەینی پەنجەکانی رادەگوشی، پەنجەی دۆشاومژەی دەستی راستەی هەمووی ببوو بە مردە...

* * *

کاری دژوار سێ ساڵ درێژەی کێشا.

(گۆشەنیگای دووەم) کەوتە کتێبخانەکانەوە. ئەو بەیانییەی تەتەر یەکەم دانەی بۆ هێنا، (ترایان)، وەکوو هەمیشە، سەعات پێنج لە خەو هەستابوو. لێ راهاتبوو. بەڵام ئەو رۆژە هیچ کاری نەمابوو.

دەستی بە بەرگی کتێبەکە داهێنا، ئەمەیە شانازی راستەقینەی، نەك چەپڵەلێدانو نەك وێنەکانی لە رۆژنامەکان بلاو دەبوونەوە. شانازیی، سەرکەوتنی راستەقینەی، ئەم کتێبەیە کە ستەمکارو ستەمدیدەی تێدا بە شێوەیەکی مرۆڤایەتی ، بە یەکسانی، پێشان داوە.

دەیزانی لەوانەیە، پارتیزانەکان، کە (کششینیڤ)یان سووتاند، ئێستا، لەو کاتەدا، لە (رۆمانیا)، خانەوادەکەی ئەشکەنجە بدەن. لەبەر ئەوەی ئێستا ئەوان، فەرمانڕەوای رۆمانیان. خەڵ ئەشکەنجە دەدەن. لەگەڵ ئەوەیشدا، (ماتیزی) قینی بەرامبەریان نەبوو. تەنیا بەزەیی پێدا دەهاتنەوە. ئەم بەزەییە، گەورەترین سەرکەوتنی بوو، سەرکەوتنی راستەقینەی بوو. تەنیا قەشەو شاعیر ئەم سەرکەوتنەیان هەیە.

(ماتیزی)، کتێبەکەی بە دەستەوە بوو، پەنجەرەی بە تەواوی کردەوە.

گوتی:

-ئێستا پشوو دەدەم. بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا، دەمەوێ پشوو بدەم. ئیتر...

ماڵی لە پەرگەی پاریس بوو، لە دەروازەی (سان کلو). بۆنی لێری بۆ دەهات. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. تەماشای شاری کرد. کتێبەکەی توند بە سینگییەوە قرساند.

لەو کاتەدا، تەلەفۆن لێیدا. دوازدە کەس زیاتر ژمارەی تەلەفۆنی ئەمیان نەبوو. بە دەگمەن تەلەفۆن لێیدەدا. (ترایان)، بە دەگمەن وەڵامی دەدایەوە. بەڵام ئەمڕۆ، دەیتوانی وەڵام بداتەوە. (گۆشەنیگای دووەم) تەواو ببوو. (ترایان) دەسکی تەلەفۆنی هەڵگرت، شاد بوو. لەو سەرەوە، سەیدا لەسەر تێل بوو.

دەنگی تیژو لەرزانی سەیدا هات، گوتی:

- (ماتیزی)، شێکی زۆر خراپ هەیە!

لەگەڵ هەر وشەیەکدا، دەنگی تیژتر دەبوو. دەلەرزی. دەتگوت دەخنکێ.

-شتێکی زۆر خراپ! تا بڵێی خراپ!! دەبێ هەر ئێستا بتبینم. ئێستا چاوەڕێت دەکەم.

## (٣١)

(ترایان ماتیزی)، دەستی بە لەبەر کردنی جلەکانی کرد. دۆلاَبەکەی کردەوە کە زۆر دەستەبەرگی تێدا بوو. بە ڕێكوپێکی لەسەر ڕەفەکان دانرابوون. هەموو دەستە بەرگەکانی ڕەنگیان تاری بوو. هەموویشیان نرتو نوو بوون. تەنانەت ئەو دەستەبەرگو ئەو پێلاَوانەی سێ ساڵ بوکڕیبوونی، هەموو نوێ بوون. هەرگیز لەبەر نەکرابوون. (ترایان) نەدەچووە هیچ شوێنێ. دوای درەوشانەوەی سەرکەوتنەکانی، بە کراسێکی خوریو پانتۆڵێکی کارو بە پاپووچ، ڕۆژی لە ماڵەوە دەقەتاند. هەموو ڕۆژێ، بەرگی کاری لەبەر دەکرد.

نیو سەعات بوو، سەیدا تەلەفۆنی کردبوو، (ترایان) هێشتا بە ڕێ نەکەوتبوو.، هێشتا لە ماڵەوە بوو. (ترایان)، کە تەماشای سەعاتی کرد، لە خۆی تەریق بووەوە. بیری کردەوە: ئاخۆ دەبێ لە خۆخەفتنی زۆرو و جل لەبەر کردنی بەکاوەخۆی، زیاتر هی تەمسەریو بێ باکی نەبێ؟

(ترایان) کتێبێکی بیر کەوتەوە ژنێکی ئینگلیزی پەیکەرتاش نووسیبووی کە لە ساڵانی هەوەڵی دوای شۆڕشی سۆڤێتی چووبووە

(یو. ئار. ئێس. ئێس-کۆمـارە سۆشیالـستەکانی یـەکێتی سـۆڤێت) بـۆ ئەوەی وێنەی دەمو چاوو پەیکەری تا پشدێنی سەرۆکە شۆرشـگێڕەکان دروست بکا. دەیەویـست دەربڕینـی دەمو چـاویان پێشـان بـدا. بـەڵام ئەستەم بـوو دەربڕینێکیـان لــە روودا بدۆزێتـەوە. یـەکێ لــە سـەرۆکە بۆلشەفیکەکان هێمانی وەکوو نموونە، بەرامبەری دانیشت، دەسـتەکانی تێك هەڵکێشاو هیچ جوولەی نەکرد. رۆژێ، ژنـەی ئینگلیـز، حـەفت سەعات، بێ وچان، کاری کرد. بێ یەك خولـەك پشـوو. لـەم حـەفت سەعاتەدا، سەرۆکە شۆڕشگێڕەکە هیچ نـەبزووت. لێـوی نەجوولانـد. هـیچ نیشـانەی بـێ سـەبریی لێدەرنەکـەوت. دەتگـوت بـەردە. هـیچ دەربڕینێکی لە دەمو چاودا نەبوو. هیچ خۆی نەدەجوولاندەوە.

ژنەی ئینگلیز کە پەرتەکی بڕا، پرسی:

-چۆن دەتوانی ئاوها وەك بەرد، بێ جوولە دابنیشی؟

کابرای شۆرشگێڕ، بێ ئەوەی دەموچاوی هیچ بگـۆڕێ، بـێ ئـەوەی شێوەکەی هیچ گۆڕانی بەسەردا بێ، بێ دەستی خۆی، لێوی جوولانـد. گوتی:

-مـن بیسـت سـاڵ لــە زینـدان بـووم. بیسـت سـاڵ! بـە تـەنیا لـە سلوولـەکەم بەند بووم. فێر بووم نەجوولێمو چاوەڕێ بکەم.

ئینجا بێدەنگ بوو...

(ترايان ماتيزى)يش لـه زيندان راهاتبوو هەموو كارێ بە پشـوودرێژى، بە وردى، دەكردو چاوەڕێى دەكرد. مرۆ لـه زيندان نەبێ ئەم شتانە فێـر نابێ. ئەمانە تاكە شتى چاكن كە مرۆ لـه زيندان فێريان دەبـێ. هەوەسـى پێدەهات ئەو رەوشتانەى لـه زيندان وەرگرتبوو.

تەنانەت كاتێ چووە نووزگەى سەيدايش هەر ئارام بوو. بە قەدەر ئـەو كاتە ئارام بوو كە وەلامى تەلـەفۆنەكـەى دايـەوە، يـان كەرەوێتەكـەى بەست. بە قەد ئەو كاتە ئارام بوو كە هاماجى نێوان پەرِگەى پاريس، كە مالًى لێ بوو و گەرِەكى لاتينى تەى دەكرد، كە سەيدا لــەوێ چـاوەرِێى دەكرد،

سەيدا گوتى:

-بۆ بابەتێكى تا بلێى دەرەك داوام كردووى. تا بلێى دەرەك!

سەيدا دەلـەرزى. دەنگى دەلـەرزى. (ترايان) دەيزانـى كـاتێ مـرۆ زۆر دەهرى بێ، وەكوو ئەو ساتەى سەيدا، تا بچووكترين خانەى لـەشـى ژان دەكاو ئەمە ئازارێكى زۆر گەورەيە!. (ماتيزى) بەزەيى بزووت. سـەيدا هەرگيز زيندانى نەببوو. فێرى ئارامى نەببوو. مرۆ ئەمە لــە زينـدان فێـر دەبێ! سەيدا رەبەلى ببوو و ئازارى دەخوارد. سەيدايش، ئەگەر حـەپس بكرايە ، فێرى ئارامگرتن دەبوو.

سەيدا گوتى:

-من لـه دژوارترين دۆخى ژيانمدام. شتەكە زۆر خەبارە، زۆر!!

(ماتیزی)، سەیدای زۆر خۆش دەویست.حەزی نەدەکرد ئەزیەت بخوا. بەڵام نەیدەزانی چۆن؟

-کاتێ کتێبی (رۆمانی سەردەمی ئێستا)ت بۆ هێنام، بۆچی پێت نەگوتم پێشتر هەندێ کتێبی فاشستیت نووسیوە.؟

(ماتیزی) گوتی:

کتێبی فاشستی نەبوون. بەرهەمی سەردەمی گەنجێتی بوون. بەر لە بیست و پێنج ساڵ نووسراون. بۆیە بۆم باس نەکردی، چونکە لای من هیچ نرخیان نەبوو.

سەیدا گوتی:

-ئەو کارەی تۆ کردووتە کارێکی کرێت و ترسناکە!. حوکمدرانی لەسەرە. ئەم کتێبانە وا دەکەن بەینم لەگەڵ تۆ نەمێنێ. ناچارم بەرامبەر رای گشتی باست بکەم. دۆخی رەوشتپەروەریم، هەڵوێستم، هەموو ناچارم دەکەن بەم جۆرە بجوولێمەوە.. تۆ دەرفەتت لە نیازپاکیی من وەرگرتووە. کوو توانیت شتی وا بکەی؟ دان پێدا دەنێم، سووچی خۆمە. من زۆر خۆشباوەڕ و زۆر ساویلکەم. زۆر ساویلکەم. زۆر !!...

(ماتیزی) ویستی وەڵام بداتەوە، بەڵام سەیدا زۆر بە تووڕەیی بەردەوام بوو:

-دان پێدا دەنێی کتێبێکی سێ سەد لاپەڕەییت بە ناوی (پەیامنێر لە کەنارەکانی دنی پێستەر)و کتێبێکی ترت بە ناوی (جەنگی (کریمی) )و کتێبێکی دیکەت بە ناوی (جەنگ لە ناو ناقوورێکدا) بڵاو کردۆتەوە؟

(ماتیزی) گوتی:

- بەڵێ. دان پێدا دەنێم!!

سەیدا پرسی:

-بۆچی ئەمانەت لە من شاردۆتەوە؟

(ترایان) گوتی:

-من نەمشاردوونەتەوە. بۆیە بۆم باس نەکردووی چونکە ئەو ئەزیەتە ناهێنێ! یەکەم کتێبی سەردەمی پێگەیشتنم (ڕۆمانی سەردەمی ئێستا)یە. تۆ خۆت چەند وتارێکت لە بارەی کتێبەکانم نووسیوە. چەند کۆڕت لەسەر کردوونو هەر بە چاکە باست کردوونو پێت هەڵگوتوون!

سەیدا گوتی:

- ئەمەیە هەڵوێستەکە ئاڵۆز دەکا. هەست دەکەم تێکەوتووم. من چەند وتارێکی لە ڕادەبەدەر پیاهەڵدانم لەسەر ڕۆمانەکەت نووسیوە. مەترسییەکە لێرەدایە! بێ ئەوەی سازش لەسەر پیاهەڵدانی بکەم، قسەم لەسەر کتێبەکەت کردووە. هەڵەی من ئەوەیە لە ڕابردووی تۆم نەکۆڵیوەتەوە. ئەگەر ئاگام لە ڕابردووی تۆ بوایە، قەتاو قەت یەك دێرم لەسەر (ڕۆمانی سەردەمی ئێستا) نەدەنووسی.

(ماتیزی) پرسی:

-باشە، ئێستا ڕات لە (ڕۆمانی سەردەمی ئێستا) نییە؟ کە ئەوە سێ ساڵە، سەری زمانو بنی زمانت پیاهەڵدانی ئەم ڕۆمانەیە؟

سەیدا، لە ڕکان، هەموو گیانی لەرزی.

(ماتیزی) گوتی:

-ئەمڕۆ تووڕەی، دەتوانین جارێکی تر قسەی لەسەر بکەین.

سەیدا گوتی:

-کاتم نییە چاوەڕێ بکەم. هەر ئەمڕۆ ڕاگەیاندن ئاگادار دەکەمەوە کە من ئیتر دەستەبەری تۆ نیم. کە تۆ منت تەفرە داوە،کە هەموو ئەوەی لەسەر ڕۆمانەکەی تۆم نووسیوە، بەر لەوەی رابردووی تۆ بزانم، نووسیومە! ئێستا کە رابردووت دەزانم، پەشیمانم ئەو شتانەم نووسیوە. لە هەموو شتێ پەشیمانم!

(ماتیزی) گوتی:

-من ئەگەر کتێبێکم پێ باش بێ. بە شەوقەوە دەیخوێنمەوە، بە ستایشەوە باسی دەکەم. کەیفم پێدێ‌و بە شتێکی بەرزی تەماشا دەکەم. بێ ئەوەی لە رابردووی نووسەرەکەی بکۆڵمەوە. ئەگەر رام لە کتێبێك بێ‌و پاشان بۆم دەربکەوێ نووسەرەکەی تەڵەکەباز بووە، کتێبەکەم هەر پێ خۆشە، لەبەر چاوم ناکەوێ! ئەگەر تابلۆیەك جوان بێ، با ئەوەی کێشاوییە دزی دیواربڕیش بێ، هەر کەیفم پێ دێ... تەنانەت زۆرم بەلاوە خۆشە کە بزانم کابرایەکی قاچاغ خۆی پێگەیاندووەو شاکارێکی بەرهەم هێناوە. بەر لەوەو بزانم (ژید) کەچرەفتار بوو و دوای ئەوەی زانیشم، حەزم لە بەرهەمەکانی بووە. دوای ئەوەی زانیم (ڤرلێن) زیندانی بووەو بەدرەفتاری لەگەڵ ژنەکەی کردووە، هەر حەزم لە بەرهەمەکانی بووە.

سەیدا گوتی:

-بەش بە حاڵی تۆ، دۆخەکە خراپترە! ئەوەندە خەبارترە بەراورد ناکرێ. حاڵەتی تۆ، لە رابەدەر ترسناکە. ئەو تاوانەی دراوەتە پاڵ تۆ لایەنی سیاسی هەیە. تێگەیشتی؟ (سیاسی)! ئەمە لە رادەبەدەر دەرەکە لە (پەیامنێر لە کەنارەکانی دنی یێستەر)دا، تۆ بە ستایشەوە باسی ئەلمانەکانت کردووە. سەیر کە! وەرگێڕانی ئەو بەشەم لایە کە پێ تاوانبار کراوی. تۆ کە لە (رۆمانی سەردەمی ئێستا)دا، مەحتی مرۆڤ دەکەی‌و بەرگری لە تاکە کەس دەکەی، لە کتێبەکانی پێشووتدا، وەکو لایەنگری ئەلمانەکان قسە دەکەی. بە ئاشکرا بڵێین، ئەمە زۆر ترسناکە: باس کردنی ئەلمانەکان بە چاکە، شتێکی زۆر ترسناکە...

سەیدا، چەند پەڕەیەکی لە دۆسییەیەك دەرهێنا. وەرگێڕانی فڕەنسی چەند رستەیەکی (پەیامنێر لە کەنارەکانی دنی یێستەر) بوو. بە دەنگی بەرز خوێندییەوە.

(ترایان ماتیزی) ئەو بەشەی بە بیر هاتەوە کە بە باشە، باسی سەربازانی ئەلمانی، رزگارکەرانی ولاتەکەی، کردبوو. ئەوەبوو (ترایان) لە (بالتزی) تووشیان هات‌و داوای (ئاویوایس-روخسەتی)ی لێ کردن یەکەم لۆری سەربازیی هات، بۆی رابگرن، سواری ببێ. ئەمە یەکەمین پەیوەندی‌و دواپەیوەندی (ماتیزی) بوو لەگەڵ ئەلمانەکان. ئەو ئەلمانانەی دەیناسین‌و لە کتێبەکەیدا باسی کردبوون، پۆلیسی هات‌وچۆی ئەلمانی بوون لە (بالتزی)... (ترایان)) یادێکی باشی ئەو پیاوانەی لەلا مابوو. ئەو شەوە، لە (بالتزی)، چاکەیەکی گەورەیان لەگەڵ کرد..

سەیدا پرسی:

-باس کردنی جەندرمەی ئەلمانی بە باشە، بە شتێکی ترسناك نازانی؟!

(ماتیزی) گوتی:

- نا. ئەو شەوە، ئەو سەربازانە هەرچی ترومبێل تێدەپەڕی، رایاندەگرت و داوایان لێ دەکرد هەڵمبگرێ. تا بڵێی میهرەبان بوون.

-چۆن پیاوێکی هەست ناسکی وەکوو تۆ، شاعیر، نووسەر، دەتوانێ بە باشە باسی سەربازی نازی بکا؟ ئەمە مرۆڤ کاس دەکا، باوەڕ ناکرێ!.

سەربازانی ئەلمانی خاکی نیشتمانی منیان لە داگیرکەرانی سۆڤێتی رزگار کردبوو. ئەو سەربازە ئەلمانیانەی لە فڕەنسا داگیرکەر بوون، لە (بێسارابی) رزگارکەر بوون...

سەیدا گوتی:

-دەشێ! دەشێ! بەڵام من بە شتێکی ترسناکی دەزانم یەکێ بتوانێ ستایشی ئەلمانەکان بکا. بە هەر حاڵ تۆ دەبوایە بۆم باس بکەی کە ئەم کتێبانەت هەیە. بۆ باست نەکردووە؟!

(ماتیزی) گوتی:

-سەیدا، پەندێك هەیە دەڵێ :(لە ماڵی کەسێ لە سێدارە درابێ، هەرگیز نابێ باسی پەت بکەی...) ئەگەر باسی ئەلمانەکانم بۆ کردبای، بۆ من جوان نەبوو. بێ وێڵی بوو باسی ئەلمانەکان بۆ تۆ بکەم!. ئەلمانەکان داگیرکەری وڵاتی تۆ بوون. زۆریان خراپە لەگەڵ ئەو وڵاتە دڵکێشە کردبوو! خوێنی فڕەنسییەکانیان لەسەر خاکی ناسك و بۆنداری

(سان لوی) رشتبوو. من ئەمە دەزانم‌و وەکوو هەموو رۆمانییەکان هەست بە ئازاری فرەنسییەکان دەکەم. لەوەتی سەربازانی ئەلمانی ولاتی ئێوەیان داگیر کردووە، من خەفەتیان لێ دەخۆم.. بەلام هەر ئەو سەربازانەی کە ولاتی ئێوەیان داگیرکرد، ولاتی منیان لە داگیرکردنی سۆڤێتی رزگار کرد. (هەمان) سەرباز! شتێکی دیکەیش هەیە: من ئەگەر باسی ئەلمانەکانم بکردایە، دەبوایە باسی رووسەکانیش بکەم کە هاوپەیمانی ئێوە بوون، بەلام ولاتی منیان نوقمی خوێن‌و ناکامی کردبوو...ئەو کاتە ئەنگۆ برای سەنگەرو هاوپەیمانی سەربازانی سۆڤێتی بوون کە خەلکی (بێسارابی)یان قەتل‌و عام کرد...

سەیدا گوتی:

-تۆ لە کتێبەکانتدا، بۆچوونێکی سیاسیت هەیە.. تۆ لایەنگری (تەوەر-محور)ی. لایەنگری ئەلمانەکانی!.

-من دژی لەشکری سۆڤێتی بووم کە ولاتەکەمی داگیر کردبوو.

سەیدا گوتی:

- بە هەر حالێ من ناچارم ئاگادارییەك لە راگەیاندن بلاو بکەمەوە. من چیتر دەستەبەری کەسێتی تۆ ناکەم. کتێبەکانی پێشووت هەندێ لاپەڕەی ئەرنۆیان تێدایە. ئەمە بە روون‌و ئاشکرایی رەفتارێکی زۆر ترسناك‌و بەرشکە!!

-ئەو کتێبانەی پێش بیست و پێنج ساڵ نووسیومن هەندێ لاپەڕەی بوغزو ڤینیان بەرامبەر داگیرکەری بێگانە تێدایە. ئەم بۆچوونە، نە ترسناکەو نە بەرشکە!!. کاتێ فڕەنسییەکان بەرامبەر داگیرکردنی ئەلمانەکان راستبوونەوە، ئایا بۆچوونەکەیان ترسناك و بەرشك بوو.؟ بۆچوونی منیش بەرامبەر داگیرکەرانی وڵاتەکەم، ترسناك و بەرشك نەبوو. من شەرمم بەم بۆچوونە نییە!!. نا. ئەوە، ترسناك و بەرشك بوو بۆ من، ئەگەر ڤینم لە داگیرکەرانی وڵاتەکەم نەجۆشایە، یان کلکم لەگەڵ داگیرکەران، (واتە لەگەڵ رووسەکان) بکردایە یەك! ئەوە، ترسناك و بەرشك بوو، کاتێ میحرابی خودام بێ رێزی بەرامبەر کرا، ڤینم نەجۆشابایە!! سەیدا، من ئەمەم بە لاوە ترسناك و بەرشك بوو!.

- ناکۆکییەکی تەواو لە نێوان کتێبەکانی هەوەڵت و (رۆمانی سەردەمی ئێستا)دا هەیە کە مرۆڤ بە چاك و تێگەیشتوو پێشان دەدەی.. مرۆ بە خەیاڵی دانایە کە هەمان مرۆڤ بەر لە (رۆمانی سەردەمی ئێستا) توانیبێتی ئەوکتێبانە بنووسێ بەناوی (پەیامنێر لە کەنارەکانی دنی یێستەر)و (جەنگ لەناو ناقوورێك)و (جەنگی کریمێ). (هەمان) مرۆڤ!! شتی وا بە خەیاڵدا نایە.

- سەیدا، تۆ بۆچی پرسیار ناکەی چۆن یوزباشی رۆمانی، فەرماندە (پۆل) ، توانیویەتی باشترین ئینجیل بە ناوی (پیر یۆل) بنووسێ؟ دەزانی بۆچی شتەکە لەگوینە؟ لەبەر ئەوەی مرۆڤ لەسەر رێگای (داماس-شام)دا دەڕوا – هەروەها لەبەر ئەوەی بە بەندیخانەو دەسگیرکرانی

سەردەمی ئێستادا دەڕوا. من لە رابردوودا، وەکوو گەنجێکی ئاسایی رەفتارم کردووە.! هیچ چالاکییەکی سیاسیم نەبووە. خاکی ولآتی خۆم، خانەوادەی خۆم، ئەو کلێسەیەم خۆشویستووە کە تێیدا فێری دوعاو نوێژ بووم. ئەمە هیچ سیاسەت نییەو هیچی تێدا بەستە نییە!! رقو بەرگریشم لە دژی لەشکری بێگانەی داگیرکەر، سیاسەت نییە!.. رکبوونەوە لە ئالوودەکارانی کلێسەو لە تیرۆریستان کارێکی سیاسی نییە!،

لە دەرگا درا. (ماتیزی) کەیفی ساز بوو کە یەکێ هات کۆتایی بە گفتوگۆکە دێنێ. خزمەتکارێك هات. رۆژنامەکانی نیوەڕۆی پێبوو. سەیدا، لە لاپەڕەی یەکەمدا، راگەیاندنی دابڕانی خۆی لە نووسەری (رۆمانی سەردەمی ئیستا) خوێندەوە. پەشیمانی دەربڕیبوو کە بە ستایشەوە باسی کردووە. پەشێمان بوو کە بەر لەوەی ئاگاداری پێشینەی نووسەرەکە بێ، بە کتێبەکەی هەلگوتووە.

سەیدا هێور بووەوە. شاد بوو کە دیتی روون کردنەوەکەی لە لاپەڕەی یەکەمی (پاریس پرێس)، لەسەر چوار ستوون بلآوکراوەتەوە.

سەیدا، سەری بۆ لای (ماتیزی) سووڕاندو گوتی:

–ئەی ئێستا بە تەمای چ بکەی؟

(ماتیزی) گوتی:

– هیچ!

سەیدا گوتی:

– کوو هیچ؟! دەبێ شتێ بکەی. دەبێ شتەکە بە درۆ بخەیتەوە. دەبێ نکوولی لە کتێبەکانی پێشووت بکەی. دەبێ پەشیمانی دەربـبڕی. دەبـێ پەشـیمان بیتـەوە. پەشـێمان بیتـەوە کـە ئـەو شـتەت بلاّوکردۆتـەوە.! (پەشیمانی)! ئەویش زۆر خێرا.. هەر ئەمڕۆ، هەر ئێستا.

(ماتیزی) گوتی:

– من هیچـم نییـە بـە درۆی بخەمـەوە. هـیچ!! هەڵوێـستەکە روون و ئاشکرایە! ئەگەر من فەڕەنسی بوومایەو بە ستایشـەوە باسـی سـەربازانی هاتو چۆی ئەلمانیم بکردایە، رەنگە خاین بوومایە!. بەلاّم من باسی ئـەو ئەلمانانەم کردووە کە یارمەتی ئێمـەیان داوە ولاّتەکـەمان لـە ژێـر نـیری بێگانە رزگار بکەین. ئەگەر ستایشی سەربازانی سۆڤێتی، یان هاوڕێکانی ئەوانم بکردایە ، خاین بووم. چ هەیە بە درۆی بخەمـەوە؟ ئـەوە بـە درۆ بخەمەوە کە لە تەمەنی بیستو یەك ساڵیدا، کاتێ دیم کلێسە کراوەتـە تیاترۆ، تووڕە بووم؟ ئەمە کارێکی ترسناکە. تووڕەبـوونی مـن لـە جێـی خۆیەتی

سەیدا گوتی:

–ئاوها ناڕوا. تۆ (دەبێ) شتێ بکەی.

(ماتیزی) گوتی:

–هیچ ناکەم!

ئەو دەیزانی کە تووڕە بووە مانای وایە کارێکی ئاسایی کردووە. کە چـارەنووس (ترایـان)ی ناچـار کـرد سـەر لـە دیـوار بکـوتێ و بـەرەو

سورگومی رایانکێشا، لە مانای واقیعەکانی تر گەیشت. تێگەیشت، جگە لە گۆشە نیگای کتیبەکانی پێشووی، گۆشە نیگای تریش هەن. راستە، ئەمانە گۆشە نیگای دوژمنن، گۆشە نیگای ئالوودەکارانن! بەلام (ترایان)، بە دەردو ئازار، ڤال ببوو. گۆشەی نیگاکانی تری دۆزیبووەوە.. ئیتر (رۆمانی سەردەمی ئێستا)و (گۆشەنیگای دووەم)ی نووسی کە تەنانەت بە بەزەیی باسی ئالوودەکارانی کلێسە دەکا. ئەو دەردەسەرییەی سالانی بووری چەشتبووی، مانایەکی تازەیان بە شتەکان بەخشی بوو. هەمان بەزەیی بەرامبەر سەیدایش هەبوو، کە وەکوو سەردەمی تەمەنی بیستو دووسالیی ئەم، پێی وابوو تەنیا یەك گۆشەنیگا هەیە.

راستەڤینەی مرۆڤایەتی شتێکی رێژەییە. هەروەها هەموو گۆشەنیگاکانی مرۆڤیش. گۆشەنیگای تەواو رەها نییە. راستەڤینەی رەها سیفەتی تایبەتی خودایە.

سەیدا، سەیدای دانا، بە سووربوونەوە پێی دادەگرت کە تەنیا راستەڤینەی ئەمو گۆشەنیگای ئەم، دروستو ژیرانەن. ئەگەر سەیدایش ئازارەکانی (سەردەمی ئێستا)ی بچەشتبایە، پێدەکەوت کە گۆشە نیگای دووەمو گۆشە نیگای سێیەمیش هەن. بۆی دەردەکەوت هەموو گۆشە نیگا مرۆڤایەتییەکان، تەنانەت، ئەگەر بە چاو، مۆکلەی یەکتریش بن، وەکو یەك راستن! بەلام سەیدا بڕوای تەنیا بە گۆشەنیگای خۆی هەبوو. بێ ئەوەی دەستی (ماتیزی) بگوشێ، بێ ئەوەی خوا حافیزی لێ بکا، رۆیشتو لە دوای خۆیەوە، رنگ!! دەرگای لێکدا. ..

(ماتیزی) رۆیشت. کاتێ کە لە نووزگـە دەرچـوو، لەسـەرەخۆ، بـە هێدی دەرگای پێوەدا. وەکوو سەیدا رنگ!! لێکی نـەدا. بـە ئـارامیش رێگای گەڕانەوەی گرتە بەر. شەپقەکەی بە دەسـتەوە بـوو. بـە هێـدی دەرۆیشت. کە گەیشتەوە وارخانەکەی، زەنگی تەلـەفۆن لـێیدا. دەسکی تەلـەفۆنی هەڵگرت. برادەرێك بوو.

گوتی:

–لە ناخی دڵەوە، پێمناخۆشە وات بەسەر هاتووە. حەجانم لێ براوە!!!

بەردەوام بوو:

دەزانـی بـە پێـی یاسـای فەرەنسـا، سـێ مـانگ مۆڵـەتت هەیـە وتـارە بلاوکراوەکانی رۆژنامەکان بە درۆ بخەیتەوە. ئەو رۆژنامانـەی هێرشـیان کردۆتە سەر تۆ، ناچارن روون کردنەوەو بـە درۆخسـتنەوەکەت بـلاو بکەنەوە.

(ترایان ماتیزی) پرسی:

– بە دروخستنەوەی چی؟

ئەوەی تر گوتی:

–ئەوەی بۆیان رەوانە دەکەی، دی!!. پێم وایـە وەڵامـی هـەموو ئـەو شتانە دەدەیتەوە کە لـە دژت نووسراون. دڵنیـام هەڵەیـە کـە ستایشـی سەربازە ئەڵمانەکانت کردووە.

(ترایان) گوتی:

– نا. زۆر راستە. کتێبی (پەیامنێر لە کەنارەکانی دنی پێسـتەر)م پێـنج دێری تێدایە دەڵـێم سـەربازانی ئـەڵمانی کـە لــە (بـالتزی) لێپرسـراوی

ڕێکخستنی هاتو چۆبوون، کاتێ لۆری سەربازییان بۆ رادەگرتمو یارمەتییان دەدام سواری ترومبێل بم، زۆر میهرەبان بوون دەرهەق بە من.! ئەمە راستە! ئەمە بە درۆ ناخرێتەوە. دووبارەی دەکەمەوە. ئەو سەربازانە کە (بیسارابی)یان لە داگیرکردنی سۆڤییێت رزگار کردبوو، ئەو شەوە، زۆر میهرەبانییان لەگەڵ نواندمو من بیرەوەریی میهرەبانی ئەوانم لەلا ماوەتەوە. چۆن بە درۆی بخەمەوە؟

-هەندێ شتی ناخۆش هەن مرۆڤ بە قسە باسیان ناکا، مرۆڤ نایاننووسێ. تۆ دەبوایە بزانی. ئەم شتانە کاریگەری زۆر خراپیان هەیە!

(ترایان) گوتی:

-لە (بوخاریست)یش ئەوەی هاوکاری لەگەڵ رووسەکان دەکرد، (کاریگەری خراپ)ی جێ دەهێشت. ئەمە ئاساییە. ئەگەر لە (بوخاریست)، بتگوتبایە لەتەك لەشکری سوور جەنگاوی کە سۆڤێتەکان رۆمانیاو وڵاتە داگیرکراوەکان دەچەوسێننەوە، خۆت لە هەڵوێستێکی ئاوها ناخۆشدا دەدی. لەگەڵ ئەوەشدا، لە کاتی رزگارکردنی وڵاتەکەتاندا، ئێوە لایەنگری سەربازی سوور بوون، کاتێ چاوتان لە هەموو بەندیخانەکانی(سیبریا)و (ئوورال) پۆشی. ئێوە هاوڕێی سەربازانی سوور بوونو چاوتان لەوە دەپۆشی کە ئەوان دەستدرێژییان دەکردە سەر ژنو کالو کچی جحێلی (بیسارابی). وا نییە؟

-دەبێ بە درۆ بخەیتەوە...

-دەبێ بە درۆ بخەمەوە کە تووڕە بوویم؟

ئەوەی تر گوتی:

-پیشەکەت لە مەترسیدایە. دەبێ بە درۆ بخەیتەوە. دەبێ هەست ناسکیی خوێنەرانی رۆژاوا لەبەر چاو بگری کە دەردی داگیرکردنی ئەلمانەکانیان دیوە. ئەگەر بە درۆ نەخەیتەوە، رکیان لێت دەبێتەوە. دەزانی، لەوەتی (رۆمانی سەردەمی ئێستا)ت بڵاو کردۆتەوە، هەموو عالەم چەند بوونەتە لایەنگرت!!؟. حەیفە هەوادارە دڵسۆزەکانی خۆت لە دەست بدەی؟

-چ بکەم بۆ ئەوەی ئەم هەوادارییە بپارێزم. ؟

-دەبێ بە درۆ بخەیتەوە.

- بلێم درۆم کردووە نووسیومە لەو سەربازە بیانییانە تووڕە بووم کە وڵاتەکەیان داگیر کردبووم؟ بڵێم درۆم کردووە نووسیومە لەو کەسانە تووڕە بووم کە کڵێسەیان راگیرابوو؟ لەو سۆفێتییانە تووڕە بووم کە تەنیا لە ماوەی یەك ساڵدا، سێیەکی وڵاتەکەمیان سورگوم کرد؟ شتی وا ئەستەمە! من تووڕە بووم. بۆچی قسەی ناهەق بکەمو ناتەواو بکەم؟ بۆچی بە درۆی بخەمەوە؟ ؟ بڵێم تووڕە نەبووم، بۆ ئەوەی هەستی هاوسۆزیی خوێنەرەکانم رابگرم؟! نا! دیسان نا! لائەگەر نرخی هاوسۆزییان، ئەمە بێ ،نرخێکی زۆر گرانە. نا! شتی وا نابێ!! با هەر رکیان لێم ببێتەوە.

(ماتیزی) دەسکی تەلەفۆنی دانایەوە.

-بەڵام تەلەفۆن دووبارە لێی دا. (ترایان) وەڵامی نەدایەوە. هەڵبەت برادەرانی تر بوون دەیانەویست دڵی بدەنەوەو هانی بدەن یەکسەر

نامەیەکی بە درۆخستنەوە رەوانە بکا. بێ شك برادەرانی تر بوون دەیانەویست بنووسێ کاتێ دیتی پارتیزانەکان شارەکانی ولاتەکەیان سووتاندو کامباخیان کرد، کە سەربازانی سۆڤیێتی دەستدرێژییان کردە سەر هەموو کچە جحێلەکانی (بێسارابی)، توورە نەبووە.

شتەکە راست بوو. لێی پەشیمان نەبوو. نەیدەتوانی بڵێ توورە نەبووە. ئایا دەکرێ نکوولی لە هەموو شتێ بکا هەر بۆ ئەوەی هاوسۆزیی خوێنەرانی رۆژاوایی لە دەست نەچێ؟ نە بە درۆ خستنەوەیەکی هەڵدەبەستێو نە پەشێمان بوونەوەیەك!

ئەگەر هەوادارانی فەرەنسای پشتی تێبکەن، ناچار دەبێ خاکی جوانو بۆنداری (سان لوی) جێ بێڵێ کە پەناگایەکی لێ دەست کەوتووە.

هەڵبەت دەڕوا. (ترایان) تەماشای جانتاکانی سەر دۆلابی کرد. زۆری حەز دەکرد ناچار نەکرێ بڕوا.

(ترایان ماتیزی) هەرگیز حەزی لە رۆیشتن نەدەکرد هیچ رۆیشتنێك!. لەگەڵ ئەوەیشدا، لە تەمەنی نۆزدە ساڵییەوە، هەمیشە ناچار کراوە سەفەر بکا.

هەردەم بە بێ وچان، بێ خواستی خۆی! هەمیشە لە سەفەردا بووە! هەمیشە تەنیا بووە! هەموو جارێ کە دەیەویست لە جێیەك بمێنێتەوە، ناچار دەکرا بڕوا.

(ماتیزی) جلەکانی داکەند. بە وردی و بە شێنەیی جلەکانی لەسەر ڕەفکەی ناو دۆلاب دانا. ئینجا سۆلی لە پێ و جلی کاری لەبەر کرد. لەسەرکورسی رونیشت. زۆری حەز دەکرد لە فەرەنسا بمێنێتەوە. بیری دەکردەوە کە (دووەم گۆشەنیگا)ی تەواو کرد، دەتوانێ پشوویەك بدا. چیدی نەجوولێ. زۆری حەز دەکرد، بێ جوولە، لە جێی خۆی بمێنێتەوە. ئاخر لەبەروەی بوو خوشکەکانی و (نیکۆلا)و باوکی ناویان نابوو (بەهەشتی). بەلام (ترایان ماتیزی)، تەنانەت لە زیندانیشدا، نەیدەتوانێ لە یەك جێ ئۆقرە بگرێ. بێ پسانەوە، لە زیندانێك دەگوازرایەوە زیندانێکی دیکە!!

هەنووکەیش کە لە فەرەنسایە و وا دەزانێ هەموو شتێ ڕێك کەوتووە، هەنووکەیش کە خانووی خۆی هەیە، ڕێی نادەن بمێنێتەوە.

دەبێ هەموو شتێ جێ بێلێ و بڕوا.

دیسان دەڕوا.

## (٣٢)

ســـەعات نــۆی بــەیانی بــوو. (مـــاتیزی) لای بڵاوکەرەکــەی بــوو. بڵاوکەرەکە یەکێ بوو لـە برادەرانی (ترایان). ئەو گوتی:

-کە هێرش درێژە بکێشێ، بـەرگری دەبێتـە شـتێکی ئەستەم. کـەس ناتوانێ هەتا هەتایە بەرگە بگرێ، هەموو بەیانیان، بەم جۆرە لــە قـو... وەربدرێ.

لـە ماوەی ئەم مانگانەی دواوە، رۆژنامەکان ئەوەندە گوتـاری تونـدیان لـە دژی نووسـەری (رۆمـانی سـەردەمی ئێســتا) بڵاوکـردەوە، (ترایـان ماتیزی) بە هەموو مانای وشە، لـە وشـەی (بێگانە) گەیشت. تـەنیا یـەك کەس وەکوو جاران بە شێوەی خۆیی، وەك ئەوەی بە زمانی دایـك بـێ، قسەی لـەگەڵ دەکرد. ئـەو کەسـەیش جـەنابی (لـۆران)ی بڵاوکـەری برادەری بوو.

بەردەوام بوو:

-هەرگیز نەمدیوە هێرشێکی وا دژی هیچ نووسەرێك بـەرپا ببــێ. بـۆ یەکـەمین جـار، رۆژنامەگـەری چـەپ، رێـك وەکـوو رۆژنامەگــەری

بـورژوازی‌و رۆژنامه‌گـه‌ری کلێسـایی‌و رۆژنامه‌گـه‌ری ده‌سته‌راسـت، هه‌مان شت ده‌نووسێ. به شـێوه‌ی ئاسـایی، کـاتێ کۆمۆنیسـته‌کان لـه رۆژنامه‌کانیان هێـرش ده‌که‌نـه سـه‌ر که‌سـێ، رۆژنامه‌گـه‌ری میانـه‌ڕۆو رۆژنامه‌گه‌ری ده‌سته راست‌و رۆژنامه‌گه‌ری کلێسایی، بـه شـێوه‌یه‌کی سیسته‌ماتیکی به‌رگری لێ ده‌که‌ن. به‌لام به‌ش بـه حـالّی تـۆ؟ هـه‌موویان سووکایه‌تی به تۆ ده‌که‌ن. هه‌ر هه‌موویان!! چـوار مانگـه، یـه‌ك رۆژیـان نه‌بواردووه. شتێکی سه‌یره!! ده‌ترسم نه‌توانی به‌رگه بگری.

(ماتیزی) گوتی:

-جه‌نابی (لۆران)، من راهاتووم. له سالانی گـیرانم لـه هه‌نـدێ شـت راهاتم زۆر به قازانج بۆم گـه‌ڕان. زۆرم بـه کـه‌لك دێـن. له‌وانـه: لـه سه‌رده‌می به‌ندیدا، سه‌ربازه‌کان پێلاوو گۆره‌وییان لێ سـه‌ندم‌و ناچـاریان کردم به‌پێ خاوسی، به‌سه‌ر به‌ردی تیژدا بـڕۆم. سـه‌ربازه‌کان، هـه‌ر بـۆ رابواردن، شووشـه‌ی به‌رچـاڤکه‌که‌یان شـکاندم‌و ناچـاریان کـردم بـه په‌له‌ماشێ بڕۆم، دوو شه‌قاو پێش خۆمم نـه‌ده‌دی. لێیـان دام، برسـییان کردم. ئه‌وه‌نده برسییان کردم، شه‌و، خۆلێو گه‌چـی دیـوارم ده‌خـوارد. سه‌ربازه‌کان فه‌رمانیان پێکردم ده‌مم تـه‌واو بـه‌ش بکه‌مـه‌وه‌و یـه‌ك یـه‌ك ده‌هاتن تفیان لـه زارم ده‌کرد. من به‌رگه‌ی هه‌موو ئه‌مه‌م گـرت. کـاتێ ماوه‌ی به‌ندیم ته‌واو بوو، ئه‌و توانایه‌م په‌یدا کردبـوو، به‌رگـه‌ی هـه‌موو سووکایه‌تییه‌ك‌و هه‌موو بێدادییه‌ك بگرم.

(لۆران) گوتی:

-بەڵێ. بەڵام ئەمە هەتا هەتايە دەوام ناكا. مەسيح خۆی، لەناو باخی زەيتوون، لە ژێر سەنگی ئازاردا چەمايەوە.

سكرتێرێك بەريدی (ماتيزی) هێنا. زۆری نامە تێدا بوون. يەك كۆمەڵ نامە! (ماتيزی) يەكەم زەرفی كردەوە. خوێنەرێك لاپەڕەی پێشكێشی كتێبی (رۆمانی سەردەمی ئێستا)ی لێكردبووەوەو لەگەڵ هەندێ وشەی سووكايەتی بۆ نووسەرەكەی ناردبوو.

(ماتيزی) گوتی:

-بخوێنەوە!

نامەكەو پەڕەی لێكراوەی پێشكێشی لەبەر چاوی (لۆران) راگرت. ئينجا زەرفی دووەمی كردەوە. هی رۆژنامەنووسێكی هۆڵەندی بوو، بە ستايش باسی كردبوو. داوای حيسابی چالاكی سەردەمی جەنگی لێكردبوو (ئەو كاتەی لە ئێس. ئێس. ئەفسەر بوو).

(ماتيزی) پرسی:

-ئەمەيان لە كوێ هێناوە؟ ئەوە ئەوسا من لە ئێس. ئێس. ئەفسەر بووم. ئەدی ئێستا؟!

نامەكەی لە دەست دەلەرزی. ئەويش هات سەبری نەمێنێ.

دوای گوتاری نكوولی كردنی سەيدا، رۆژنامەگەری دەستيان بە نووسينی هەموو جۆرە شتێك كرد. بەم جۆرە، (ماتيزی) تازە زانی

تواهـوو!! یـان لــه لەشــکری ئـەڵمانی ئەفســەر بـووە، یـان فەرمانـدەی بەندیخانەی نازی بووە، یان برادەری گیـانی بـه گیـانی (ئانـت پـاڤلیچ) بووە، یان یاریـدەری فەرمانـدەی سـەربازگەی حوکوومـەتی سـەربازیی (ئۆکرانی)، یان (کریمیّ) بووە. .. ئەو کارانەی درابوونه پـاڵ (مـاتیزی)، کاری زۆر لـه رادەبەدەر توندو تیژ بوون.

(لۆران) گوتی:

–ئەمه چوار مانگه بەردەوامه! شتی وا نەبووە. شتی سەیرە!!

رۆژنامەکانی سکەندیناڤیا، ئەڵمانیا، پورتـەگاڵ، ئـەمریکا، رۆژنامـەکانی سەرانســەری دونیـا، وەکـوو سەرچـاوەیەکی راسـت، ئـەو وتارانـەیان وەردەگرت که لـه پاریس، لـه دژی (ماتیزی) دەنووسران.

(ترایان)، نەیویست چیتر بەریدەکەی بخوێنێتەوە. بـیّ ئـەوەی نامـەکان بکاتەوە، لـەناو جانتای نان. پێشـەکی دەیزانی چییان تێدایه.

(لۆران)گوتی:

– ئەمن بام، نەمـدەتوانی، بـیّ بەرپەرچـدانەوە، بەرگـەی ئـەم هـەموو سووکایەتییه بگرم. ئەستەم بوو وەڵام نەدەمەوە.

(ماتیزی) گوتی:

–چ وەڵام بدەمەوە؟ چ وەڵامی ئەو بوختانانه بدەمـەوە؟ هـەموو رۆژیّ، تاوانو بوختانێکی تازه هەڵدەبەستن. هەموو رۆژیّ، بوختانی تازە!! یـەك

لە یەك درۆترا! درۆی بە شاختر!! سەدەهاو سەدەها تاوانی هەڵبەسراوو دروستکراو! چۆن وەڵامی هەموویان بدەمەوە؟

(ماتیزی) دەستی (لۆران)ی گوشیو رۆیشت.

(ماتیزی)، لە گەڕانەوەدا، لەبەردەم کتێبخانەیەك وەستا. تەماشای کتێبەکانی کرد. کتێبفرۆشەکە هاتە پێش.

دەستی بۆ درێژ کردو وەکوو سەرخۆشی کردن، گوتی.

-یەکێ لە برادەرە چاکەکانم، کوڕێکی بۆشناخ بوو، ئەویشیان ە بە هاوکاری کردنی دوژمن تۆمەتبار کرد. تەنیا ئەوە بوو، ئەو بەختی نەبوو، گوللەبارانیان کرد... کەچی تۆ...

(ماتیزی) ویستی بڵێ:

-من، وەکوو ئەو کوڕە قۆزە، هاوکاری دوژمنم نەکردووە...

بەڵام خۆی کڕ کرد. هەموو گفتوگۆیەك بێ مفایە. کتێبێکی کڕیو ملی ڕێی خۆی گرت.

نامەکانی بەریدی بەیانییان لە ژێر دەرگای وارخانەکەیەوە، خزاندبووە ژوورێ. پارچە رۆژنامەی هەموو وڵاتانی دونیا بوو. (ترایان) تێگەیی هەرچەندە باشیش مەشق کرابێ توانای بەرگە گرتن سنووری هەیە. ئیتر نەیدەتوانی بەرگەی هیچ شتێ بگرێ. چەند رۆژێکی تەواو بوو هیچی بۆ نەدەخورا. هەرچی هەبوایە!. هەرچی دەیخوارد، دەیهێنایەوە. هەرچی

ئەو کاتە بە سەری دەهات، نکاوو نامـەنتیقیو چـاوەڕێ نـەکراو بـوو، ئەقڵی نەیدەبڕی!

کە پاڵتۆکەی بە جلاویزەوە هەڵواسی، لـە دڵی خۆیدا بیری کردووەوە، ئەو بێدادییە گەورەیەی بەسەری هاتووە رەنگە ئەزموونێکی تـازەی بـێ، بەرامبەر بە خواستی خوا.! ئەزموونێکی نویێ بـێ ئـەرکی مەسـیحییانەی فەرمانی پێدەکرد قـەبووڵی بکـا. چـونکە چـاکەو خراپـە هـەردووکیان خواستی خوان. (ترایان)، کە بیری دەکردەوە خوا ئیرادەی لەسـەر ئـەو ئەزموونە بووە، فەرامۆشـیی دەهـات. نامـەکانی کـردەوەو دەسـتی بـە خووندنەوە کرد. رۆژنامەنووسێك لـە رۆژنامەیـەکی پـاریس تۆمـەتباری کردبوو کە کوشتاری جوولـەکەکانی (بێسارابی) بە فیتی ئەو کراوە...

کـە نامـەی پاشـی کـردەوە، چـاوی روون بـووەوە. داوەتنامـە بـوو. دەزگایەکی رۆشنبیریی (ئەرژەنتین) داوەتی کردبوو زنجیرەیـەك کـۆڕ لـە سەر کیشوەری لاتینی بکا. (ماتیزی) بڕوای بە چاوی خۆی نـەکرد. بـۆ جـاری دووەم نامەکـەی خوێنـدەوە. دوای ئـەوەی رۆژنامەگـەری سووکایەتیان پێ کردو و بە ترسناکترین تۆمەت تاوانباریان کرد کـە لـە ساڵانی جەنگ، لەسەر رووی زەوی، کرابێ، هێشتا هەندێ کەس هـەن داوەتی بکەن.

(ماتیزی) تەلەفۆنی بۆ (لۆران) کردو نامەکەی بۆ خوێندەوە.

(لۆران) گوتی:

– تۆ ڕێك پێویستت بەمەیە. مـاوەی بیسـت ڕۆژ لـەناو دەریـا دەبـی. لەوێ هیچ ڕۆژنامەت بە دەست ناگا. هەموو سبەینان ڕووت لـە قـو.. وەرنادەن! بڕۆ! ئەم سـەفەرە بـۆ تـۆ زۆر باشـە. گۆڕانێکـە، پێویسـتت پێیەتی.

(مـاتیزی) بـە برووسـکە وەڵامەکـەی بـۆ (بـۆینس ئـایرس) نـاردەوە. داوەتەکەی قەبووڵ کرد. دەبوایە حەفتەی پاشی بڕوا.

کارمەندی ئاژانسی سەفەر، کە (ماتیزی) بلیتـی لێ کـڕی، ماوەیـەکی زۆر تەماشای کردو ددگانی بە جیڕەوە برد. (ترایان ماتیزی)ی دەناسـی. کارمەندەکە، دوای ئەوەی بلیتی (بۆینس ئایرس)ی دایە، گوتی:

–دەچیتە سەردانی (پیرۆن)؟

ئاوازێکی بە تەوسەوەی لە دەنگیدا بوو. (ماتیزی)، وەك ئەوەی تەوازۆ بێنێتەوە، نامەی داوەتی دەرهێنا.

گوتی:

–دەزگایەکی ڕۆشنبیری کاتۆلیکی داوەتی کردووم.

کارمەندەکە بە لاقردێ بزەیەکی کرد . بەسـەرنج گـوتی گوایـە بـەم قسانە تەفرە ناخوا.

گوتی:

- لــه (ئــەرژەنتین)، دكتاتۆریەتــه. دكتاتۆریــەتێكی خوێنڕێــژ! لــه (ئــەرژەنتین)، تــەنیا رێكخــراوی (پێــرۆن)، یــان فاشیســتی هــەن. رێكخراوەكــانی دیكــه هەڵوەشــێنراونەتەوەو ئەندامــەكانیان لــه بەندیخانــەكانن. لــەوێ، هــەر كەســێ فاشیســت نــەبێ، لــه نــاو بەندیخانەكانه...

(ماتیزی) بەری ئـەم هێرشـه تازەیشـی گـرت. بـێ جوولـه بەرامبـەر كابینەكه وەستابوو بلیتەكەی بـه دەسـتەوه بـوو. دەویسـت بلیتەكـه بداتەوه، تەلـەفۆن بۆ (بۆینس ئایرس) بكا كه ناچێ.

كارمەندەكه گوتی:

-سەفەرێكی بێ سەرێشه دەكەی. جگه له (بۆینس ئایرس)، بـه تـەنیا لـەسەر كەشتی گەورەی ئۆقیانووسـبڕ دەبـی. ئێسـتا، كـەس لـه ترسـی دكتاتۆر، زات ناكا بچێته ( ئەرژەنتین). سەفەر بـۆ (ئـەرژەنتین) دەرەكو خەبارە. مرۆ لەوێ، تووشی مەترسی دەبێ. تەنیا پارتیزانـەكانی (پێـرۆن) سەفەر ئەوێ دەكەن.

(ماتیزی) خۆی كڕ كرد. بلیتی سەفەری له ناو دەست دەلـەزی.

كارمەندەكه گوتی:

-له (ئەرژەنتین) زۆر باش پێشوازیت دەكەن.

(ماتیزی) پرسی:

-بۆچی پێت وایه زۆر باش پێشوازیم دەكەن؟

کارمەندەکە، بێ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکە بداتەوە، بەردەوام بوو:

-هەڵبەت تۆ لەوێ دەمێنیتەوە. ئیتر ناگەڕێیتەوە بۆ ئەورووپا.

(ترایان) گوتی:

-تەنیا سێ مانگ لە (ئەرژەنتین) دەمێنمەوە.

کارمەندەکە چاوی حەنەکۆ تەفرەی تێبڕی. لە سەرنجی، دیار بوو چی لە مێشکدایە: (من خەشیم نیم. من بیرو باوەڕی تۆ دەزانم. من هەموو رۆژنامەکانم خوێندۆتەوەو دەزانم تۆ کێی؟)

(ترایان)، بە دڵتەنگی لە ئاژانس رۆیشت. پاش سێ رۆژی دیکە، سەفەرەکەی دەستی پێدەکرد. پازدە هەزار کیلۆمەتری دەبڕی. سەفەرێکی تازە بوو. سەفەرێکی دوورو درێژ! لە سەفەر شەکەت ببوو. لەگەڵ ئەوەیشدا، دەبوایە جارێکی تر بچێتە سەفەر. هەرچەندە بە پێداگرتنەوە بە تەمابوو چیدی سەفەر نەکا، بەڵام دیسان دەچووە سەفەر.

هێشتا قسەکانی کارمەندی ئاژانسی لەگوێدا دەزرنگایەوە..

تەنیا خوا دەزانێ کە سەفەری (ماتیزی) بۆ (بۆینس ئایرس) سەفەرێکی سیاسی نەبوو. تەنیا خودا دەزانێ.

## (٣٣)

کەشتیی (بروتاین)ی ئۆقیانووسبڕ، سبەینەیەك، سەعات حەفت، گەیشتە بەندەری (بۆینس ئایرس). گەشتەکە لە (مارسیلیا)وە نۆزدە رۆژی خایاند. بەڵام بە لای (ترایان)ەوە وای دەنواند کە هەتاهەتایە درێژەی کێشاوە. بەشی زۆری کاتی خۆی لە کابینەیەکی داخراودا بەسەر برد. نەیدەتوانی بخەوێ، خواردنی بۆ نەدەخورا. کەشتییە بە تەنتەنەکەی لە کن زیندان بوو. ئێستا، کە سەفەرەکەی بە کۆتا هات، ترسێکی زۆری لە دابەزین هەبوو.

پیلەکەو پەلاماری توندی چەند مانگێك کۆتایی هات، بەڵام ترسێکی بە راستی خستبووە دڵێ ترس هەموو گیانی داگرتبوو. دیمەنی کەناری (ئەرژەنتین)، شاری کەسنەزان، کە تەواو لەو شارانەی پێشتر دیبوونی، جیا بوو، هەراسانی کرد.

سەدان کەس لەسەر شۆسە چاوەڕێیان دەکرد. (ماتیزی) لەسەر پشتی کەشتی، دەینوارییە شەماتەی خەڵك. دەیەویست بە مەزەندە بزانێ ئەو کەسانە کێن هاتوونەتە پێشوازی؟

کاتێ پەیژەکانیان دانا، کابرایەك لە ناو خەمڵگەکە تاق بووەوەو هاواری کرد:

-جەنابی (ماتیزی)!!

دەریاوانان پەیژەکانیان توند کرد. (ماتیزی)، بە قامك ئاماژەی بۆ ئەو پیاوە کرد کە گازی کرد. کابرا بە زمانی رۆمانی، دەمی گوتاری کردە (ترایان):

-شتێکی پەلە هەیە دەبێ پێت بڵێم. زۆر پەلەیە!!! بەر لەوەی دابەزی‌و بەر لەوەی پەیوەندی بە خەڵکەوە بکەی، شتێك هەیە دەبێ پیت بڵێم.

کابرای لاجانگ ماش‌و برنج پێش هەموو کەس هاتە سەرپشتی ئۆقیانووسبڕ. قۆڵی (ترایان)ی گرت‌و پێیگوت:

-ئاگادار بە! قسەی سیاسی نەکەی!

(ماتیزی) پرسی:

-کێ تۆی ناردووە ئەم ئامۆژگارییەی من بکەی؟ پۆلیس؟ یان ئەو کۆمەڵەیەی کۆنفرانسەکان رێك دەخا؟

کابرا گوتی:

-گرنگ نییە کێ منی ناردووە. حەز دەکەم دڵنیات بکەمەوە کە ئێمە برادەرو هەواداری تۆین. ئێمە چاکەی تۆمان گەرەکە. تەنیا چاکەی تۆ!

هەرچەندە لە (ئەرژەنتین) بمێنیتەوە، باسی هیچ بابەتێکی سیاسی مەکە. هیچ!

کابرای لاچەرە ماش‌وبرنج بە پەلە خوا حافیزی لە (ماتیزی) کردو بزر بوو. خەڵکەکە دەستیان بە جێهێشتنی (بروتاین) کرد. (ماتیزی)یش بە دەوری خۆیەوە، دابەزی. دەستەیەك لە رۆژنامەنووس‌و وێنەگرو فلیمسازان دەوریان دا.

لە بەندەرەکانی ئەوروپادا، تەنیا ئەستێرە گەورەکانی سینەما ئەو رێزەیان هەیە بەم جۆرە پێشوازییان بکرێ. (ماتیزی)، چاوی لەکابرای قژ ماش‌و برنج گێڕا. بە ئامۆژگاری کابرا نارەحەت بوو. کابرا بزر ببوو. رۆژنامەنووسان پرسیاری جۆراوجۆریان لە (ماتیزی) کرد، پرسیاری زۆر جۆراوجۆر!. بەڵام هەموو پرسیارەکان دۆستانەبوون، مەیلەو دڵسۆزانە بوون. ئەویش دۆستانە وەڵامی هەموویانی دایەوە. (ماتیزی)، بۆ وێنەگرو بۆ فلیمسازان وەستا. کتێبی بۆ مۆر کردن. (ماتیزی)، هەرچەندە کەشەنگ بوو، نەیویست دەست بە رووی کەسەوە بنێ. دوای سێ سەعات، بەندەری جێ هێشت. ئێستا لە وارخانەیەکی زۆر خۆش بوو. لە میوانخانەی (کۆنتینانتال)، بۆیان گرتبوو. شاد بوو کە کەس ئاماژەی بۆ ئەو هەڵمەتەی راگەیاندن نەکرد کە لە ئەوروپا، لە دژی بەرپا کرابوو. رۆژنامەنووسان پرسیاریان لە بارەی (رۆمانی سەردەمی ئێستا)و لەبارەی (گۆشەنیگای دووەم)و لە بارەی ژیانی خۆی، لێکرد. رێکخەرانی کۆنفرانس، کە لەو ساتەدا، لە وارخانەی

میوانخانەکە، قاوەیان لەگەڵ دەخواردەوە، زۆر ئاماژەیان بۆ شەڕە قسەکە نەکرد. سەعات دوازدەو نیو، ترومبێلێکی جوان (ماتیزی) بۆ بینینی شار برد. (ماتیزی) شەکەت بوو. چاوی دەزووورایەوە چونکە شەوی پێشوو، لە ناو کەشتیدا، کەم خەوتبوو. بەڵام نەیتوانی داوەتی بینینی شار رەت کاتەوە. تەماشای شەقامی بەرینو خانووی زەبەلاحو رێدارەکانی دەکرد. لێرە، هەموو شتێ جیا بوو لەگەڵ ئەوروپا. هەموو شتێ بە پێو دانگ، هەراو، زەبەلاح، دروست کرابوو.

ترومبێل لەبەردەم کۆمەڵێ داروپەردوو و وێرانە وەستا. یەکێ لە یاوەرەکانی (ماتیزی) گوتی:

–ئەمە جێگای (جۆکی –کلەب)ە. ئەمە داروپەردووی (جۆکی– کلەب)ە!

یاوەری دووەم رووونی کردەوە:

–پێرۆنییەکان بەم دوایە بینای (جۆکی – کلاب)یان سووتاند. ئەم بینایە باشترین کتێبخانەی کتێبی دەگمەنی ئەمریکای باشووری تێدابوو. تابلۆی ئوستادی گەورەو بەرهەمی هونەریو قاڵی تێدا بوو. گەنجینەیەکی هونەری دەگمەنی تێدا بوو. گەنجینەیەکی بێ وێنە! ئەم بینایە مایەی شانازی کیشوەری ئەمریکای لاتینی بوو. نەمانتوانی هیچ رزگار بکەین. ئەمە کاری پێرۆنییەکان، فاشیستەکانی حوکوومەت بوو.

(ترایان)، تەماشای وێرانەکانی کرد. تەماشای درزی دیـوارە بـە ئـاگر ڕەشداگەڕاوەکانی کرد کە بە کەلاوەکانی (درێـزدی) (نـورێمبێرگ)و (کیشینیف)و شارەکانی تری ئەورووپا دەچوو..

(ترایان) نەیدەزانی ئەو دوو پیاوەی یاوەریی دەکـەن (پێرۆنـی)ن، یـان (ئەنتیپێرۆنی).. بەڵام دەیدی بە وردی تەماشای ئەم دەکـەنو چـاوەڕێی پەرچەکرداری دەکەن.

(ترایان)، بیری لـە ئامۆژگاریی کابرای قژ ماشو برنج کردەوە کە کاتی دابەزینی لـە کەشتی، هاتە پێشوازی. ئیتر گوتی:

-کەلاوە هەمیشە دیمەنێکی غەموونی هەیە!.(دڵنیا بوو کە ئەم قسەیە، هیچ شتی سیاسـی لێ هەڵناگیرێتـەوە.) دیمـەنی کـەلاوە زۆر غەمناکـە!. هەمیشە!! لـە هەموو شوێنێ!

دەوری سەعات یەكو نیـو، لەگـەڵ دەسـتەیەك لــە كەسـانی نـەناس فراوینی خوارد. دە کەس بوون. هەموویان پیاو بـوون. ئـەو خواردنـەی هێنایان لەو خواردنانە جیا بوو کە ئاشنایان بوو. (ماتیزی) هـەمان شـتی خوارد کە خانەخوێکانی خواردیان. کە پەنیرو ریچۆلی تام کـرد، گـوتی ئەمە زۆر خۆشە.

دوای سـەعات چـوار، گەڕایـەوە میوانخانـە. جێنووکـەکانی گرِیـان گرتبوو. (تا)ی لێ بوو. شەو، پلەی گەرمی گەیشـتە ۳۹. رێکخـەرانی کۆنفرانس، دختۆرێکیان بۆ نارد. (ترایـان) شـاد بـوو کـە دەتـوانێ لـە

ژوورەوە بهێنێتەوە. بە راستی نەساخ بوو. کەس نارەحەت نەدەبوو کە داوەتی قەبوول نەدەکرد. هەر نیو سەعات جارێك، خزمەتکاری ژوورەکە نامەی تازەی بۆ دەهێنا.

(ماتیزی)، تەنیا لە (ئەرژەنتین)، نزیکەی یەك ملیۆن خوێنەری هەبوو. هەوادارەکانی نامەیان بۆ دەنووسیو دەهاتن بیبینن. دەستە دەستە دەهاتنە وارخانەکەی. رۆژێ، سەد کەس زیاتر دەهاتن.

(ستریپتۆمیسین)ی ئەرژەنتینی موعجیزەی نواند. (ماتیزی) توانی کۆنفرانسەکانی لەو رۆژانە بکا کە بانگەشەی لەسەر دیوارەکانی شار درابوو. پەشمەنەی کاتەکەیشی لە میوانخانە بەسەر دەبرد. پێشوازی خوێنەرەکانی دەکرد.

رۆژێ، لیخورێك بە جلی رەسمی کتێبێکی بۆ هێنا بە ناوی (ئەولای سەردەمی ئێستا). (ماتیزی) هەولّی دا دەقە ئەسپانییەکەی بخوێنێتەوە. وروژا بوو. نووسەرەکەی یەکێ بوو لە وەزیرانی حوکوومەتی سەردەم. (ماتیزی) بڕیاری دا، کە کۆنفرانسەکان تەواو بوون، بچێتە سەردانی. بۆ ئەوی سوپاسی بکا بۆکتێبەکە.

وەزیر، لە نووزگەی خۆیدا، لە خانەی حوکوومەتی ناسراو بە(کازا رۆزا)دا، پێشوازی لە (ماتیزی) کرد. وەزیری- نووسەر پێشوازییەکی ساکارو مرۆڤانەو دوور لە هەموو تەشریفاتێکی لێ کرد. وەزیر لەگەڵ (ماتیزی)دا، باسی شانۆ، باسی شیعر، باسی خودای کرد. دەوری

سەعات هەشتی ئێوارە بوو، کات بە خێرایی دەڕۆیشت. ئەوان لەو قسانەدا بوون، دایکی وەزیر هات. ئینجا باوکیو پاشان خزمەکانی تری وەزیر. ئەمە دوای تەواوبوونی دەوام بوو. پێشخزمەت قاوەی هێنا. کەشێك بوو، (ماتیزی)، پێش چەند ساڵێك ئاشنای بوو. کە چاوی دەقوچاند، هەستی دەکرد کە باوکی وەزیر، (ماتیزی)ی باوکی خۆیەتی. دایکی وەزیر، دایکی خۆیەتیو ئەمانە هەموویان فنجانی قاوە بە دەست، لە کۆشکی حوکومەتی (ئەرژەنتین) نین، بەڵکو لەماڵی قەشە (ماتیزی)، لە (ئیزفۆر)، لە ماڵی باوکی ئەون.

لەکاتی رۆیشتندا، وەزیر لە (ماتیزی) پرسی:

-دەتەوێ کەنگی سەرۆك ببینی؟

(ترایان) سوور هەڵگەڕا. دەیزانی سەرۆکی (ئەرژەنتین) کتێبەکانی ئەمی خوێندۆتەوە. پێی خۆش بوونە!

مرۆڤ کاتێ سەرۆکی دەوڵەت دەبینێ، کە وادەی چاوپێکەوتنت بۆ دابنێ. من لە نووسەرێك زیاتر نیم. ئەمەیەو بەس!

(ماتیزی) بە پێ، گەڕایەوە میوانخانەکەی.

ئەو شەوە، بە ئارخەیانی خەوت. بە دەم بیر کردنەوە لە خانەوادەو لە ماڵی خۆیان لە (ئیزفۆر)، لە چیاکانی کارپات، خەوی لێکەوت.

رۆژی پاشی، (ترایان) لە زەنگی تەلەفۆن بە خەبەر هات. تەلەفۆنچی پێیگوت:

-سەرۆك کۆمار، سبەی بەیانی، سەعات حەفت چارەکێك کەم، چاوەڕێت دەکا.

(ماتیزی)، بە دەستێکی کە لەبەر خەو قورس ببوو، دەسکی تەلەفۆنی دانایەوە. هەوڵی دا بخەویتەوە، تەلەفۆنچی دووبارە لە تێلێی دا.

-کابینەی سەرۆکایەتی، پشتگیرییەکی دەویَ کە تۆ سبەی، سەعات حەفت چارەکێك کەم، دەچیتە (کازا رۆزادا).

(ماتیزی) گوتی:

-گومانی تێدا نییە دەچم.

دەیزانی لە (ئەرژەنتین)، هەموو وەزیرەکان سەعات حەفتی بەیانی لە نووزگەی خۆیانن.

هەستایەوە. دڵنیا بوو کە هەموو ناحەزەکانی گوتاری ناوزڕێن دەنووسن، لەسەر ئەوەی (پێرۆن) پێشوازی کردووە. ئەو رووداوە بیانوویەکی تازەیە بۆ ئەوان. لەگەڵ ئەمەیشدا، (ماتیزی) رازی بوو. وەکوو نووسەر، شاد بوو کە سەرۆك یەکێکە لە خوێنەرەکانی. نووسەر هەمیشە بەختەوەرە کە کار لە دڵی خوێنەرەکانی بکا. ئەمە خەونی گەورەی هەموو نووسەرێکە.

## (٣٤)

سبەینەی رۆژی پاشی، سەعات حەفت چارەکێك کەم، (ماتیزی) لە (کازا رۆزادا) بوو. ئەو دەرگا زەبەلاحەی هۆڵی چاوەڕوانیی لە نووزگەی سەرۆکایەتی جیا دەکردەوە، والاّبوو. کابرایەکی مووڕەش، بە جلێکی بۆری کراوە، بە رەفتو رۆینی گەنجانەو وەرزێنانە، بەرەو (ماتیزی) هات. لە سەر کۆسپەی دەرگای نووزگەکەی، پێشوازی کرد. (ترایان) بە وردی تەماشای کرد. تەماشای جلی بۆرو دەستو زنجیری زێڕی سەعاتی کرد. دەستی لە سەرشانی (ترایان) دانا. (ترایان)) بە چاوی گەورەو زیندووی، تەماشای چارەی ئەو پیاوەی کرد کە دەستی لە سەر شانی دانا. تەماشای چاوی گەورەو بزۆزو رووی ئەو پیاوەی کرد کە تا سەر کۆسپەی دەرگای نوزگەکەی بە پیرییەوە هات. (ترایان) بە وێنەکانی ناسی. هەرچەندە لە راستیدا، زۆر گەنجتر دیار بوو.

(ماتیزی)، باوەڕی نەدەکرد، ئەو پیاوەی، بە باوەشی کراوە، لەسەر کۆسپەی دەرگای نووزگەکەی پێشوازی کرد، سەرۆك، خۆی بێ.

باوەڕی نەدەکرد ئەو پیاوە وریاو گەنجە کە وەك جێگری ئەفسەر وا بوو، جەنەراڵی- دکتاتۆر، خۆی بێ.

(ماتیزی)، کە باوەڕی نەدەکرد، چەند چرکەساتێك بێ جوولە وەستا. دکتاتۆر، دۆستانە بازووی (ماتیزی) گرت‌و گوتی:

-وەرە، (برادەر)[٣]، وەرە! زۆر بەختەوەرم کە هاتوویتە دیدەنیم.

(ترایان ماتیزی)، زۆر جار، لە ژیانی خۆیدا زۆر هەڵەی کردبوو. وەکوو هەموو کەس دەشێ هەڵە بکا. بەرێ، ئەم جارە لێی مسۆگەر بوو بەهەڵەدا نەچووە. ئەمە سەرۆکە، بە دڵو بازووی کراوە، زۆر دۆستانە، لەسەر کۆسپەی دەرگای نووزگەی گەورەی خۆی، بە پیریەوە دێو پێشوازی دەکا.

دە ساڵ بوو (ترایان) (بوخاریست)ی جێ هێشتبوو. لەماوەی ئەم دە ساڵەدا، هیچ کەس، تەنانەت یەك جار، ئەوەندە بە دڵسۆزیو دۆستایەتی، دڵو بازووی بۆ پێشوازی (ترایان ماتیزی) نەکردبووەوە. لە هیچ شوێنێ. تەنانەت هاوپۆلەکانی جارانیشی کە هەندێ جار لە تاراوگە تووشیان دەهات. هەرگیز ئاوها دۆستانە پێشوازییان نەکردووە. هیچ کەس! (ترایان) بەمە ورووژا.

---

[٣] وشەی (برادەر)ی بە ئەسپانی گوت: ( amigo)

سەرۆك باسی کتێبەکانی لەگەڵ (ماتیزی) کرد. باسی (رۆمانی سەردەمی ئێستا)و (گۆشەنیگای دووەم). باسی (ئەرژەنتین)، باسی (ئیڤا پێرۆن)ی بۆ کرد.

پێشخزمەت فنجانە قاوەی تری هێنان. (ماتیزی) تەماشای سەعاتی دیواری کرد. بیری کردەوە دەبێ کاتی چاوپێکەوتن تەواو بووبێ. ویستی هەڵبستێ. بەڵام پێچەوانەی تەشریفات بوو، کە یەکەم جار ئەو هەڵبستێ.

سەرۆك ،کە بینی (ماتیزی) سەیری سەعاتی کرد، گوتی:

-(برادەر)، جارێ دانیشە!!

(ترایان) نیگەران بوو نەوەك زێدەڕەوی بکا. سەرۆکی دەوڵەت پیاوێکی زۆر سەرقاڵە. ئەویش سەعاتێك بوو لەوێ بوو. نیو سەعاتی تر تێپەڕی. چارەکێکی دیکەیش، نیو سەعاتی تریش...

(ماتیزی) گوتی:

-زۆر شادم کە کتێبەکانی منت بە دڵ بووە. (رۆمانی سەردەمی ئێستا)م بە دەم کێشانی جگەرەی ئەرژەنتینییەوە نووسیوە کە (ئیڤا پێرۆن) لە رێگای ڤاتیکانەوە بۆ زیندانییانی ئەورووپای دەنارد. سوپاست دەکەم بۆ جگەرەکانو بۆ ئەو هەموو باروبووەی دەتکردین، بۆ منو بۆ هاوڕێ گیراوەکانم. لە هەمان کاتدا، سوپاست دەکەم بۆ ئەو میوانپەروەرییەی، لەسەر خاکی (ئەرژەنتین)، لە کەسێتییەکانی کتێبەکانت کردووم! زۆر کەسێتی (سەردەمی ئێستا)و (گۆشەنیگای دووەم) هاتوونەتە سەردانم. ئەمانە، دوای ئەوەی بێ هوودە داوای

پەنابەرییان لە هەموو وڵاتان کرد، لە (ئەرژەنتین) گیرسانەوەو دالـدەیان لێ دەست کەوت.

(ترایان)، کاتێ باسی کەسێتییەکانی چیرۆکەکانی خۆی کرد، قسەکانی فەرمانبەرەکەی ئاژانسی گەشتی پاریسی لە دژی دکتـاتۆری ئـەرژەنتینی بیرکەوتەوە. ئەو گوتارانەی نارەزاییو دژی دکتاتۆری بیرکەوتەوە کـە لە راگەیاندنی ئەمریکای باکوور، لــە بـەرازیلو لــە وڵاتـانی ئـەوروپا بڵاوکرابوونەوە...

(ترایان) گوتی:

– هەموو ناسیارەکانم ئامۆژگارییان کردم واز لەم گەشتەی (ئەرژەنتین) بێنم، نەیەمە ئێرە! هـەموو عالـەم پێیاندەگـەتم تـرسو دکتاتۆریـەت لــە (ئەرژەنتین) حـوکم دەکـا. مـن، ئـەوە ماوەیەکـە لێـرەم، لــە (بـۆینس ئایرس)م، دەرفەتم نەبووە بگەڕێم. نزیکەی هەمیشە نەساخ بـووم. بـەڵام شتێکم بینی لە هیچ وڵاتـێ، کـە کۆنفرانسـم تێـدا کـردووە، شـتی وام نەدیوە: سانسـۆر پێشـەکی داوای دەقـی کۆنفرانسـەکەی لێ نـەکردووم. لەکاتی کۆنفرانسدا، ستێنۆگرافی پۆلیس نـەبوو قسـەکانم تۆمـار بکـاو دوای باسەکەیشم، کەس داوای دەقەکەی لێ نەکردووم.

سەرۆك بزەیەکی هاتێ. دیار بـوو ئـەم بووچـوونە باشـەی بەرامبـەر رژێمەکەی پێ خۆش بوو.

(ماتیزی)، کاتێ بینی دکتاتۆر، پێکەنی، نەختێ ئازاتر بەردەوام بوو:

-لەبەر هۆی تەندروستی، ناتوانم زۆر لە ئەمریکای باشـوور بمێنمـەوە. یەکسـەر دەگەڕێمەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی تۆ هەڵوێسـتت بەرامبـەر مـن ئەوەندە دۆستانەیە، روخسەت بە خۆم دەدەم داوایەکت لێ بکەم. حەزم دەکرد، لە (ئەرژەنتین)، سەر لە بەندیخانە بدەم..

سەرۆك گوتی:

-هیچ بەندیخانە لە (ئەرژەنتین) نییە.

(ماتیزی) گوتی:

-لەگەڵ ئەوەیشدا، زۆر کەس هەن لەسەر سیاسەت گیراون. هـەموو نەیارەکانت گیراون. ئایا دەتوانم لە زینـدان سـەردانیان بکـەمو قسـەیان لەگەڵ بکەم؟

سەرۆك رووی گرژ بوو. تەمی غەمێکی بەسەر چاودا هات. چاوەکانی خەمناك بوون. دەستی، کـە بـەردێکی شـینی نگینـی باریـكو درێـژی دروشمی لەسەر دەدرەوشـایەوە، لەسـەر دوگمـەی زەنگێـك داگـرت. سەرهەنگی فەرماندەی سەربازیی کۆشکی سـەرۆك، هاتـە ژوورەوە. بـە ئامادەیی، بەرامبەر ژەنەراڵ راوەستا.

سەرۆك گوتی:

- جەنابی (ماتیزی) روخسـەتی هەیـە سـەردانی هـەموو زیندانـەکانی خاکی کۆماری (ئەرژەنتین) بکا. جەنابی (ماتیزی) دەسەڵاتی هەیە لەگەڵ (گشت) زیندانییان قسە بکا. دەسەڵاتی هەیە، هـەر گیراوێکـی بیـەوێ، سەیری دۆسییەکەی بکا.

دوای ئیستێك بێدەنگی، سەرۆك کۆمار گوتی:

-من، فڕۆکەی تایبەتی خۆم دەخەمە بەردەست جەنابی (ماتیزی) بۆ هەر گەڕانێکی بیەوێ لە ناو کۆمار بیکا. لە ئێستاوە، فڕۆکەی من لە بەردەستی ئەودایە.

جێگری سەربازگە سەلامی وەرگرت‌و رۆیشت.

سەرۆك گوتی:

-پێویستە واقیعیەتی وڵاتەکەمان تەنیا بە گیانیی وڵاتی خۆمان هەڵسەنگێنین. جگە لە تۆپی پێ، یەکێ لە وەرزینە نەتەوەییەکانمان شۆڕشە. لە کیشوەری لاتینیدا، شۆڕش وەکوو جێگاکانی تر، بە مانای نارەزایی نییە بەرامبەر بە حوکوومەت. لە کیشوەری لاتینیدا، شۆڕش جۆرە وەرزینێکە. نابێ میللییەتی حوکوومەت بە گوێرەی ژمارەی بزووتنەوە شۆڕشگێڕانەکان هەڵسەنگێنین. لە سەرێکی دیکە، من، ئەوانە بە شۆڕشگێر دانانێم کە پیلان لە دژی من دەکەن. من وەکوو ئاژاوەگێڕ مامەڵە لەگەڵ پیلانگێڕو شۆڕشگێڕان دەکەم. کاتێ لە ساتی کردەوەی شۆڕشگێڕانەدا دەیانگرم، نایانکوژم. نامەوێ خوێن بڕژێ: زیندانییان دەکەم. باش تەمبێیان دەکەم، ئینجا ئازادیان دەکەم.

(ماتیزی) گوێی گرتبوو. بڕیاری دابوو بە چاوی خۆی ببینێ‌و قەناعەت بێنێ کە شتەکان بەم چەشنەن. دەیەویست خۆی قەناعەت بێنێ. دەیەویست بە هەر نرخێ بێ، سەردانی گیراوەکانی ناو بەندیخانە بکا. (ترایان)، ئەوەی ترس بێ لە گیانیدا نەبوو! هەستی دەکرد دەتوانێ بە

ئاشكرا قسه بكا. (هەموو) شت بڵێ. وەك ئەوەی مرۆڤ لە ساتی هەرە كرانەوەی رەهادا، كارت لەسەر مێز، قسە بۆ برادەرەكانی دەكا ئاوها قسەی بۆ سەرۆك دەكرد.

(ماتیزی)گوتی:

-ئەندامانی (جۆكی - كلەب) بە سەرسەختترین نەیاری (پێرۆنیزم)) دەژمێردرێن. حەز دەكەم، بەرلەوەی برۆم، كۆنفرانسێك لە (جۆكی - كلەب) بكەم. من دیومە (پێرۆنیستەكان) (جۆكی - كلەب)یان لە (بۆینس ئایرس)، رووخاندووە. بەڵام لە (رۆزاریۆ)، كە نزیكترین شارە لە (بۆینس ئایرس)، هێشتا ماوە. تۆ بە خراپی نابینی من لە (جۆكی - كلەب)ی (رۆزاریۆ)، قسە بكەم؟

سەرۆك قاقا پێكەنی:

- هەر كاتێ دەتەوێ برۆ لای دەستەی (جۆكی - كلەب)و هەرچیت دەوێ پێیان بڵێ. من تەنانەت (داوات لێدەكەم) كۆنفرانسێك لە (جۆكی) بكەی!

سەرۆك بەردەوام بوو، گوتی:

-بۆیە ئەو هەموو شتەت بۆ ناكەم، كە بەرەو (پیرۆنیزم)ت ببەم. ئێمە نامانەوێ تۆ بكرین. تۆ ئەگەر فرۆتەنی بای، خەڵك لەمێژە، زۆر پێش من، دەیانكرِیت.

سەرۆك دەنگی میهرەبان بوو:

-هۆی سەرەکی لایەنگری ئێمە بەرامبەر بە تۆ، رێك ئەمەیە کە تۆ خۆت نافرۆشی. تۆ پیاوێکی تەنیای. تۆ پیاوێکی رێگای خۆت گرتۆتە بەر. پیاوێکی بە تەنیا سەفەر دەکەی. پیاوێکی بە تەنیا خانووی خۆت دروست دەکەی. ئاگردانی خۆت رۆ دەنێی. پیاوێکی بە تەنیا رێگای خۆت دیاری دەکەی. پیاوێکی بە تەنیا لەگەڵ ویژدانی خۆت سەفەر دەکەی، پیاوێکی نە پاڵپشتێك، نە حوکومەتێك، نە پارتێك. تەنانەت نە بەڕێوەبەرێکت لە پشت نییە. پیاوێکی، تەنانەت نیشتمانێکت نییە بتپارێزێ. بگرە یەك کونسولگەریت نییە. لە سەرانسەری زەویدا تەنیایت. تەنیا!!

ماوەی چاوپێکەوتن تەواو بوو. دوو سەعات درێژەی کێشا.

سەرۆك تا دەرگا لەگەڵ (ماتیزی) چوو، لەسەر کۆسپە وەستاو شانی گرت.

-شتێکی بەرزو قارەمانانەیە بە تەنیا سەفەر بکەی، بەڵام زەحمەتە، (برادەر). برادەر. هەر رۆژەی وەرس بووی، لێرە، زەوییەك هەیە بۆ ئەوەی پێی لەسەر دانێی‌و پەناگایەك هەیە بۆ ئەوی پشووی تێدا بدەی‌و دۆستایەتی ئێمەت هەیە! هەموو چاوەڕێت دەکەن.

سەرۆك بە شێوەیەکی دۆستانە دەستی (ترایان)ی گوشی.

(ماتیزی)، کاتێ لە (کازا رۆزادا) رۆیشت، چاوەکانی بە فرمێسك بوون. دەم‌و چاوی سوور هەڵگەڕابوو. کاتێ پیاو تەنیا بێ، دۆستێنی شتێکە نرخی تەواو نابێ.

## (٣٥)

(ڕۆزاریۆ) شارێکە پێنج سەد کیلۆ مەتر لـە (بـۆینس ئـایرس) دوورە. (ماتیزی)، لـەوێ، کۆنفراسێکی لە (جۆکی -کلەب) گێڕا. ئێستا، لـە ڕێگا بوو دەگەڕایەوە (بۆینس ئایرس). لـە بـارەی تەندروسـتییەوە، زۆر نەساغ بـوو. دیسـان (تـا)ی هـاتبوێ. دەیەویسـت بـە زووتـرین کـات بگەڕێتـــەوە ئـــەورووپا. هەســـتی دەکـــرد دەبـــێ بچـــێتە بووژانگەیەك(سـەنەتۆری). نەسـاغ بـوو. تەلـەفۆنی بـۆ کارمەنـدێکی میوانخانە کرد.

(ماتیزی) گوتی:

- تکایە بلیتێکی فڕۆکەم ئەرا پـاریس بـۆ بسـەنە. دەمـەوێ حەفتـەی دادێ بڕۆم. کۆتایی ئەم حەفتەیە باشتریشە! حەز دەکەم پێنج شەممە، یان هەینی، یان شەممە بڕۆم. بە دوو ڕۆژ، چی کارم لـە (ئـەرژەنتین) مـاوە، تەواوی دەکەم.

(ترایان) پەساپۆرتەکەی دایە کارمەندەکە. ئینجا بە تەنیا مایـەوە. دوای نیوەڕۆی یەك شەممە بوو. (ماتیزی) بەرنامەی خۆی بۆ ڕۆژی پاشی دانـا.

دەیەویست بچێتە زیندانی سیاسییەکانو سەردانی زیندانییانی سیاسی بکا. دەیەویست بە سەردانی رۆماننوسی بەناوبانگی ئەرژەنتینی، (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ) دەست پێ بکا. دەیانگوت بە تاوانی سەرکردایەتی کردنی ئەنتیپێرۆنیستەکان زیندانی کراوە. گیرانەکەی، هەرایەکی گەورەی نابووەوە، نەك تەنیا لە ئەمریکای لاتینی، بەڵکو لە سەرانسەری دونیادا. لە پاریس، شاندێکی نووسەرانی فرەنسی، بە سەرۆکایەتی ( ئاندرێ مۆروا) چووبوونە سەفارەتی (ئەرژەنتین)، بە سکاڵانامەیەك، داوای ئازاد کردنی ژنەی بۆینس ئایرسی هاوپیشەی خۆیان کردبوو.

هاورێیەکی (ماتیزی)، رۆماننووسی ئەرژەنتینی، خاتوو (سیلڤینا بورلیچ)، بە (ترایان)ی گوت کە خانمی (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ) لە قۆناغی لێکۆڵینەوەدایەو لەم قۆناغەی گیرانیشدا، لە هەموو وڵاتانی دونیادا، گیراوەکان چاوپێکەوتنیان نییە. بەڵام، سەرۆك بە (ماتیزی) گوتبوو دەتوانێ، بە بێ جیاوازی، قسە بۆ هەموو زیندانیان بکا. (ماتیزی) بڕیاری دابوو یەکەم جار بچێتە سەردانی ئەم ژنە - نووسەرە کە کۆڵەگەی ئەدەبیاتی (ئەرژەنتین) بوو.

هاووڵاتییەك هاتە ژووری (ماتیزی). کابرایەکی بە ساڵاچوو بوو. (تیۆدۆر جێی)ی کۆنە سەفیری رۆمانیا بوو. خاوەنی چەند کتێبێك بوو کە (ترایان) بە رۆمانی خوێندبوونییەوەو بە چاکە هەڵیسەنگاندبوون. کابرا ناوی (تیۆدۆر جێی) بوو. (ماتیزی) گوتی:

-جەنابی بەڕێز، شادم بە سەردان هاتوون.

فەرمووی لێکرد دابنیشێ. گوتی:

-تەندروستیم زۆر خراپە. دەبێ واز لەو زنجیرە کۆنفرانسە بێنم کە راگەیانراوە لە (شیلی)، لە (ئۆرۆگوای)، لە (پێرو)، لە (بەرازیل)و لە ولاَتانی تر بیکەم.. نەساخم. دەگەڕێمەوە ئەورووپا بۆ ئەوەی چارەسەری خۆم بکەم. لە کۆتایی حەفتەدا، دەڕۆم. داوای بلیتی فڕۆکەم کردووە. بەر لەوەی بڕۆم، هەر دەبێ چەند زیندانییەکی سیاسی ببینم. تەنیا بۆ ئەم چاو پێکەوتنانە ئەو چەند رۆژە لە (بۆینس ئایرس) دەمێنم. سەرۆك دەسەلاَتی پێداوم هەرکێم دەوێ، ببینم. یەکەم جار، دەمەوێ سەردانی (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ) بکەم لە زیندان. دەمەوێ سبەی بەیانی بچمە وێرێ. حەز دەکەی لەگەلّم بێی؟!

سەڤیری- شاعیر هیچ وەلاَمی نەدایەوە.

(ماتیزی) گوتی:

-تۆ زۆر شت دەزانیو دەزانی مرۆڤ لە هەر بارو دوخێکدا دەبێ چۆن رەفتار بکا، دەتوانی رێنماییم بکەی؟ چ دیارییەك بۆ (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ) ببەم، کەیفی پی دێ؟ بە راستی کەیفی پێ دێ؟ ئاساییە کتێبەکانی خۆمو گولّو چوکلاتی بۆ ببەم. بەلاّم دەمەوێ شتێکی تری بۆ ببەم کە بە راستی کەیفی پێ بێ. ئامۆژگاریت چییە؟ ئایا (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ) دەناسی؟ ئایا چاوت پێکەوتووە؟

سەڤیر گوتی:

-دەیناسم. پێش چەند ساڵێ، کە هاتمە (ئەرژەنتین)، لە ماڵی خۆی، سەردانم کرد.

(ماتیزی) گوتی:

-واتە ئاساندە. (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ) چۆنە؟ هەرچی لە بارەیەوە دەزانی، بە تەواوی، هەمووم پێ بڵێ.

سەڤیر گوتی:

-سەردانەکەم بۆ وێ لە رادەبەدەر نامۆ بوو. شتی گرنگم پێ نییە باسی بکەم. دانیشتنەکەمان تا بڵێی بەرز بوو!! سەیر بوو !! گەلەك سەیر بوو!!

(ترایان) داوای کرد بە دوورو درێژی بۆی باس بکا.

سەڤیر گوتی:

-تازە گەیشتبوومە (ئەرژەنتین)، (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ)م، بەناو، دەناسی! ئاشنایەتیم لەگەڵ کتێبەکانی هەبوو. چوومە ماڵی. خانمێکی پیر! زۆر بە وێلی، پێشوازی کردم. خولقی کردم دابنیشم. لە ژوورێکی بە تەنتەنە بووین! هۆلی پێشوازی بوو. پێمگوت من کێمو گوتم هاتووم رێزی خۆمی پێشکێش بکەمو دڵنیای بکەمەوە کە هەواداری ئەوم!. کاتێ قسەم دەکرد، (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ) بە چاوی غەمناك تەماشای دەکردم.

چاوی غەمناك مرۆ نارەحەت دەکا. پرسی: (گوتت رۆمانی؟ رۆمانی؟ تۆ رۆمانی؟ ...) من نارەحەت بووم. لە مانای قسەکانی نەگەیشتم کە بە ئازارو نائومێدی، دووبارەی دەکردەوە. .(ئێوەی رۆمانی، گەورەترین شاعیری خۆتان لەناو برد. ئێوە رەوانەی ژووری گازتان کرد. ئێوەی رۆمانی، گەورەترین شاعیری رۆمانی خۆتان... برادەری ئازیزی من، برادەری بێ وێنەی منتان لەناو برد

ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ)، بە لێوەلەرزە، ناوێکی بە منگە منگ گوت. ناوەکە بە (مان) کۆتایی دەهات. وەکوو (کاوفمان)، یان (سیلبەرمان)... شتیکی نزیك لەمە بوو. ناوەکەی بە جۆش‌و بە ئازارەوە دەربڕی. (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ) پرسی: (دەتناسی؟ وا نییە؟ گەورەترین شاعیری رۆمانی‌و باشترین برادەری من بوو. پیاوێکی کۆك بوو. کابرایەکی بێ وێنە بوو. ئێوەی رۆمانی رەوانەی ژووری گازتان کرد)

سەفیری-شاعیر هەرگیز لە مێژووی ئەدەبیاتی رۆمانیدا، نەیبیستبوو باسی ئەم ناوە بکەن، . (ترایان)یش هەرگیز نەیبیستبوو باسی شاعیرێك بکەن بەم ناوە. هەرچەندە سەفیرو (ماتیزی) هەموو شاعیرانی رۆمانییان دەناسی. تەنانەت نۆمسەکانیش! بەڵام لە هیچ شوێنێ، نە بە قسەو نە بە نووسین، نەکەوتبووە پێش چاوی. لەگەڵ ئەمەیشدا، (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ) دەگریاو شاعیرەکەی بە (گەورەترین شاعیری رۆمانی) ناودەبرد... دوای ئەم دیمەنە، سەفیر نەیدەزانی چۆن رەفتار بکا. رێزی خۆی پێشکێش

کرد، سەر لە نویێ جەختی کردەوە کە هەواداریێکی ئەم رۆماننووسە گەورەیەیە کە دەگری.

ئینجا لەسەر پەنجەی پێ چووە دەرێ.

سەفیر گوتی:

-دیدارەکەم لەگەڵ (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ) ئاوها بوو!

(ترایان)لە زەینی خۆی گەڕا تا بە بیری بێتەوە ، زەینێکی رۆنی هەبوو.

گوتی:

-دۆزیمەوە!! کاتی خۆی کتێبی ژنێکی ئینگلیزم خوێندەوە، باسی شاعیرێکی رۆمانی دەکا. ناوێکی ئاوهای هەبوو. پاشان پێکەوتم ئەو پیاوە گەنجە چەند بانقێکی لە رۆمانیا هەبوو. هەروەها سەرۆکی چەندین کۆمەڵەی کانو نەفت بوو. ئەو ژنە ئینگلیزە، وەك (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ)، جەختی دەکردەوە کە کابرا شاعیرێکی گەورەیە. بەڵام ئەو گەنجە هەرگیز شیعری بە زمانی رۆمانی بڵاو نەکردۆتەوە. دەیانگوت زۆر قۆز بوو ، قژی رەشو بە گڵوازە بوو. بۆی هەیە بە زمانێکی بیانی نووسیبێتی. من نازانم بە کام زمان؟! لە لایەکی تریشەوە، ماڵی لە رۆمانیا نەبوو. خاوەن بانقێکی گەورە بوو. نووزگەو لقی لە هەموو پێتەختەکانی ئەورووپا هەبوو. دەبێژن نازییەکان لە (پاریس)، یان لە (بروکسێل)، یان لە (ئەمستێردام)، دەستگیریان کردو لە یەکێ لە بەندیخانەکانی جوولەکان مرد. لە بەندیخانەیەکی ئەلمانی، نەك رۆمانی.

چـونکە رۆمانییـەکان نـە بەندیخانـەیان هـەبوو، نـە ژووری گـاز. ئایـا (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ) پێگوتی رۆمانییەکان برادەرەکەیان لەناو بردووە؟

ئەوەی لە ماوەی ئەم دیدارەدا، تێگەییم، تەنیا نـاوی رۆمـانی، تۆقـان و ناکامی (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ) دەرووژێنی و رۆندکی پـێ دەرژێنـێ، بـەلای ئەوەوە، وشەی (رۆمانی) مانای ئەو پیاوەیە کە شاعیرو جوولەکە لەناو دەبا.

(ماتیزی) گوتی:

من بە تەواوی ناوی ئەو خاوەن بانقەم بـە بـیر نایـە. ئەمـە دەبـێ ئـەو کەسە بێ کە (ڤیکتۆریا ئۆکـامپۆ) باسـی دەکـا. نـاوی لـە کتێبـی ژنـە ئینگلیزییەکەدا هاتووە بە ناوی (کلێر شێریدان). ئەویش باس دەکا کـە چـەند چرکەسـاتێکی لەگـەڵ شـاعیرێکی هەڵکـەوتوو و زۆر قـۆز بەسەربردووە، ئەمە دەبێ هەمان شت بێ.

(ماتیزی) نەختێ بیری کردەوە، پاشان گوتی:

-سـبەی بـەیانی دەچـین (ڤیکتۆریـا ئۆکـامپۆ) دەبیـنین. نووسـەرێکی گەورەیە! ئێمە نـابێ بـە دەمـارگیری، وەڵامـی دەمـارگیری بدەینـەوە. تەنانەت ئەگەر (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ) بـە دوژمنـداری وەرمـان بگرێتـەوە، ئەرکی سـەر شـانی ئێمەیـە سـەردانی بکـەین. نووسـەرێکی گەورەیـە. نووسەرێکە لە زینداندا ئازاری کێشاوە! تکات لێ دەکەم لەگەڵم وەرە. بڕوا کەم، تۆ بە بێ جیاوازی، هەموو کەسـت خـۆش دەوێ، چ کـاری

باش بکەن‌و چ کاری خراپ بکەن. ئەمەیش لەبەر ئەوەیە چونکە تۆ شاعیری!

– لەکتێبەکانتەوە تێگەیشتووم تۆ دڵێکی باشت هەیە. بەیانی لەگەڵت دێم. بە یەکەوە، سەردانی (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ) دەکەین.

کارمەندەکەی میوانخانە، کە پەساپۆرتی (ترایان)ی بردبوو تا بلیتی بۆ بکڕێ ، هاتە ژوورەوە.

–تا سێ حەفتە، هەموو کورسییەکان گیراون بۆ (پاریس). تەنیا یەك جێگا ماوە بۆ سبەی بەیانی، سەعات حەفت.

–جێگاکەت گرت؟

کارمەندەکە وەڵامی دایەوە:

–گرتم، بەڵام دەتوانین بیدەینەوە.

(ترایان) بیری کردەوە. کەوتە سەر ئەم دووڕیانە: ئایا سێ حەفتەی تر لە (ئەرژەنتین) بمێنێتەوە؟ یان سەردانی (ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ)ی رۆمانووسی گەورە هەڵوەشێنێتەوە کە رکی لە رۆمانییەکان دەبێتەوە.

(ماتیزی) گوتی:

–ئێستا بلیتەکە هەڵگرە. رای دختۆر وەردەگرم. ئەگەر روخسەتم بدا سێ حەفتەی دی بمێنمەوە، زۆر شادو گوشاد دەبم.

## (٣٦)

دختۆر ئامۆژگاری (ترایان)ی کرد دەست بەجێ سەفەر بکا. ئەمە ئـەو دختۆرە بوو کە ئەو رۆژەی گەیشتە (بۆینس ئایرس) چارەسەری کرد؟.

گوتی:

-هێمانی گەیشتیتەوە ئەوروپا، برۆ بووژانگە. چەند مانگێك پێویستت بە حەسانەوەی تەواو هەیە!!

(ترایان) دەرفەتی نەبوو خودا حافیزیی لــە هــەموو برادەرەکـانی بکـا. سەعات دەی ئێوارە بوو. بە تەلەفۆن خوداحافیزی لە وەزیری- شـاعیر کرد کە (لەو لای سەردەمی ئێستا)ی نووسیبوو. وەزیر گوتی:

-حەز دەکەم روو بە روو خودا خافیزیت لێ بکەم.

(ترایان ماتیزی) جانتاکانی بە کراوەیی لـەوێ جێ هێشت. ملپێچـێکی لـە مل کرد، پالتۆکەی لـە خۆی پێچاو دوای چەند خولـەکێك، دووبـارە لـە پلەکانی (کازا رۆزادا) سەرکەوت. وەزیر هەمان پێشـوازی سـاکارو مرۆڤانەو دۆستانەی لێ کرد. بەڵێنیان دا یـەکتر ببیننــەوە. کـە (ترایـان)

خۆی ئامادە کرد بڕوا، وەزیر، کە کەوتبووە ژێر کاریگەریی ئەم ماڵاواییە، کردییە هەرا. گوتی: دەمانەویست بەڵگەیەکی بەرجەستەی دۆستایەتی خۆمانت پێ بدەین. ئێمەی خەڵکی کیشوەری لاتینی، کاتێ برادەراتی خۆمان دەردەبڕین، بە تەواوی دەری دەبڕین! خانەوادەکەتان ئێستا لە کوێن؟

(ترایان) سەری دانەواند. نەیدەزانی خانەوادەکەی لەکوێن؟

(ماتیزی)گوتی:

-دوا جار، پێش دە ساڵ خەبەرم وەرگرتن!. لە سەرەتای ساڵی ١٩٤٤وە، ئەو نامانەی بۆم رەوانە کردوون، بۆ خۆم گەڕاونەتەوە. شەڕ کەوتە ناوچەکەو کەس‌و کارم لە گوند گوازرانەوە. لەوساوە، خەبەرم نییەو نەمدۆزیونەتەوە.

– دە ساڵە، خەبەرت نییە کە ماون، یان مردوون؟! هەوڵیشت نەداوە پەیوەندییان پێوە بکەی؟!

(ترایان) گوتی:

-هەوڵم نەداوە پەیوەندییان پێوە بکەم. ئەمە لە هەموو شتێ دژوارتر بووە بۆ من. ساڵەهای ساڵ هەموو رۆژێ، رۆژێ چەند جار، ویستوومە لە ریگای خاچی سوور، یان سەفارەتێکەوە، کارتێك، بەستەیەك، وشەیەك، پەیامێکیان بۆ بنێرم. بەڵام وازم هێناوە. قەپم لە ئەنگوستی خۆم دەدا، بۆم نەدەنووسین. هەرچەندە ئاگرم تێبەر بوو بۆ ئەوەی

خەبەریان بدەمێ کە ماوم بەڵام نەمدەکرد.. لە وڵاتی سۆڤێت، پەیوەندی کردن بە دەرەوە، تاوانێکی گەورەیە. سزای توندی هەیە. هەر هاوڵاتییەك پەیوەندی بە دەرەوە بکا، دەبێتە جێی گومانو بۆی هەیە دەستگیر بکرێ. ئەگەر نامەم بۆ بنووسیبان، لەوانەبوو ببم بە مایەی سەرێشەیان. بەڵام ئاوهایش دژوار بوو بۆ من، زور دژوار بوو!، جەنابی بەڕێز! کە نەتوانم وشەیەکیان بۆ بنێرم!! داوای سالوخێکیان لێ بکەم!. من دەمتوانی یارمەتیان بدەم. دەمزانی ئەوان هەموویان لەوێ، ناگزوورن بەلام ئەگەر قوتووە قاوەیەك، یان شەکرێکم بۆ رەوانەکردبان، بەدبەختترم دەکردن!!، بۆیە بۆم رەوانە نەکردوون. بەڵام ئەمە زەحمەت بوو بۆ من، ئێستایش زەحمەتە.

وەزیر گوتی:

-ئێمە دەتوانین نەجاتیان بدەین. دەتوانین بە ئاسانی نەجاتیان بدەین. دەتوانین وا بکەین بێنە ئێرە، یان بێنە ئەورووپا. هەر کوێی تۆ دەتەوێ.

وەزیر بەردەوام بوو:

-ئێمە هەمیشە شاد دەبین کە بتوانین خەڵك نەجات بدەین. ئەمەیە سیاسەتی ئێمە: نەجاتدانی زیندووان! نەجاندانی خەڵك!

ئینجا وەزیر روونی کردەوە، کە بە رێی سەفارەت، هەموو شتێ بە یاسایی دەڕوا.

-ناوی یەکەم‌و ناوی خانەوادەو رەگەزو تەمەنی کەس‌و کارەکانت بنووسە. ئیتر تەواو!! ناوی باوك‌و دایك‌و خوشك‌و براکانت. هەر کوێت بوێ، وا دەکەین بێنە ئەوێ. دڵنیات دەکەینەوە. ناوی ئەندامەکانی تری خانەوادەکەشتمان بدەرێ، ناوی برادەرەکانت، ناوی هەموو ئەوانەی دەتەوێ نەجاتیان بدەی. شانازییەکی گەورەیە بۆ ئێمە، ئەو خەڵکە نەجات بدەین.

(ترایان) گوتی:

-شتی وام بە خەونیش نەدیوە..

وەك بەرد لە جوولە کەوتبوو. هەرگیز بە خەیاڵی دا نەدەهات بشێ کەس‌و کاری ئازیزی لە دونیای سۆڤییێت دەربێنن. هەرگیز بە بیریدا نەدەهات ئەوانەی ئەوێ بتوانن نەجاتیان بێ. لەوێ دەربچن وەك ئەوەی لە زیندان بێنە دەرێ!

وەزیر گوتی:

-پێویست ناکا سوپاسمان بکەی. ئەمانە مرۆگەلی زیندوون‌و ئێمە شاد دەبین بتوانین مرۆگەلی زیندوو نەجات بدەین. ناوەکانیان بنووسەو بیاندە بە ئێمە. ئەوەی تر ئێمە خۆمان دەیکەین!

(ترایان)کەس‌و کاری خۆی هێنایە بەر چاو کە لە تۆقان نەجاتیان بووە. ئەم بیرە ئەوەندە بە سۆ بوو، ئەوەندە گەش بوو، ئەوەندە چاوەڕێ نەکراو بوو، ئەقڵ‌و دڵی، دەسووتاند ، چاوی دەسووتاند. وێنەی چاوەڕێ نەکراوی خزم‌و کەس‌و کاری، کە ئاخیری نەجاتیان

بووه. وەکوو مەرێزەیەکی زۆر بە کلّپـە، زۆر گـەش‌و رۆشـن، هـەموو گیانی گەرم داهێنا. رۆندکی لـە چاوە گەورەو زەقەکانی هات. هەولّی دا بلّیٚ:

-ئەمە گەورەترین سۆزی ژیانی منە!

بەلاّم هیچی نەگوت. هەستی دەکرد دەستی لـە ژێـر فـەرمانی خۆیـدا نەماوە، دەستی درێژ کردو دەستی وەزیری گوشی.

(ماتیزی) وەکوو خەورۆ، گەڕایەوە میوانخانە. ئەم رستەیەی لـە مێشکی خۆیدا دووبارە دەکردەوە: (ئێمە زیندووەکان نەجات دەدەیـن.) بـاوکی یەکیٚ بوو لـە خەلّکی زیندووی (ئیزڤۆر)، دایکی یەکیٚ بوو لـە کەسـانی زیندووی (ئیزڤۆر). (نیکۆلا)و خوشکەکانی، کەسانی زیندووی تربوون، مرۆڤ بوون.

ئـیتر بـیری نـەدەکردەوە: (دایکـم‌و بـاوکم نـەجات دەدەم.) بـیری دەکردەوە: (مرۆڤ نەجات دەدەم.) لەو کاتەدا، (گریگۆر) ئیتر خزمەتکار نەبوو، (گریگۆر) مرۆڤ بوو. هەموویان، خەسیەتەکانی تـری خۆیـان لـە دەست دابوو، تەنیا یەك خەسیەتیان مابوو، مـرۆڤ بـوون‌و ئـەو مرۆڤانـە نەجات دەدران، لەو ولاّتە دەردەهێنران کە وەکو زیندانێکی گـەورە وا بوو. دەتگوت، چوار دیواری زەبەلـلاح‌و شیشەبەندی زیندانە ، مرۆڤی تێدا ئەشکەنجە دەدرا.

(ماتیزی)، لەبەر کەلەجاڕیی دەستی دەلەرزی. ئیتر هێزی نەمابوو جانتاکانی بپێچێتەوە. هێزی نەمابوو هیچ بکا. بە قووڵی بیری لە یەك شت دەکردەوە: لەو زیندووانەی کە نەجات دەدرێن. کە مەسەلەی زیندووەکان دەهاتە گۆڕێ، شتەکانی تر، هەموو شتەکانی تر، هیچ بایەخیان نەدەما!!

(ترایان) داوای لە کارەکەری ژوورەکە کرد جانتاکان بپێچێتەوە. تەلەفۆنی بۆ وەزیر کرد بۆ ئەوەی داوای بوردنی لێ بکا.

-نەمتوانیو ئێستایش ناتوانم بە تەواوی سوپاست بکەم. بمبوورە. کە گەڕامەوە، یەکسەر دوای گەڕانەوەم، بە نامە سوپاست دەکەم.

## (٣٧)

(لەشبوونە) یەکەم وێستگە بوو لە ئەورووپا. (ماتیزی)، کە پێی لەسەر خاکی (پۆرتوگاڵ) دانا، هەستی کرد پێ لەسەر خاکی نیشتمانی خۆی دادەنێ. هەر ئەورووپییەك، کە لە سەفەرێکی دوور دێتەوە، هەمان هەستی هەیە. لەولا، لە کەنارەکەی تری ئۆقیانووس، لێت ناپرسن ئایا خەڵکی فەرەنسە، یان ئەڵمانیا، یان رۆمانیا، یان ئەسپانیای. لێت دەپرسن ئاخۆ خەڵکی ئەورووپای؟ ئێستا (ترایان) گەیشتبووەوە ئەورووپا. چەند رۆژنامەیەکی کڕی. کە یەکەم رۆژنامەی کردەوە، وتارێکی لە دژی خۆی تێدا بینی. بەڵام (ماتیزی) ئازاری بەو هێرش و سووکایەتییانە نەخوارد. رۆژنامە پورتەگالییەکە لە رۆژنامەیەکانی پاریسی وەرگرتبوو. بەسەر خاکی ئەورووپادا، لە سەفەر بەردەوام بوو. دەتگوت بەسەر رۆمانیادا دەفڕێ.

کاتێ، لە پەڕگەی پاریس، گەیشتەوە ماڵێ. شەو بوو. بە پەشۆکاوی دەرگای کردەوە. بیری کردەوە.

-بەم زووانە، باوکم، دایکم و هەموو کەس و کارم، هەموو ئەوانەی نەجاتیان دەبێ، دەست دەدەنە ئەم دەرگایەو دەیکەنەوە.

(ترایان) دەیدیتن، وەکوو ئێستای ئەم، دێنەماڵەکەی. کە پەنجەرەی کردەوە، کەس و کاری هێنایە بەر چاو. لێرە، لەم پاژێرەوە، نەك تەنیا هەوا هەڵدەمژن، بەڵکە ئازادی ئێرە هەڵدەمژن. ئەو ئازادییەی دە ساڵە لێی بێ بەش کراون.

(ترایان) شەکەت بوو. لە ماوەی ئەو دوو مانگەی لەوێ نەبوو، زۆر نامەی بۆ هاتبوو. نەیتوانی مەراقی خۆی بەرزەفت بکا، بە پەلە، دەستی بە کردنەوەی نامەکان کرد. دەتگوت دەیەوێ ئەو پەیوەندییە دووبارە دابمەزرێنێتەوە کە ماوەی دوو مانگ بوو پچڕابوو. بەڵام ئەمانە هەمان ئەو نامانە، هەمان ئەو پارچە بڕاوانەی ڕۆژنامەکانی جاران بوون! هەڵمەتی کۆنی ناوزڕاندنی، بە توندی بەردەوام بوو. چەند گوتارێکیش، ڕەخنەی توندیان لێ گرتبوو کە سەردانی دکتاتۆرێکی کردووە. ئەو نامەو پارچە ڕۆژنامە ژەهراوییانە، تەنیا سێ نامەی هاندانو دڵدانەوەی مرۆڤایەتیو مەسیحییان تێدا بوو. تەنیا سێ نامە! بەڵام ئەو سێ نامە مرۆڤایەتییە، لەبەر چاوی (ماتیزی)، لە سەد زەرف بە سەنگتر بوون کە ژەهرو خراپەیان تێدا بوو.

ئەو سێ نامەیەی کردبوونییەوەو لە لایەکی دانابوون، هەرسێکیان بە (برادەری ئازیز) دەستیان پێ کردبوو. بە مۆری (شارل وێستفال)ی قەشەو (گینیێر)ی قەشەو ( رودن)ی برادەری بوون کە لە (نیس) کتێبخانەی هەبوو.

ئێستا، (ترایان) دەیەویست قسە لەگەڵ یەکێ بکا، تەلەفۆن ئەرا یەکێ بکا. بەڵام هیچ کەسی نەبوو تەلەفۆنی بۆ بکا. چوار ساڵ بوو، هیچ برادەری نەگرتبوو. هیچ برادەری نەبوو، کە گەیشتەوە جێ، بتوانێ پێبڵێ: (ئەوە لە سەفەر هاتمەوە.)

(پاریس) پێنج ملوێن کەسی تێدایە، ناتوانم بە تاقە کەسێك بڵێم: (شادم کە دووبارە دەتبینمەوە.)

بەڵام یەکسەر تێگەیی بوچوونەکەی راست نییە. لە (پاریس)، تەنیا نییە. یەکێ لە دەرگای دا.

گوتی:

– هەڵە بووم کە گوتم تەنیام. نیو سەعات نابێ هاتوومەتەوە، ئەوە یەکێ هاتووە بمبینێ...

(ترایان) دەرکەی کردەوە، هەموو چراکانی ماڵەوە داگیرسابوون. پێی کردبوون. وەك ئەوەی ئەم ئێوارەیە، چاوەڕێی سەردانی باوکی، سەردانی ئەو مرۆڤانە بکا کە لە وڵاتی خۆیان، لە زیندانەکەیان، رزگار دەکرێن

گەنجێکی قژزێڕین لە سەرکۆسپەی دەرگا وەستابوو، بارانییەکی لەبەر بوو. دەموچاوی شەکەت بوو. گەنجێك بوو تەمەنی زۆر لە بیست ساڵی زیاتر نەبوو.

گەنجەکە پرسی:

-تۆ سەیدا (ترایان ماتیزی)یت؟

(ماتیزی) گوتی:

-تکایە بە من مەڵێ (سەیدا)!

گەنجەکە تەوازۆی هێنایەوە کە بەو درەنگە هاتووە.

گوتی:

-من تا سەعات هەشتی ئێوارە، لەسەر کارم. بەیانیان لە کۆلیجم. بە درەنگەوە نەبێ، ناتوانم بێم.

(ماتیزی) گوتی:

-وەرە ژوورەوە، دانیشە! من لەسەفەر هاتوومەتەوە. نیو سەعاتە گەیشتوومەتە جێ.

(ماتیزی) دەیەویست بۆ قوتابییە گەنجەکە باس بکا کە لە (ئەرژەنتین) گەڕاوەتەوەو برادەرانی ئەوێی بەم زووانە، کەس و کاری لە (ئیزفۆر) نەجات دەدەن. (ترایان) ئەم خەبەرەی ئەوەندە بەلاوە گەورە بوو، دەیەویست یەکێکی تری لێ بکاتە هاوبەش. هەندێ شادی هەن دەبێ خەڵکی تری لێ بەشدار بکەین.

کابرای گەنج هەر بە پێوە وەستا بوو. (ماتیزی) پێیگوت:

-تکایە دانیشە.

قوتابییەکە گوتی:

-هاتووم، پەیامێکم بۆ هاوردووی.

(ترایان) گوتی:

-یەکەم جار، دانیشە! جگەرەیەك نافەرمووی؟!

کابرای گەنج زەرفێکی لە گیرفانی بارانییەکەی دەرهێناو بە دەستییەوە گرت.

کابرای گەنج گوتی:

-لە سەفەرێکی (رۆمانیا) هاتوومەتەوە. بەڵام وا زەن نەبەی من کۆمۆنیستم. نا. (کۆنگرەیەکی ئاشتی) لە رۆمانیا هەبوو. داوەتەکەم بە دەرفەت زانی و چوومە ئەوێ.

(ماتیزی) پرسی:

-چوویتە (بوخاریست)و هاتیتەوە؟

بۆ وی، ئەمە شتێکی لە ئاسا بە دەر بوو. دەساڵ بوو، شتی وا کەهال بوو! بەڵام لەو ئێوارەوە کە (ئەرژەنتین)ی جێ هێشت، دەیزانی سەرەڕای ئەمەیش، دەشێ مۆجیزەیەك روو بدا. ئەو کەسانەی دەیناسین، ئەوانیش لە رۆمانیا دێنەوە. وەکو ئەم گەنجە لەوێ هاتۆتەوە.

-پێی ناوێ پێت بڵێم، لە رۆمانیا هەموو عالەم دوا کتێبی تۆیان خوێندۆتەوە. بێگومان، بە نهێنی...

(ماتیزی) خۆشحاڵ بـوو. کتێبـەکانی بـە بیسـتو چـوار زمـان بـڵاو کرابوونەوە بەڵام نەیتوانی بوو بە رۆمانی بڵاویان بکاتەوە.. لـە ویـژدانی نائاگای، وشەی (خوێنەر) مانای (خوێنەری رۆمانی) بوو. شاد بـوو کـە بیستی کتێبەکانی لـە رۆمانیا خوێنراونەتەوە.

گەنجەکە گوتی:

-لـە (بوخاریست)، هەموو رۆمانییەکان باسی تۆیان لـەگـەڵ دەکـردم. قەشەیەك پەیامێکی دامیّ بۆ تۆ. گفتم پێدا هێمـانی گەیشـتمە (پـاریس)، پێتی بگەیەنم.

(ترایان) نامەکەی وەرگرت.

سیمای گەنجەکە ترسی پێوە دیار بـوو. سـامگرتی ببـوو. سـیمای ئـەو ترسەی پێوەبوو کە یەکیّ شتێکی بـە دەسـتەوە بـیّو بزانـیّ ئەگـەر لـە دەستی بەربێتەوە، دەشکیّ! لە دەمو چاوی دەردەکەویّ. ئەو دەستە بـە زەرفەی رایداشتبوو، رێك وەکوو ئەوە وا بوو دەستێك راداشت بکـەین گوڵدانێکی وردو خاشی تێدا بیّ

گوتی:

-پێم ناخۆشە کە ئـەم پەیامـەت پـیّ دەگەیـەنم.! بـەڵام هـەرێم داوە. قەشەی (بوخاریست) داوای لێکردم – ئەگەر نامەکە دەسـتی بەسـەردا بگیریّ– خۆم ئەم شتانەت بـە زار پـیّ رابگەیـەنم: خانەوادەکـەتان، لـە ئاخرو ئـۆخری جـەنگ، کـاتیّ لـەو ناوەیـە شـەڕ بـوو، لـە (ئیزفـۆر)

گوازرانەوە. دوای جەنگ، دایکت، خوشکەکانت، براکـەت گەڕانـەوە دێ. بەڵام باوکت نەگەڕایەوە. هیچیان لـە بـارەوە نـەدەزانی. ئەوانـەی گەڕانەوە، یەکسەر دەستگیرکرانو سورگوم کران ئـەرا رووسـیا. هـەر هەموویان! هەر هێندە گەڕانەوە،!! بـە پێـی دوا دەنـگو بـاس کـە لـە زیندانییەکان وەرگیراوە، دایکتو یەکێ لە خوشکەکانت لە گرتووخانە کۆچی دواییان کرد. بەش بە حاڵی قەشەی باوکیشت، کەس هیچی لـە بارەوە نازانێ. قەت هیچ!! هیچ یەکێ لە خانەوادەکـەتان لـە (ئیزفـۆر) نەماوە.

(ماتیزی) بە بێ جوولـە، زەرف بە دەسـت، گـوێی گرتبـوو. تەماشـای بارانییەکەی دەکرد. پێلووەکانی نەدەجوولانەوە. دەتگوت بۆتـە بـەرد. چاوی تەواو زەق کردبووەوە.

گەنجەکە گوتی:

-گەیاندنی خەبەری وا، خۆش نییبە، بەڵام...

(ترایان)، لـە رەنگی بارانییەکە پێوە، هیچی نـەدەدی. گـوێی لێ نـەبوو کوڕەکە باسی چ دەکا. تەنانەت نەشیدەدی. تـەنیا ئـەو رەنگـە بـۆرەی دەدی کــە دەتگــوت هــەموو ماڵەکــە، هەمووگــەردوونی داگرتــووە. ئەستەم بوو بتوانێ جوولـە بکا.

پاش ماوەیەکی زۆر، لـە پڕ پرسی:

-چت گوت؟

کاتێ گەنجەکە قسەی دەکرد، ئەم، وەکوو ئامێرد لە جێی خۆی هەستا. نامەکەی هەر بە دەستەوە بوو. هێل لەو رەنگە بۆرە هیچی دیکەی نەدەی. چرکەساتێك خۆی بە دیوارەوە گرت. ئینجا چووە سەرشۆرك.

زەرفەکەی نەکردەوە. چرای دانەگیرساند. لە سەرشۆرك، لە تاریکیدا، سەری بە بەردی ساردی دیوار کرد. وای هەست دەکرد خوێن لە دەمارەکانی لە جوولە کەوتووە، ناسوورێتەوە. وای هەست دەکرد ماسوولکەکانی خاو بوونەتەوە. توانای بیرکردنەوەی نەمابوو. دونیا، وەك ئەو دیوارەی تەوێلی پێ کردبوو، ببوو بە بەرد.

ماوەیەکی زۆر، بەم جۆرە، بە وڕی، لە شوێن خۆی بزمارکوت بوو.

- تۆ ناگری؟ (ئەمە یەکەم بیر بوو بە مێشکی (ترایان)دا هات.) تۆ ناگری؟ تۆ هیچ ناکەی؟

(ترایان))، بیرێکی تری بۆ هات. (ئەو گەنجەی لە (بوخاریست) هاتۆتەوە، لە ناو هۆڵەکەیە. لە (بوخاریست) هاتۆتەوە. ئەم نامەیەی ئەرات هاوردووە . فەقیرە، هیچ گوناهی نییە. تۆ تەنیا جێت هێشت. لە پڕ، بێ ئەوەی هیچ بڵێی، رۆیشتیو تەنیا جێت هێشت!.)

(ماتیزی) بە چاوی تەواو زەق، لە تاریکی مایەوە. تاریکی سەرنجی داپۆشیبوو، هەموو گیانی داگرتبوو. لە تاریکیدا نقووم ببوو. بەڵام دوای نەختێ، گەڕایەوە ناو هۆڵ. گەنجەکە نەمابوو. کاغەزێکی لەسەر مێز

جیٚ هێشتبوو. بەر لــەوەی بــڕوا، نــاوو ناونیشــانو ژمــارەی تەلــەفۆنی خۆی، لەسەر نووسیبوو.

(ترایــان) زەرفەکــەی کــردەوە. نامەکــەی خوێنــدەوە. کــە نامەکــەی دەخوێندەوە، چرکەیەك، چاوی لەسەر کاغەزەکە لاکەوت، نیگای، بە نائومێدی، سەرگەردان بوو.

جانتا کراوەکانی لەبەر دەم خۆیدا بینی کە بێ ئــەوەی بــەتاڵیان بکــا، لەو گۆڕە جێی هێشتبوون. لە جانتای یەکەمدا، وێنەی پێشکەش کراوی سەرۆك (پیرۆن)، لەسەر جلەکان داندرابوو، بــۆ ئــەوەی تێــك نەچــێ. (ماتیزی) ئەم قسانەی بە بیر هاتەوە: (ناوو ناونیشانیان بە ئێمە بدە، ئێمــە نەجاتیان دەدەین. ئێمە شادین بتوانین کەسانی زیندوو نەجات بدەین.)

وای هەست دەکرد سەرۆك (پێرۆن)، لە وێنەی ناو جانتای کــراوەدا ، ئێستایش پێیدەڵێ:

(ئێمە دەتوانین نەجاتیان بدەین.)

(ترایان) چاوی نوقاندو بە دەنگی بەرز گوتی:

–تازە ناتوانن نــەجاتیان بــدەن. سوپاســتان دەکــەم. ئــاخر مرۆڤــەکان مردوون. کەسو کاری من، ئەوانەی (ئیزڤۆر)، هەموو مــردوون. تــازە هیچ کەس ناتوانێ نەجاتیان بدا.

(ترایان)، نامەکەی هەر بە دەســتەوە بــوو، لەســەر زەوی درێــژ بــوو، وەکوو ژنان هۆڕ هۆڕ دەستی بە گریان کرد. دووبارەی دەکردەوە:

–تازە هیچ کـەس نـاتوانیّ نـەجاتیان بـدا، هـیچ کـەس!! خەڵکەکـە مردوون. کەس و کاری من مردوون!

## (٣٨)

(ترایان) هەستایەوە. ژیان روخسەت بە مرۆ نـادا ماوەیـەکی زۆر، لـە شادی، یان لـە دەردو بەڵای بێ سنوور، سەرشار بێ‌و پێیـەوە بتلێتـەوە. دەبێ بگەڕێتەوە ژیانی ئاسایی رۆژانە. ژیان رێگای تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئەوەی خەڵك ناچار بکـا بگەڕێنـەوە واقیـع: تێنـوێتی، برسـێتی، خـەو، شەکەتی، ئەمانە هەموو رێگان، ژیان دەیهێنێ تا نەیەڵێ خەڵك ماوەیەکی زۆر لـە دالغەی قووڵ یان لـە رووداوی گەورەدا، بمێننەوە.

(ترایان)، جانتاکانی لـە دەورو بەر بوون. جانتاکان کرابوونەوە هێشـتا بەتاڵ نەکرابوون لـە هەموو شوێنێ بوون: لەسەر کورسـییەکان، لەسـەر فەرش، لـەسەر لاتەخت. هەموو چراکان لـە وارخانەکـە داگیرسـابوون. دەرەوە تاریك بوو. نامەی قەشـەی (بوخاریسـت)، کـە باسـی کردبـوو ئەوانەی (ئیزڤۆر) نەماون، لـە سـەر مێـز دانـدرا بـوو. ناونیشـانی ئـەو قوتابییەی نامەکەی هێنابوو و هاتبووە سەردانی (ماتیزی)، لـە تەك نامەکە بوو. (ماتیزی) زانی چ قەوماوە.

ئەمە هەمووی راست بوو. خـەون نـەبوو. ئـەو حەلـە، لـە ژوورەوە، دەستی بە هات‌و چۆ کرد.

له دڵی خۆیدا گوتی:

-دەبێ شتێ بکەم! بەڵام چ شتێ؟ دەزانم دەبێ شتێ بکەم، بەڵام چم لە دەست دێ؟!

(ترایان) دەرگای سەرشۆرکی کردەوە. ئینجا دەرگای فراخانە. پاشان دەرگای هەموو ژوورەکانو ئێستا بە هەنگاوی خێرا لە ژوورێکەوە دەچووە ژورێکی تر.. بیری دەکردەوە دەتوانێ چ بکا؟ هەر ئەوەندەو بەس! دەیزانی هەڵبەت شتێ هەیە بیکا. بەڵام چ شتێ؟

دەڕۆیشت، دەم نا دەم، ڕەبەلی دەبوو. وەك ئەوەی یەکێ ڕاوی بنێ. وەك ئەوەی لە ژوورێکەوە بۆ ژوورێکی تر هەڵیبرن. تا دەهات خێراترو خێراتر دەڕۆیشت! (ماتیزی) سەرنجی کەوتە سەر بوتڵە کۆنیاکێك لە کاتی ڕۆیشتنی، لەسەر مێزی فراخانە، لە بیر کرابوو.

له دڵی خۆیدا گوتی: (دەبێ شتێ بکەم. هەڵبەت. دەبێ شتێ بکەم. بەڵام چ بکەم؟)

بوتلەکەی هەڵگرتو پێکێکی بۆ خۆی تێ کرد. خواردییەوە. کۆنیاك زاری سووتاند. لێوەکانی سووتاند... لە بیر کردنەوە بەردەوام بوو: (دەتوانم چ بکەم؟ چم لە دەست دێ؟)

(ماتیزی) بە بیری هاتەوە ئەو کەسانەی-وەکوو وی- کەوتبوونە زیندان- فێری چاوەڕی ببوون، فێر ببوون سەبر بگرن! دەیانزانی چاوەڕێ بکەن. ئەو خۆی، لەوێ، فێر ببوو کە ئارام بێ. بەڵام (ترایان)،

هەرچەندە ماوەیەکی زۆر بوو لە ئارامی راهاتبوو، بۆ یەکەم جار، ئارامی خۆی لە دەست دا. ئێستا لە ئارامی نەمابوو. سەر لە نوێ کۆنیاکی خواردەوەو دەستی بە بیرکردنەوە کرد. ئارامی رەهاو تەوتینی تەواو، ئەستەمە بۆ مرۆڤ. تەنیا خودا ئەو خەسیەتە چاکەی هەیە دەتوانێ چاوەڕێ بکاو سەبری هەبێ.

هیچ کەس ناتوانێ بە گوێرەی کات، سەبرو چاوەڕوانی خوایی، بە وردی حسێب بکا. (مرۆڤ، خۆی، ناچارە پەلە بکا، باز بدا، شتێ بکا. بەڵام چ شتێ؟)

جارێکی تر هەندێ کۆنیاکی نۆشی. ئێستا ئیتر کۆنیاك زاری نەدەسووتاند. زاری سووتابوو و لێوەسووتاوەکانی ئەم وشانەی (تاگۆر)یان بە دەنگی بڵند دەردەبڕی:

-(خودایە! کات لە دەست تۆدا بێ پایانە. کەس نییە خولەکەکانی تۆ بژمێرێ... تۆ دەزانی چاوەڕێ بکەی... کەچی ئیمە؟ ئێمە کاتمان نییە لە دەستی بدەین و لەبەر ئەوەی کاتمان نییە لە دەستی بدەین، دەبێ پەلە بکەین تا بە بەختی خۆمان بگەین. ئێمە زۆر بەسەزمانین، ناتوانین رێ بە خۆمان بدەین تاخیر ببین.)

(ماتیزی)، قسەکانی دایکی بیر کەوتەوە کاتێ ماڵەوەی جێ هێشت: (دەزانم دەگەڕێیتەوە. بەڵام دەترسم زۆر درەنگ بێیتەوە.)

خەڵك هەميشە ترسيان لە (زۆر درەنگ) هەيە. ژيانی مرۆڤ كورتە. ئەگەر مرۆڤ بيەوێ شتێ بۆ خەڵكانی ئەم دونيايەو بۆ خۆی بكا، دەبێ پەلە بكا. نابێ ماوەيەكی زۆر چاوەڕێ بكا. خەڵك دەبێ لە كاتی خۆيدا رزگار بكرێن. ئەگەنا، دەمرن. زوو دەمرن. ئەو حەلە كەس ناتوانی هيچيان بۆ بكا. هيچ!!

(ماتيزی)، سەری بەربووەوە سەر بازووی. شاعيران بە كاتژميرێكی گەورە، خولەك دەژمێرن. بە كاتژميری ئەبەدييەت. بەلام ئەمەيش يەكێكە لە دەسەلاتەكانی خودا. لە ژياندا، شاعيران هەقيان نييە خولەك بە كاتژميری ئەبەدييەت هەڵسەنگێنن. ئەگەر بيانهەوێ لەم دونيايەدا، شتێ بە شتێ بكەن، دەبێ وەكوو خەڵكی تر، لەز كەن بلەزينن.

(ماتيزی)، بە گريان، چوو خەوت. غەمی ئەوەی بوو ژيانی خۆی وەكوو شاعيرێك بەسەر بردووە. پەلەی نەكردووە. خەڵ هەقيان نييە ماوەيەكی زۆر چاوەڕێ بكەن. تەنيا خودا ئەم هەقەی هەيە. هەقی چاوەڕێ كردن.

كاتێ (ترايان) سەری قيت كردەوە، سپێدەی دابوو. چرا لە هەموو ژوورەكان داگيرسابوون. يەكێ دەستی لە شانی (ترايان) دا. (ترايان) سەری بلند كردو خۆی وەرسووڕاند بۆ ئەوەی بزانێ كێيە هاتۆتە فراخانە .

كابرای بيانی گوتی:

-دەرگات لەسەر پشت جێ هێشتبوو. لەوانەبوو دزیت لێ بکرێ. زۆر جار شتی وا روودەدا. نابێ مرۆ دەرگا لە سەر پشت جێ بێلێ.

کابرای تازە هاتوو دەستە کلیلەکەی لەبەردەم (ترایان) دانا.

(ترایان) گوتی:

-سوپاست دەکەم!

کابرای لاییدە گوتی:

-قسەم لەگەڵت هەیە.

(ماتیزی) وەڵامی دایەوە:

-جارێکی دیکە. تکا دەکەم، جارێکی دیکە!

کابرا گوتی:

-لەبەر ئەوەی روون کردنەوەت بۆ بەڕیوەبەرایەتی دارایی نەناردووە... زیادەت دێتە سەر...

(ماتیزی) وەڵامی دایەوە:

-جارێکی دیکە. تکات لێ دەکەم!.

کابرا گوتی:

-ئەم ئیشە چارەسەرێکی خێرای دەوێ.

(ترایان)، بێ ئەوەی تەماشای بکا، دەستە کلیلەکەی لەسەر دەرگا لە بیری کردبوو، لەسەر شانییەوە، بۆی درێژ کردو گوتی:

-ئەگەر شتێکت دەوێ، برۆ ناو ماڵێ. هەرچی دەتەوێ ببە! هەموو شتێ هی خۆتە! هەرچی گەرەکتە، ببەو برۆ!

کابرا بە بێ کلیلەکان رۆیشت. بە رەبەڵی رۆیشت، بە نارەزایی بەرامبەر بیانییان کە ئەگەرچی چوارپایان هەیە، سەر بە مێز دەکەنو دەخەون. هەرچەندە ژووری خەوتنیان هەیە، بە هەموو جلەوە، لە فراخانە دەخەون. باسی پەروەردەو سەرفرازی مرۆڤایەتی کرد. باسی ناشارستانیو نارێکی کرد. (ماتیزی) لە رۆژاوا، لەو سەرکۆنانە راهاتبوو. بەڵام لەو کاتەدا، بە هیچ شتێ نارەحەت نەبوو.

چووە ناو هۆڵ. هەموو چراکان پێ کرابوون. لە رۆمانیا، لە (ئیزڤۆر)، کاتێ، مردوویەك لەماڵەوە هەبێ، چراکان، شەوو رۆژ پێدەکرێن. ماڵی (ترایان ماتیزی) زۆری مردوو تێدا بووا. هەموو کەسو کاری مردبوون. هەموو چراکانی بە داگیرساوی هێشتەوە. لەبەر ئەوەی ئەم ماڵە زۆری مردوو تێدا بوو، گوناه بوو چراکان بکوژێننەوە.

سەر لە نوێ، بیری کردەوە: (دەتوانم چ بکەم.) ئینجا پەنجەرەکانی داخست. پەردەکانی دادایەوەو هەموو چراکانی بە داگیرساوی هێشتەوە. جارێکی تر، قسەکانی دایکی بە بیر هاتەوە: ((دەزانم

سەرکەوتوو دەبێ. بەڵام بۆیە دەگریم چونکە دەترسم زۆر درەنگ بێتەوە. لەوما دەگریم.) لە راستیدا، زۆر درەنگ دەگەڕایەوە. ئێستا کە دەیتوانی کەس‌و کاری، لە نیشتمانەکەیان – لە زیندانەکەیان– ئازاد بکا، خزمەکانی وی، کەس‌و کاری وی، مردبوون. لەسەر رووی ئەم زەوییەدا، کە مرۆڤ مرد، کەس ناتوانێ نەجاتی بدا.

لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەرا سەرۆك (پیرۆن) دەنووسم کەسی زیندوو نەماوە رزگاری بکەن.. هەموو کەوتوونەتە ناو گۆڕ.

(ترایان) لەبەردەم ئاوێنە وەستا. گۆناکانی رەش ببوون. لە (رۆمانیا)، لە (ئیزڤۆر)، کاتێ یەکێ لە خانەوادەکەت دەمرێ، گوناحە ریشت بتاشی.

(ترایان) ویستی بچێتە دەرێ. ئەمە یەکەمین جار بوو، بێ ریش تاشین دەچووە دەرێ. کاتێ ماڵ مردووی تێدا بێ، نابێ ریشت بتاشی!

کە خەریك بوو شەپقەی لەسەر بکاتەوە، دەستی راوەستا. لە (ئیزڤۆر)، ئەو کەسانەی مردوویان لە ماڵەوە هەیە، سەرکۆتن!. تا مردوو لە ماڵەوە بێ، پیاو سەریان کۆتە.

(ترایان)، هەموو چراکانی بە داگیرساوی هێشتەوە. بۆ خاتری مردووەکانی، بێ ریش تاشین‌و بە سەرکۆتی، چووە جادە.

چاوەکانی پڕ فرمێسك بوون.

لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە: (پیاو پێویستە هەمیشە بزانێ چ شتێ ماوە بیکا.) لە پلیکانە هاتە خوارێ: (دەتوانم چ بکەم؟ ئێستا، چیم ماوە بیکەم؟)

(ماتیزی)، لە جادەدا، بینی دراوسێکان بە پەرۆشیی، بە چاوی پڕ پرسیارەوە، تەماشای دەکەن. وەکو رێدارانی (هایدێلبێرگ)، ئەو کاتەی (رۆمانی سەردەمی ئێستا)ی دەنووسی، تەماشایان دەکرد. ئێستا بە پەرۆشتریش، بە شێوەی سەرکۆنەکەرێك و بە بێزەوە، تەماشای دەکەن.

بایدایەوەو گەڕایەوە ماڵێ. لەبەر دەرگا راوەستا. دەترسا بچێتە ژوورەوە. پیرەژنی دەرگەوانیش، ماوەیەکی زۆر، بە شێوەی سەرکۆنەکارێك تەماشای کرد. (ماتیزی) پشتی تێکرد.

رۆژئاواییەکان ناسك و شارستانن. حەز دەکەن مرۆڤ هەمیشە ئەدگاری خۆی رێك بخا. ( لە هەموو بارو دۆخێك، خۆی رێك بخا.) ئەمە شتێکی بنچینەییە! (ترایان) نەیتوانیبوو ئەدگاری خۆی رێك بخا. ریشی نەتاشیبوو، جلی شڕ بوو. سەری کوت بوو. بەم جۆرە چووبووە جادە. شتی وا نابێ! مرۆی شارستان، لە رۆژئاوا، شتی وا ناکا.

(ترایان) هەر ئەوەندەی بۆ کرا بچێتەوە ماڵێ.

پیرەژنی دەرگەوان گوتی:

-برووسکەیەکت بۆ هاتووە. یەك خولەکە گەیشتووە.

(ترایان) برووسکەکەی وەرگرت و بێ ئەوەی بیکاتەوە، لە بەرکی خۆی نا. دەیەویست بڕیارێك بدا. ئەنگوستەکانی بەری گیرفانەکانیان دراند. بیری دەکردەوە هێشتا کەسانێ ماون، بەر لەوەی بمرن،دەتوانێ لە ولاتی حۆیان ئازادیان بکا

بێ حەمدی خۆی، برووسکەکەی دەرهێناو داوەکەی پچڕاند. خوێندییەوە.

برووسکەکە لە باوە (ژان)ەوە بووکە پێش چەند مانگێك داوەتی کردبوو، کۆنفرانسێك لە شارێکی گەورەی (بروتۆن) بکا. ئێستا باوە (ژان) برووسکەی بۆ کردووە کە نەچێ، کۆنفرانسەکە نەکا. خەڵکی (رێن) دژی هاتنی (ماتیزی)ن. دەبێ بە کارەسات! جەماوەر خۆپێشاندان دەکەن لە دژی. چونکە هاوکاری لەگەڵ دوژمن کردووە. باوە (ژان) نووسیبووی: (کۆنفراسەکەت لای ئێمە ناکرێ).

(ترایان) برووسکەکەی لە گیرفانی نا.

(ترایان)، لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە: (ئایا من هاوکاریم لەگەڵ دوژمن کردووە؟ هاوکاریم لەگەڵ کام دوژمن کردووە؟ ئەوەی هاوکاری لەگەڵ دوژمن بکا، خاینە! من هاوکاریم نەکردووە. نا. من هاوکاریم لەگەڵ دوژمنی خۆم نەکردووە. من هاوکاریم لەگەڵ دوژمنی خەڵکی تر کردەووە. لێکدانەوەی باوە، ژیرانەیە.. ئەمە

بۆچوونێکی دێکارتییه. ئەوەی هاوکاری دوژمنی نیشتمانی خۆی بکـا، خاین نییه. نا– بەڵام ئەوەی هاوکاری لـەگەڵ دوژمنی وڵاتانی تر بکا– ئەوەی هاوکاری لـەگەڵ دوژمنی خەڵکی تر بکا، خاینه. ئەمەیه ئـەقڵی باوه (ژان)!!

(ماتیزی) چاوی هەڵبڕی بـۆ ئاسمـان. نیگـای بـەرەو ئـەو وارخانەیـه سووڕاند کە هەموو چراکان بۆ مردووە خۆشەویستەکانی پێ بوون.

## (٣٩)

(ترایان ماتیزی) گوتی:

-دانیشه. ببووره، هەرچەندە نیوەڕۆیە، کە پێشوازیت دەکەم، هەموو چراکان داگیرساون. دانیشه. سوپاست دەکەم کە هاتووی سەرخۆشیم لێ بکەی! (دیونیزۆس)، تۆ برادەرێکی راستەقینەی. برادەرێکی راستەقینەو زۆر ئازیز.

-ئاساییە کە هاتووم.

برادەرەکەی (ترایان) فەیلەسووف بوو، ڕێی کەوتبووە فڕەنسا. دانیشت و جگەرەیەکی پێکرد.

(ماتیزی) بە سەنگینی گوتی:

-ئێستا، تۆ دەزانی شتەکە چۆن بوو. تۆ هەموو شتێ دەزانی. من وام دەزانی نووسەر دەتوانێ، بە کتێبەکانی، لە پێناوی نموونەیەکی مرۆڤایەتی، خەبات بکا. ئەمە ڕێگایەکی زۆر سستە. مرۆڤ لێی بێزار دەبێ! کە ئەوان مردن، ئەوسا من هیوام پەیدا کرد رزگاریان بکەم. توانیم، بەڵام زۆر درەنگ. ئێستایش، وەکوو مرۆڤ، دەتوانم خەبات بۆ رزگار کردنی ئەوانە بکەم کە هێمان زیندوون. دەمەوێ تێبکۆشم.

وەکوو مرۆڤ تێبکۆشم. واتە (بە پەلە!). هەموو رێگایەکی بێ نموود بەکار دێنم کە لە مرۆڤ دەوەشێەوە، بەتایبەتی پەلەکردن. ئەو کەسانەی خۆشمان دەوێن و هێشتا لە ژیاندان، خوداو ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەبێ بە کەس رزگار ناکرێن.. تەنیا ولاتە یەکگرتووەکان ئێستایش دەتوانێ زیندووەکان لە زیندانەکانیان رزگار بکا. تەنیا ئەوانن دەتوانن زیندانەکان تێک بدەن و پەردە ئاسنینەکان بپچڕێنن. لەم دونیایەدا، تەنیا ولاتە یەکگرتووەکان دەتوانێ شتێ بۆ کەسانی زیندوو بکا. من، کە هەمیشە بە تەنیا ژیاوم، ئی تەرشە، هەموو هێزی ماسوولکەکانم، مێشکم، دڵم، هەرچی هەمە، دەیخەمە بەر دەستی یانکییەکان. تا یارمەتییان بدەم بۆ نەجاتدانی ئەو زندووانەی خۆشم دەوێن،! کەسانی زیندووی ئەولا.

-لەگەڵ ئەوەیشدا، تۆ لە دژی شارستانێتی میکانیکیی ئەمریکای باکوورت نووسیوە! تۆ هێرشت کردۆتە سەر ئۆتۆماتیزم و (نامرۆڤایەتی)ی ئەو شارستانییە یانکییە.

-ئەم یانکییە (نامرۆڤایەتییانە)، بە خۆو بە شارستانێتی تەکنیکی ئۆتۆماتیکییەوە، تاکە کەسێکن بتوانن کەسانی زیندوو لە زیندانی تاکرەوەکان نەجات بدەن. تەنیا ئەوان! بۆ من ئەوەندە گرنگ نییە کە شارستانێتییان نامرۆڤانە، میکانیك، نەناس و ئۆتۆماتیك بێ مادام بتوانن کەسانی زیندوو لە مەرگ نەجات بدەن!، دەتەوێ چیت پێ بڵێم؟ تاکە شتێکی گرنگ کە ماوە جێ بە جێ بکرێ، ئەوەیە خەڵکی ئەم دونیایە لە زیندانەکان، لە بەندیخانەکان نەجات بدرێن. هیچ کتێبێك

ناگاتە كارى نەجاتدانى مرۆڤ. هەرچیم هەیە دەیبەخشم، بەرد دەتاشم بۆ دروست كردنی رێگا كە یانكیانى ئازادیبەخشی مرۆڤی زیندوو پێیدا برۆن. ئەمە باشترین بەرهەمی من دەبێ. ئەوانەی هێشتا زیندوون، كار بۆ نەجاتدانیان دەكەم. تاخیری ناكەم، چونكە مرۆڤ كاتی زۆر كەمە. ناتوانێ ماوەیەكی زۆر چەمەڕا بێ. دەبێ پەلە بكا.

((دیۆنیزۆس)) گوتی:

زیاتر بیر بكەوە. خوێنەرەكانت تۆیان بە تایبەتی بۆ خاتری بۆچوونی تازەو راستو دروستت دژی شارستانێتی (نامرۆڤایەتی)ی یانكییەكان خۆش دەوێ. ئەمە گیانبازییە تۆ دەیكەی ، گیانبازییەكی گەورەیە!.

(ماتیزی) گوتی:

یانی من خوێنەرەكانم تەفرە دەدەم؟. من پەشیمان نیم. مرۆ كە هەوڵ دەدا زیندووەكان لە كۆیلایەتیو لە مردن رزگار بكا، هەر نرخێك بدا، هیچ نییە.

– بە هەر حاڵ كاتەكە لە جێی خۆی نییە. هەموو مرۆڤێكی رۆشنبیر ركی لە یانكییەكان دەبێتەوە. ولاتە یەكگرتووەكان ئیتر ولاتی ئازادی نییە. تۆ گیانبازییەكی گەورە دەكەی كە لایەنگری ولاتێك دەكەی مرۆڤی تێدا ئازاد نییە. تۆ بیر لەم هەموو راوەدوونانە بكەوە لە ولایەتە یەكگرتووەكاندا، دژی رۆشنبیران كرا. بیر لە رۆیشتنی (تۆماس مان)و (شاپلن)، لە بەیانی (ئەنشتاین) بكەوە. ولاتە یەگكرتووەكان ئیتر ولاتی ئازادی نییە.

-دەتوانیێ کەسانی زیندوو، لە کۆیلایەتیو لە زیندان، نەجات بدا. من بە هەڵبژاردنی ئەمریکا، پەیکەری ئازادی هەڵنابژێرم. ئەم هەڵبژاردنە هیچ پەیوەندی بە پەیکەر، یان بە ناوی پەیکەرەوە نییە. بەڵکو پەیوەندی بەو کارەوە هەیە کە تەنیا ئەمریکا دەتوانیێ بیکا: رزگارکردنی کەسانی زیندوو. من، وەکوو مرۆڤێك، دەچمە پاڵییەوە، من، ئەو پیاوەی بە تەنیا سەفەر دەکا، بە دڵسۆزیو بە سەربەرزی، بە هەموو هەستو شەوقەوە، دەچمە پاڵییەوە تا کەسو کارەکەم نەجات بدەم. تێگەیشتی؟ بەوپەڕی دڵسۆزی لەگەڵی دەبم. من، بە تەنیا، ناتوانم هیچ بکەم! ئەو، ئەگەر بیەویێ، دەتوانیێ هەموو شتیێ بکا. من، ئێستا، کە لاجانگەکانم ماشو برنج بووە، سەفەری تەنیاییم کۆتایی هاتووە. ریگام گەیشتۆتە سەر، چۆتە ناو کۆمەڵێك، بۆ تێکدانی زیندانەکانو پچڕاندنی زنجیری مرۆڤە دیلەکان تێدەکۆشن. خەنی لە خۆم کە ئیتر تەنیا نیم.

(دیونیزوس) گوتی:

-ئاگادار بە! ئاگادار بە! ئەم کارە تووشی سیاسەتت دەکا. ئەمە بڕیارێکی دەرەکە.

(ماتیزی) گوتی:

-سیاسەت؟! ئێوەی رۆژئاوایی، وشەی (سیاسەت)، تا رادەی هیستیریا دەمارگیری کردوون لای ئێوە، هەموو شتیێ سیاسەتە. وشەکە دەتانچەوسێنێتەوە. بۆ خاتری سیاسەت، شتی بنچینەییتان لە بیر کردووە. من گەرەکمە مرۆڤ لەزنجیر- بە مانای راستەقینەی وشەکە-

و لە لە زیندان- بە مانای راستەقینەی وشـەکە، ئـازاد بکـەم. ئـەنگۆ ئەگەر بەمە دەڵێن کاری سیاسی، ئەمە پەیوەندی بـە خۆتانـەوە هەیـە. من تەنیا کاری مرۆڤ دەکەمو-هیچی تر.

(ماتیزی)و(دیونیزۆس)، لە جـادەدا، لــە گفتوگۆکـەیان بـەردەوام بوون. لە ماڵەوە، چـراکان، بـۆ خـاتری مردووەکـان داگیرسـابوون. (ماتیزی)، هیوای رزگاربوونی مرۆڤی لە چاو (داگیرسابوو.

-لەو کاتەوە کە لە رۆژاوا دەژیم، تێگەیشتووم مرۆڤ دەبێ خـۆی بـە لایەکدا ساغ بکاتەوە.. مرۆڤ ناتوانێ بە تەنیا بێ . مـرۆڤ دەبـێ لایـەك هەڵبژێرێ.

(دیونیزۆس) گوتی:

-تۆ دەبێ بە پێی بەرژەوەندی، شتێ هەڵبژێرێ. تۆ هەقت نییە هەرچـی هەبێ هەڵیبژێری.

(ترایان ماتیزی) گوتی:

-من بەرزترین ئامانجم هەڵبـژاردووە کـە دەشـێ مـرۆڤ لەسـەر رووی زەوی هەیبێ: نەجاندانی کەسانی زیندوو.

دوو برادەرەکە، لەسەر پیادەڕۆی شۆسەی ئەو شەقامە وەستان کـە لە بەنـدەری پاریسـەوە بـەرەو (ڤێرسـای) دەچـوو. شـەقامی (رایـن) هاتوچۆی چڕی بەسەرەوە بوو. چاوەڕێیان دەکرد بپەڕنەوە.

-لەمڕۆوە، ئیتر هەرگیز بـە تـەنیا سـەفەر ناکـەم. هەمیشـە لەگـەڵ خەڵکی تردا دەبم. بۆ ئەوەی مرۆڤ رزگار بکەم.

کاتێ لە شەقامی (راین) دەپەڕینەوە، لۆرییەك وەك برووسکە بە لای چەپدا بایدایەوە. (ماتیزی) لە بن پێچکەکانی بزر بوو. دەنگی ئیستاپ هات، لەسەر قیڕی جادە سیڕەی لێوە هات. بوو بە هاتو هاوارو ئینجا دەنگی فیکەی دوورو درێژ. پۆلیس بە کۆمەڵ هاتن. خەڵك گردبوونەوە. هاتو چۆی ترومبێلان وەستا.

(ترایان ماتیزی)، کە چاوی کردەوە، دیتی لە ناو ترومبێلێکی فریاگوزاری چیپ سپی، پەنجەرە گەورە، لەسەر تەختێك درێژ کراوە. ترومبێلی فریاکەوتن بەوپەڕی خێرایی دەڕۆیشت.

(ترایان) لە دڵی خۆیدا گوتی:

– دیسان بە تەنیا سەفەر دەکەم! ئەمە دوا سەفەرمە وەکو مرۆڤێکی تەنیای دونیا!. چ بمرمو چ لە ژیاندا بمێنم، ئەم سەفەرەی ناو ترومبێلی فریاگوزاریم، دوا سەفەرم دەبێ وەکوو مرۆڤێکی تەنیا.

(ترایان) تاماری بەسەر چاودا داهات.

(ماتیزی) لە دڵی خۆیدا گوتی:

–دەشێ بمرم. بەڵام حەز ناکەم هەنووکە بمرم... دەبێ (دیۆنیزۆس) لە کوێ بێ؟ هەڵبەت بە دووماندا دێ...

سەر لە نوێ، هەستی کرد دەبووریێتەوە. دەنگی دڵپسێنی هۆڕنی ترومبێلی فریاکەوتنی لە جاران تیژترو لە دوورەوە دەهاتە بەر گوێ. ویستی بزانێ ئاخۆ هێشتا هۆشی لە خۆی ماوە، یان نا؟ لە سەر تەختەکەی، لە پەنجەرەی ترومبێلی فریاکەوتنەوە، تەماشای کرد.

به زەحمەت چاوی سووڕاند. بە هەموو جوولانەوەیەك ئازاری دەخوارد. لە پەنجەرەوە، لێری (بوولۆین)و ماڵی خۆشی (ئاندرێ مالرۆ)ی نووسەری بینی. ناسینییەوە. شاد بوو کە ناسینییەوە. ئەمە مانای ئەوەیە کە هێشتا هۆشی لە خۆی ماوە.

بە گشتی، من هەرگیز تەنیا نەبوویم. هیچ کەس لەسەر رووی زەوی، تەنیا نییە. چونکە هەمووکەسێك کە بە رێگادا دەڕوا، لەتەك خوادا دەڕواو خودایە، کە لە سەر زەوی‌و لە ئەبەدییەتدا، رێنمایی هەنگاوەکانی دەکا...

لە نشکەوە، بیری وەك دەزوویەك، پچڕا. بێهۆش بوو!

کاتێ سەر لە نوێ، چاوی کردەوە، لەناو هۆڵێکی سپی، لە ناو نوێنێکی سپی بوو. کەسانی سپیپۆشی لە دەورە بوون. سپیپۆشەکان گفت‌وگۆیان دەکرد. یەکێکیان گوتی:

– دەبێ دەست بە جێ عەمەلیاتی بکەین. دەبێ زوو کارتی تایبەتی پێناسەی بۆ رێك بخەین. هیچ پێناسەی نییە. تەنیا ئەم برووسکەیەی لە گیرفان بوو. ئەویش ناوو ناونیشانەکەی دڕاوە. تاکە پێناسەی ئەم برووسکەیەیە. پێناسەکەی ئەمەیە:

(بۆ کۆنفرانسەکە مەیە (راین). ئەگەر بێی، جەماوەر تووڕە دەبن.– باوە ژان)

پاریس، چواری کانوونی دووەمی ١٩٥٤

# ناوەکان

ناوە تایبەتییەکانی ناو رۆمانەکەم بە نووسینەوەی خۆی داناوە وەکوو لە ناو رۆمانەکەدا هاتووە بۆ ئەوەی خوێنەر لە چۆنیەتی دەربڕینی ناوەکان دڵنیا بێ.

ئاندرێ ژید (Andre Gide)

ئیزڤۆر (Isvor)

ئیڤا پێرۆن (Eva Peron)

ئیلی (Ilie)

بادیا (Badea)

بالتزی (Baltzi)

بەگ (Bug)

برازۆڤ (Brasov)

بروکسێل (Bruxelles)

بۆریسلاڤا (Borislava)

بوولۆین (Boulogne)

بوێنۆس ئایریس (Buenos Airis)

بێسارابی (Bessarabie)

بیسیۆلا (Biciola)

پاریس (Paris)

پروت (Pruth)

پوپلیێ (Peupliers)

پۆرتوگال (Portugal)

پۆل (Paul)

پێرۆن (Peron)

تاگۆر (Tagore)

ترایان (Traian)

تۆپۆر (Topor)

تودۆر (Tudor)

تۆماس مان (Thomas Mann)

تیتۆ (Tito)

تیتوس (Titus)

تیۆدۆر جێی (Thodod J.)

جانکۆی (Djankoy)

چیلی (شیلی) (Chili)

داماس(دیمەشق) (Damas)

دراگا میکایلۆڤیچ (Draga Micailovich )

دریزدی (Dresdi)

دنی یێستەر (Dniester)

دۆفین (Dophin)

دیۆنیزۆس (Dionisos)

راین (Reine)

رۆبەر (Rbert)

رودان (Rudin)

رۆزاریۆ (Rozario)

ریَن (Rennes)

ریَنیێ ماریا ریلکە (Rainer Maria Rilke)

زۆکۆت (Zokott)

ژان (Jean)

ژولیو مانیو (Juliu Maniu)

ژۆهان (Johan)

سان لوی (Saint- Luis)

ستانکۆف (Stankof)

سرب (Serbe)

سەکەنهایم (Sekenheim)

سۆرۆکا تیگینا (Soroca Tighina)

سێباستۆپۆل (Sebastopol)

سیبیریا (Siberie)

سیشمیجین (Cishmigin)

سیلڤیا (Silvia)

شاپلین (چاپلین) (Chaplin)

شارل وێستفال (Charles Westphal)

فرانکفۆر سور لە مان (Francfor-sur-la-main)

ڤاتیکان (Vatican)

ڤازیل لۆنێسکۆ (Vasile Lonesco)

ڤیەننا (Vienne)

ڤیکتۆریا ئۆکامپۆ (Victoria Ocampo)

کارپات (Carpathes)

کالیا ڤکتۆریا (Calea Vctoriei)

کرۆنبێرگ (Kronberg)

کرێملین (Cremlin)

کریمی (Crimee)

کلێر شێریدان (Claire Sheridan)

کۆنستانتزا (Constantza)

کیشینەڤ (Kichinev)

گاینییێر (Gagnier)

گریگۆر (Grigore)

لەشبوونە (Lesbonne)

لۆران (Lauran)

ماتیزی (Matisi)

ماتیڤیسی (Mateevici

مارسیلیا (Marsaille)

مانهایم (Manheim)

مۆلداڤیا (Moldavie)

مۆنگۆل (Mongol)

میتیلنیو (Mitilneu)

میرۆن (Miron)

نورێمبێرگ (Nuremberg)

نیس (Nice)

نیکۆلا (Nicolas)

نیکۆلایڤ (Nicolaew)

هایدێلبێرگ (Heidelberg)

هوگۆ ئۆسوالدینی (Hugo Oswaldini)

هێدویگا (Hedwiga)

# فەرهەنگۆک

ئاس: بێزار، وەڕس. دەڵێن: ئاسم برِا

ئاستەنگ: کۆسپ، لەمپەر

ئەرا: بۆ. چم ئەرا مال: دەچمەماڵەوە

ئەرِنۆ: لەوجرِ، حاقد

ئی تەرشە: ئەم جارە. ئی:ئەم. تەرش: جار

ئەژدەر: ١- عەزیا، ماری گەورە. ٢- بەلەمێکی جەنگاوەرە لە ناو ناقوور بۆ راونالی کەشتی دوژمن.

ئەفەرۆز: دوور خرانەوە، سورِگوم کران

ئەوانیتکە: ئەوانی دیکە، ئەوانەی تر

ئەورا: نێز، برسی

ئورزە: توانا. فلان بە ئورزەیە واتە بە تواناو لێهاتووە

بابۆڵە: پارووی درێژو ئەستوورو بە ئاواخن کە بە سەر پێوە دەخورێ. لەففە.

باز: ١-کەرخ.٢- باڵندەی بەناوبانگی باز

باسۆڵێ: مەلۆتکە، بابۆڵێ

بەرچافك: چاویلکە، عەینەك

بەدەو: جوان

بەرك: گیرفان، باخەڵ، دەرکڵ

بەریّ: بەڵام. وەلێ. دەڵێن: (دەهاتم، بەریّ، پێم نەکرا)

بەزگ: غەمبار

بژی: ١- یاڵ، مووی درێژی سەر ملی هەندیّ گیاندار وەکوو وڵاغی بەرزەو شێرو ئەمانە. ٢-ئیشتیا، ئارەزووی خواردن. دەڵێن: هیچ بژی خواردن ناکەم، واتە ئیشتیام نییە.

برەسان: شۆڤار، زماندز، سیخوڕ

برناخ: دفنك، کونە کەپوو، فرنك

بزاق: زەق. بۆ چاو بەکار دیّ.

بنەبان: لای هەرە سەرەوەی ژوور.

بووڵە، بووڵی: مشکی، خۆڵەمێش، خۆڵەکەوە، خوولی

بیّ پیڤان: بیّ پیوان، بیّ سنوور، بیّ پەی، بیّ شۆ. وەکوو دەشتێك یان دەریایەك کە بنی دیار نەبیّ.

بیانگە: بیانوو، هێجەت، هەنجەت

بیبانی: بێلان، دەربەدەر، سەرگەردان، بیّ نەوا، گەوشەك

پاخروا: بیّ پەتی، بیّ خواس، بیّ خاوس

پاژێر: پەنجەرە. گۆڕانی (نج) بۆ (ژ) لە کوردیدا، لە زۆر وشەی تردا هاتووە: وەکوو: تانجی- تاژی، کونج- کوژی، تیجە- تیژە، ئامانج-ئاماژ،ئاماژە، هەنجیر- هژیر..

پاشەنگ: تاقمی دوای کاروان، یان خێڵ یان لەشکر لە کاتی جوولانی لە جێگایەوە بۆ جێگایەکی تر. ئەمە بەرامبەر پێشەنگ دەوەستێ کە ئەو تاقمەیە لە پێشەوەی خێڵو کاروانو لەشکر دەڕۆن.

پافارِ: لنگگۆڕ. کە یەکێ لنگە پێڵاوەکانی بە پێچەوانە لە پێ بکا: لنگی راستە لە پێی چەپە بکاو لنگی چەپە لە پێی راستە بکا. یان ئەگەر هەردوو لنگی هی یەك پێ بن: راستە، یان چەپە.

پاشێر: گیایەکە لە شێوەی پێی شێردایە

پاملێ کردن: پێداگرتن، سووربوون

پەتەك: گەروونێشە.

پەڕاوی: پەڕەی تێ کردنی جگەرە.

پەرتەك: تاقەت: پەرتەکی بڕا: تاقەتی نەما

پەرژەنامە: ئیستیمارە

پەرك: بێ بەر. لە بنچینەدا ناوی دارێکە لە کۆمەڵەی دار بیو بێ بەرە.

پەلەخاندن: تەقاندنەوە

پەلەك: جوولە. پەلەکی بڕا: جوولەی بڕا

پەلەماشێ: پەلەکوتێ. وەك نابینا کە دەڕوا پەل لە دیوارو شتی وا دەکوتێ.

پشك: عەینەن. ڕێك وەکو. فلان پشك بابێ خۆیە: تەواو لێی دەچێ

پێترانك: قەشمەرجارِ، گاڵتەجارِ

پێوە: بێجگە لە، هێل لە، بیلّ لە، خینژی

تاخ: گەڕەك

تاخورك: گالیسکەی سەر بەفر کە سەگ رایدەکێشن

تاق: ١-دان: نیوەی رۆژ. لە رۆژهەڵاتەوە تا نیوەڕۆ، یان لە دوای نێوەڕۆوە تا رۆژئاوا. ٢- تاقبوونەوە: دابڕانو جیابوونەوە. کابرا لە خەڵکەکە تاق بووەوە.

تەبەش: ناوچەوان، هەنیە، تەوێڵ پشنی.

تەڕە: میوە، بەری درەخت. تەڕەو سەوزە جیاوازییان لە ناوکەکەدا. ئەگەر ناوکی هەبێ تەڕەیە، ئەگەر ناوکی نەبێ سەوزەیە.

تەسیارگە: ژووری پاسەوانی: لە بەندیخانەو سەربازگەو نەخۆشخانەو ئەو شوێنە گشتییانە.

تەگرك: تەزرە

تەوش: شل، شلو خاو

تەواندن: دانەواندن

تەوتین: تەوات، سەبر گرتن، بەرگە گرتن

تفنك: بڕناخ،کونی کەپوو.

تل: ورگ. لە کرمانجی سەروودا هاتووە: (فراڤینی گاوانی، چ لە تلی، چ لە ملی.) واتە خواردنی گاوانی چ لەناو ورگی بێ، واتە خواردبێتیو چ لە ملیێ بێ، واتە لە ناو توێشەبەرە بێو بە ملی دادا بێ. شتێکی وایش لە زاری ناوەڕاست هەیە. دەڵێ: (نانی شوانی چ لە هووری، چ لە تووری.) هوور: هوورگ، ورگ. توور، توورەگە، توێشەبەرە

تۆق: هێز. بێ تۆق: بێ هێز..

تێشت: جەمی بەیانی. چێشتیشی بۆ بە کار دێ، ناشتا.

رۆژێ، سێ جەمی سەرەکی هەن: تێشت (چێشت)- بەیانی/ فراوین (نیورۆ)- نیوەڕۆ / شیو- رۆژئاوا. لەگەڵ دوو جەمی ناسەرەکی: بانیێلی- کاتی چێشتەنگاو/ پالەرزە- وەرگا (عەسر). جگە لەوەی رۆژووگر لە مانگی رەمەزاندا، رۆژێ تەنیا دوو جەم لە تاریکی دەخوا: پاشیو (پارشێو)- پێش بانگدانی مەلای بەیانی تا داوی سپیو رەش لە یەك جیا دەکرێنەوە./ فتار (بەربانگ)- دوای رۆژئاوا بە پێنج خولەك، کە مەلای ئێوارە بانگ دەدا.

تێل: تەلەفۆن. لە تێلێی دا: تەلەفۆنی کرد. ئەم دەستەواژەیە لە لاوکان زۆر بە کار دێ.

جەبەر: ئەوبەری رووبار.

جەمبوون: کۆبوونەوە، خڕبوونەوە، تۆپبوون

جلاوێز: عەلاگەی جل پێوە کردن.

جین: جوولان

جیرە: بەشە ئازووقە.

جێنووك: لاچەرە، لاجانگ، هەردوولای سەر، لە ئاستی گوێچکەکانەوە

چەلین: گۆرەوی خۆری ئەستووری خۆماڵی. بە تایبەتی بۆ زستانو لە ناوچەی سارد لە پێی دەکەن.

چەمەڕا: چاوەڕێ. لە هیڤی بوون.

چتۆ: چۆن. کتۆ. دەڵێن فلان چتۆ کوڕە.

چنك: پارچەی ورد. بۆ نان بەکار دێ. چنکەنان

چوونە دەست: دەست گوشین بۆ چاكوچۆنی.

چیتکە: چیدیکە، چیتر

چیپ: تەواو. چیپ سپی: تەواو سپی.

حەجمان: ئۆقرە. حەجمانی لێ برا

حەمد: ئەنقەس: بێ حەمدی خۆی وای کرد: بێ دەستی خۆی وای کرد، بێ ئەنقەس وای کرد.

حەنەك: گاڵتە، قەشمەری

حەناس: ئاست: کەرخ

حدوور: تاقەت. هەمیشە بە نەفیو بۆ ولاغ بەکاردێ. دەڵێن: ولاغەکە بێ حدوورە واتە بێ تاقەتە

خاترجەم: دڵنیا، ئارخەیان

خانەگومان: پیاوی دڵپیس بەرامبەر ژنەکەی، پخمە

خەبار: مەترسی، دەرەك

خەڵ: کورتکراوەی (خەڵك)ە. خانیو حاجی ئەم وشەیان بەم شێوەیە بە کار هێناوە. من پێم وایە ئەسلی وشەکە (خەڵ)ە نەك خەڵك . (ك) نیشانەی ناوە لە پەهلەویو لە زۆر وشەی کوردیدا ماوەتەوە وەکوو: سە- سەگ، رێ، رەگ، کەڵ- کەلك، خەڵ- خەڵك، سەرشۆر- سەرشۆرك، دەستشۆر- دەستشۆرك، مۆر- مۆرك، سۆر- سۆرك، تل-تلك، سەر- سەرك (سەرکە پیواز، یان سەرکەستوور)، دا- داك، باو- باوك، هتد

خەلا: گرانی، نەهاتی

خەملگە: حەشیمەت، حەشامەت، شەماتە، قەرەباڵغی، ئاپۆرە

خڕبوونەوە: گردبوونەوە، کۆبوونەوە

خولق کردن: فەرموو لێکردن. خولقی کرد چایەکی لەلا بخواتەوە. گۆران دەڵێ: (بەڵام تا خولقی نەکا چێشتەنگاو نایەتە ناو دێ پڕشنگی هەتاو)

خیزان: هەژار، نەدار، زیڤار، دەستکورت، نەبوو.

خێنژی: بێجگە لە، هێل لە، بێل لە، پێوە، لەو بەدەر

داك: دا، دێ، دایك

دان: تاق: نیوەی ڕۆژگار. ڕۆژ دوو دانە: دانی سبەینێ: لە ڕۆژهەڵاتەوە تا نیوەڕۆ. دانی هێوارێ: لە دوای نیوەڕۆوە تا ڕۆژئاوا.

دانعەمر: بەساڵا چوو، پیر، کاڵ

دانووسان: خۆ مەلاسدان. خۆی لێ دانووساند: واتە خۆی لێ لە پەنا گرت بۆ ئەوەی بزانێ چ دەکاو کوێوە دەچێ.

دایەگ: سستەر، ماسێر، ئەو ئافرەتەی خزمەتی نەخۆشان دەکا.

دەپ: تات، تەخت. تەختەڤوڕی سوورکراوە، یان تەختەدار

دەرەك: خەبار، مەترسی، خەتەر

دەهری: زۆر تووڕە

ددان: دگان، دان

دژوون: پیس. بە تایبەتی بۆ لەش و جلو بەرگ بە کار دێ. دەڵێن جلکەکانم دژوونن، دەبێ بیانشۆم. یان دەڵێن: بەو زستانە، سێ مانگە خۆم نەشووشتووە، زۆر دژوونم. ناشوێرم خۆم بشۆم. کە زستانان خۆم دەشۆم، تووشی لەمێشە دەبم.

دڕدۆنگ: ڕارا، دڵ لە دڵ دان

دژگوون: هەژار، دەستکورت

دگان:ددان، دان

دکنی: دژوون. پیس

دڵشەوات: دڵسووتێن

دڵچێ: ئەوەی دڵێکی باشی هەبێ. باڤچێ: ئەوەی باوکێکی باش‌و پیاوی هەبێ. هەروەهایش: کارچێ ئەوەی کاری باش بکا.

دوڕ:ناو، هوندوڕ. دوڕ چاو: ناو چاو. لە دوڕ ژووریێ: لە ناو ژووری. لە دوڕ قوڕێت نیم.

دووز: تەخت‌و پان

دووزبەی: دووسبەی. پاش دوو ڕۆژی تر

دمق مان: ڕامان‌و دامان، هێل بوونەوە، توون بوونەوە..

دیلماج: وەرگێڕ. بەتایبەتی وەرگێڕی بە زار.

ڕاز: ١- چیای ڕك‌و ماهی. ٢- نهێنی.

ڕازان: خەوتن، نووستن.

ڕتاخ: کرتۆپە، پەتاتە

ڕاگێڕان: پیس کردن، لەوتاندن، ئاڵوودە کردن

ڕەبەلی: تووڕەیی.

ڕەهوان: وڵاغێك کە بە نەرمە غار بڕوا.

رکە: ملـملانە

رنین: لێکردنەوەی بەری گەیوی بیستانو درەخت.

رۆندك: فرمێسك، ئەسرین، ئەسر.

ریچۆل: ریچاڵ مرەبا

زاخ: غیرەت. بێ زاخ: بێ غیرەت، بێ دەمار

زارەترەك: زراوچوو. (زار: واتـە زراو. تـرەك( رەگـی ترەکینـە کـە دڕانو شـەق بوونە). واتە ئەوەی زراوی تەقیوە. ئەوەی زۆر بترسێ رەنگـی زەرد دەبـێ. هـۆی زەردبوونی رەنگی ئەوەیە زراوی زیاد لە پێویست دەڕژێتـە نـاو خـوێنو لــە دەمو چاوو پێستەی لەشی دەردەکەوێ. ئەمەیش لە بیر نەکەین. وشـەی (تـرەکین) کـە مانای تەقینو شەقبوونە بۆ زانی هەندێ گیانداری وەکوو سـەگـو تاژیو پشیلە بـە کار دێ. دەڵێن دێڵە سەگەکە ترەکیوە.

زارۆك: منداڵ بچووك، زارۆ

زانکۆ: بەلای منەوە دارشتنی وشەی زانکۆ لــە (زان) رەگـی (زانـین)و (کـۆ) کـە خڕکردنەوەیە بە پێی هیچ نموونەیەکی وشەسازی کوردی نـەهاتووە. بـێ ئاگایـەك لە وشەسازی کوردی بە هەڵە دایهێنـاوەو زۆر بـە داخـەوە هەڵەکـە رۆیشـتووەو ئێستا هەموو کەس بێ بیر کردنەوە لە بنچینەی وشەکە، بە کاری دێنـێ. بـە لای منەوە (زانگە) دروستترە. لەسەر شێوەی کێڵگە.(رەگ+گە)

زەین دێ: سـەح کێ، تەماشا کە. چاو دێ، سەیر کە

زرانی: ئەژنۆ، چۆك، یەرمە، رێزڵـە

زڤڕین: هاتنەوە، گەڕانەوە

زی: ١- یاخە. دەڵێن: (زی خۆی لەبەر دادڕی) . ٢- جۆرە دڕکێکە.

زیباڵ: کەشتنیگەڵ، ئوستوول

زیڤار: هەژار، دەستکورت، نەدار، نەبوو، خیزان

ساخور: جێگەی رووتانی ناو لێڕ

سالوخ: خەبەر، ئەم وشەیە لە لاوکاندا زۆر بە کار هاتووە.

سەردخانە: ئەو ژوورە بەستەڵەکەی لە نەخۆشخانە جەنازەی مردووانی تێدا هەڵدەگیرێ تا بۆگەنی نەبێ.

سەرشار: پڕ کە لە سەری بڕژێتەوە

سەرشۆرك: گەرماو، حەمام

سفێفە: ئەو پارچە قوماشە تەندروستییە تەنك‌و نەرم‌و روونەیە کە برین‌و شوێنی بە ژانی لەشی پێ دەبەسرێتەوە.

سورِگوم کران: دوورخرانەوە. زۆر جار بۆ جوێنیش بە کار دێ: (بڕۆ، هەی سورِگوم!)

سۆزی: سبەی، بەیانی.

سوو: ١- خەفەت بۆ خواردن. دەڵێن: سووم لێ بووەوە. یان بە مانای سووق دێ دەڵێن: سوێم بووەوە. ٢- گومان، خش ٣- تینی کەمی سەرما. دەڵێن: ئەمڕۆ سووی ساردە.

سیپەلك: سی

شاردنەوە: ١- لەبەر چاو بزر کردن. ٢- ناشتن: مردووەکەیان شاردەوە. واتە ناشتیان.

شارستان: خەڵكی شار. ئەوەی لە شار دەژی. دەڵێن فلان شارستانە. واتە خەڵكی شارە. هەرچەند (ستان) بۆ شوێنە. بەڵام لێرەدا بۆ خەڵكی شار بە كار دێ. وشەی (مێرووستان)یشمان هەیە كە لە بنزاری سۆرانی بۆ مێروو بە كار دێ. نەك بۆ شوێنی مێرووەكان. بۆ شوێنی مێرووەكان (شارە مێرووستان) بەكار دێ.

شاقەڵ: داوێنی كەواو ساقۆو بەرگی شۆڕ

شاك: لێهاتوو، ژێ هاتی، هەڵكەتوو

شانشین: بانێژە، بەلەكۆنە.

شایی: ١-سەماو هەڵپەڕكێ، گۆوەند. ٢-كەیف پێهاتن. شایی پێ دێ: كەیفی پێ دی

شەقاو: شاقاو، هەنگاو، پێنگاۆ

شەماتە: قەرەبالغی، حەشیمەت، حەشامەت، جەماوەر. خانی دەفەرموێ: (هەر بەر دەرەكێ شەماتەیەك لێ)

شەنی: كرێت، بۆ مرۆۆ بەكار دێ.

شەمچە: كفتك، شخارتە. شقاتە

شەهت: كەم ئەندام، خاوەن پێویستی تایبەتی.

شمەك: جلو بەرگ. بۆ كەلو پەل بە كار نایە چونكە دیومە بە هەڵە بۆ كەلو پەل بەكاریان هێناوە.

شۆ: سنوور. بێ شۆ: بێ پەیو سنوور

شیشكە: شیشەیەكی ئاسنی باریكو لووسە ناو لوولەی تفەنگی پێ پاك دەكرێتەوە.

شێن: دانیشتوان. خەڵکی ئاوایی.

شینباو: مەیلەو شین، ئاماڵ شین. .

عەلرین: توورەبوون

فەڕاح: وراق، هەراو، فراوان

فراخانە: چێشتخانە، مدبەق، ناندین. لە ((فراخ) واتە ئامان، قاپو قاچاغ و (خانە) پێکهاتووە.) بۆتە (فراخ خانە)و بۆ سووکی بووە بە (فراخانە). بەلای منەوە ئەم وشەیە زۆر ورد نییە. چونکە ئەرکی سەرەکی شوێنەکە هەڵگرتنو پاراستنی قاپو قاچاغ نییە. ئەرکی سەرەکی جێگاکە ئامادە کردنو لێنانی خواردنە. بۆیە وشەی (چێشتخانە) لەبارترە. (فراخان) بۆ ئەو جێگە بە کار بێ باشە کە قاپوقاچاغی لێ هەڵدەگیرێ.

فراوین، نیوڕۆ- نیوەڕۆ

فینۆ: جۆرە ئەسپێك، یان ئێسترێکی وردیلەیە بۆ سواریو بۆ باریش بە کار دێ. ئەسپەکە وەکوو ئەوە وایە کە قۆزاقەکان بۆ سواری بەکاری دێنن.

فڕ: ئێرە.

قامك: تلك، تلی، ئەنگوست، پەنجە، کلك، تبل

قان: پارچە زەوی، یان دەغڵ ، یان هەر شتی تر.

قەرەبینا: جۆرە تفانگێکی کۆنە. وەکوو حوسکەو رەشکەو ئەمانە.

قەرەنتوو: تارمایی، ساوڕ، بتونك

قوڕقاپ: بێدەنگی

قولمات: هیچ دەنگ. تەنیا بۆ نەفی بەکار دێ. قولماتی نەکرد. واتە هیچ قسەی نەکرد

قونتار: دامێن

قوونەشەڕ: شەڕی کەم کەمە.

کەرگی: مریشك، مامر

کەشەنگ: زۆر شەکەتوماندوو

کەڵ: کەڵك وەکوو خەڵ: خەڵك

کەلەجاڕی: ورووژان

کەلەخ،: کەلەش، لاشە، جەنازە، مەیت

کەنگی: کەی: کەینێ

کەهاڵ: ئەستەم، موستەحیل

کەینێ: کەنگی، کەی

کڕبوون: بێدەنگ بوون

کرێپ: جۆرە قوماشێکە

کرێن: زەوی چەقێنو بەردەلانو بێ بەرهەم.

کفتك: شەمچە، شخارتە، شقاتە.

کلکە چەم: ئەنگوستە چاو، تلی چاڵ، زۆر تاریك، تاریكو نوتەك.

کن: نك، جەم، لا.

کووزە کردن: ڕۆیشتنی کپو بێدەنگو بە ملشۆڕی

کوێندەر: کوێ

کیبار: بەتەنتەنە، بە هەیتو هووت

کێرلەهاتی: بە کەڵك هیچ نەهاتوو، بێکەڵك

گەڕناس: ئازاو رەشیدو چاو نەترس

گەوشەك: ، سەرلێشێواو، سەرگەردان

گڵمت: کلۆ. وەکوو گلمتە شەکر.گڵمتە خۆڵ

گوپیتك: ترۆپك، تۆقەڵە

گوستێر: ئەنگوستیلە

لاچار: لاواز، لەڕ

لاچەرە: جێنووك، لاجانگ

لاقردێ: حەنەك، گاڵتە

لاهووت: هەرشتی پەیوەندی بە خواوە هەبێ. خواناسی. بەرامبەر ناسووت.
ناسووت : هەر شتێ پەیوەندی بە ناسەوە، واتە بە خەڵکەوە هەبێ..

لە نشکەوە: لە پڕ، لە هیکەوە، لەناکاو

لەم، لەمە: زگ، سك، ورگ، تل، هوور، هوورگ

لەمێشە: ژانە زگ، سکێشە.

لەوما: بۆیە. لەبەر ئەوە.

لۆتکە: گەمیەکی پتەوو تیژرەوە راوی کەشتی دوژمن دەنێو هەوڵ دەدا نقومی بکا.

لوقونته: چێشتخانەی بچووك فڕەنسییە.

لیپ: پیل، شەپۆل. لیپ دان: شەپۆلدان لەبەر زۆر پڕی.

ماسە: مێز

ماهی: شاخی لووس و رك و بەرز

مەترەلۆز: رەشاشی گەورەو بە شێلکە.

مەرێزە: بڵێسە، هاڵاوی ئاگر.

مرووز: سیما.، روو. مرووزی گرژ کرد: رووی گرژ کرد.

مەتکەب: ئامێری کون کردنی شت

مەکتەب: قوتابیخانە (نەك قوتابخانە)، خوێنگا (نەك خوێندنگا)

مفا: سوود، کەلك

ملێس: ئارام، هێمن

مۆکڵە: دژ، مێمڵ

ناجۆر: نارێك

ناقوور: غەوواسە. (لە گۆڤاری هاوار بەکار هاتووە.)

نانگر: زەوی بە پیت و بەرەکەت کە دەغڵ باش بێنێ.

نانۆکە: کێك، پسکوێت. کە منداڵ بووم، نە من و نە هیچ منداڵێك قەت نەماندەزانی کێك، یان پسکوێت چییە. هەر دەمانگوت نانۆکە.

نەعبەین: نێوان

نەوێرۆك: ترسنۆك، قەلەزراو، قزچاڵە. لـە فۆلكلـۆری یـاری منداڵانـدا هـاتووە: (لەوێر نەوێرۆ کێ، ژنی برایمۆکێ.)

نخری: نۆبەرە، یەکەم منداڵی خێزان.

نڤیشك: کەرە، فەریکەرۆن

نك: کن،جەم، لا

نکاو: شتی کتو پڕ. بەرامبەر (تەواری)ی عەرەبی

نۆمس: نۆکار، تازەکار، ناشی.

نووزگە: مەکتەب.بە هەڵە (نووسینگە) بە کار دێ. لە جێگایەکی تر ئەمـەم روون کردۆتەوە.

نێز: ئەورا، برسی

نیوداشت: شتی بەکار هاتوو. کە شتێ دەکڕی لەوانەیە تازە بێو پێش تۆ کەس بـە کاری نەهێنابێ. بۆیشی هەیە کۆن بێو بە کار هاتبێ. تۆ بـە کـۆنی بیکـڕی، واتـە پێش تۆ یەکێ بەکاری هێنابێو فرۆشـتبێتییەوە. ئەمـە بـە کـوردی پێـی دەگـوترێ (لیمداشت). بە داخەوە ئێسـتا زۆر کـەس وشـەی (دەستی دوو) بـە کـار دێنـێ. دەستی دوو لـە ئینگلیزی وەرگیراوە. (سەکیند هەند). تا ئەم وشە کوردییە رەسەنە هەبێ، بۆچی وشەی بیانی وەربگرین و وشەی رەسەنی خۆمان بخەینە لاوە تا رۆژێ دێ لە بیران دەچێتەوە واتە دەمرێ. ئێـوەو خـودا کـێ حـەز لـە مردنـی رۆڵـەی جگەرگۆشەی خۆی دەکا؟

هاماج: ماوەی نێوان دوو جێگا. هامـاجی نێـوان هـەولێرو بەحرکـەی رەنگـین دە کیلۆمەترە.

هەبزانە: هاکا، هەر بەم زوانە.

هەدار: سەبر

هەروەتۆ: هەروەها، هەروەسا

هەشتاو: پەلە، بە هەشتاوی، بە پەلە، بە تەنگاوی

هەس: هەیە

هەکە: ئەگەر

هەیوەشەو: (هەیو+ە+شەو) هەیو: هەیڤ واتە مانگ. هەیوەشەو: واتە مانگەشەو. ئەو شەوەی مانگ بە دەرەوە بێ و خۆی لە پەنا نەدابێ.

هەڵ کردن: ١- گونجان: دەڵێن لەگەڵ فلان هەڵناکەم: واتە لەگەڵیا ناگونجێم. ٢- پێکردن، داگیرساندن. دەڵێن: ئاگرەکە هەڵ کە

هەلاژان: یەك بە لاتی راکشان.

هنداو: نزیك . بۆ گوند بەکاردێ. ل هنداو گوندی

هەنگی: هەینێ، ئەو کاتە، ئەو حەلە، هەنگینێ، هەنگینێکە

هەوك: گەروو، ناق، هەوق

هۆکڵ: خزمەتکار، نۆکەر، پێشخزمەت.

هوون: هنگ، ئێوە، ئەنگۆ

هێل لەوە: بێجگە لەوە، بێل لەوە، خێنژی، لەوە بترازێ، لەوە بەدەر

هێمان: هێشتا

هێمانێ: هەر هێندە کە، یەکسەر

وارخانە: شوقە.

وان: ئەوان. لە بنزاری سۆرانی بۆ ئەوان بە کاردێ بە مەرجی کارا نەبێ. وەکوو: (ئەوان) هاتن. بەڵام بە (وان) بڵێ.

وەزینە: ئەو شتەی لە دارگوێز دروست کراوە، وەکوو کورسیو مێزو شتی وا.

وراق: فراوان، فەڕاح، هەراو

وزاقدان: لە پڕ بازدانو دەرپەڕین. قومچدان

وی: ئەو ئەگەر بکەر نەبێ. وەکوو بە(وی) بڵێ.

وێرێ: ئەوێ

وێلان: دەربەدەر، سەرگەردان، بێیانی، بێ نەوا

وێوە: هێوە، بۆ ئەولا. لێرەوە بۆ دوور. دەڵێن( ویوە بڕۆ، هێوە بڕۆ). پێچەوانەکەی (وێروە، هێروە)یە. وێروە: یانی لە دوورەوە بۆ ئێرە. دەڵێن: (وێروە وەرە، هێروە وەرە).

یارکۆك: گێزەر

یەشتا: هێشتا

یەهەربڕ: جەرگبڕ، جگەربڕ.

وەرگێر ئەم ساڵ (٢٠١٩) ئەم کتێبانەشی لە سلێمانی، پایتەختی ڕۆشنبیری کوردستان، چاپ کردووە:

١- ئەنوەر مایی، گوتارێك لە چین لەبارەی کوردەوە، سلێمانی، ٢٠١٩.

٢- دومینیکۆلانزا، موسڵ لەسەدەی هەژدەدا، بیرەوەری، سلێمانی، ٢٠١٩.

٣- نیکۆلاسیوفی، گەشتی نیکولاسیوفی، بۆ بیروت و حلب و کوردستان و موسڵ و بەغدا ساڵی ١٨٧٣، سلێمانی ٢٠١٩.

L,HOMME

QUI  VOYAGEA SEUL

Par

Constantin Virgil Gheorghiu

Traduit du Francat en Kurde

Par

Aziz Gardi

٢٠١٩

الـرجل الذى سافر وحيدا

كۆنستانتین ڤرجیل گیۆرگیو

ترجمه عزیز گەردی

٢٠١٩.